# ناسینی هاوەڵان

نووسینی

نهاد جلال حبیب اللّە



بەرگی یەکەم





ناوی کتێب: ناسینی هاوەڵان(ﷺ) - بەرگی یەکەم -

ناوی نووسەر: نهاد جلال حبيب الله

بابەت: مێژوویی

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٢١٩)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.

لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی میعراج بۆ توێژینەوە و گەشەپێدان










ناوەندی ڕێنوێن



07511408868 - 07501269689



hakem1423@yahoo.com

renwen2009@yahoo.com



سلێمانی - بازاڕی کاسۆمۆڵ - نهۆمی دووەم

دوکانی ژمارە (٤٥)

# پێشەکی ڕێکخراوی میعراج

## بۆ توێژینەوە و گەشپێدان

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله ربّ العالمين، والصّلاة والسّلام على سيدنا محمّد، وعلى آله وصحبه أجمعين،** لەدواییدا:-

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ الفتح: ٢٩، واتا : محمد(ﷺ) پێغەمبەری خوایە، وە ئەو **هاوەڵە** بەڕێزانەشی کە لەگەڵیبوون سەخت و توندن لەگەڵ کافراندا، وە لە نێوان خۆشیاندا زۆر بەڕەحم و سۆزو بەزەیی و میهرەبانن (کە دەبێت مرۆڤی باوەڕدار وابێت)، دەیانبینی هەمیشە لە ڕکوع و سجودەدان و نوێژ دەکەن بۆ خوای گەورە، مەبەست و نیەتیان دەستخستنی فەزڵ و چاکەو ڕەزامەندی خوای گەورەیە، (خوای گەورە نیەتی پاکی **هاوەڵان** - ڕەزای خوایان لێبێت - دەردەخات و شایەتی نیازپاکیان بۆ دەدات، چۆن دەبێت لە پاش ئەم شایەتییەی خوای گەورە بۆیان خەڵکی قسەیان پێ بڵێت و جوێنیان پێبدات و تۆمەتباریان بکات؟!)، نیشانەی خشوع و خۆبەکەمزانین

و شـێوەو ڕەوشـتجوانی و درەوشـاوەیی لەڕوویانـدا دیـارە بەهـۆی زۆری شـوێنەواری سـوجدەبردن و نوێژکردنیـان، لـە تـەورات و ئینجیلیشـدا وەسـفی ئـەم **هاوەڵـە** بەڕێزانـە بـەو شـێوازە کـراوە، نموونـەی ئـەم **هاوەڵـە** بەڕێزانـە وەکـو نموونـەی ڕووەکێـک وایـە کـە سـەرەتا لاوازەو دواتـر بەهێـز دەبێـت و پێـدەگات و گـەورە دەبێـت، وە لـە پـاش ئـەوەی کـە تەنـک وناسـکە دواتـر ئەسـتوورو بەهێزو درێژ دەبێت، ئەوکاتـە لەسـەرپێی خۆی لەسـەر دارەکـەی خـۆی ڕادەوەسـتێ، جووتیارەکـەش زۆر پێـی سەرسـام دەبێت، کـە ئەمیـش نموونـەی **صەحابـە** بەڕێزەکانـە کـە سـەرەتا لاوازو بێهێـزو ژمارەیـان کـەم بوو، دواتر خوای گەورە بەهێز و زۆریکردن تا ببنە مایەی خـەم و خەفـەت بۆ کافران و کافران کە دەیانبینـن خەفەتیـان پـێ بخـۆن و ڕقیـان لێیـان بێت، خـوای گـەورە بەڵێنـی داوە بـەو باوەڕدارانـەی کـە کردەوەی چاکیـان کـردووە بـە لێخۆشـبوون و ئەجـرو پاداشـتێکی زۆر گـەورە کـە بەهەشـتە، (دیـارە ئـەم ئایەتـە موژدەدانـە بـە **هـاوەڵان** بـە بەهەشـت واللـه أعلـم).

**هـاوەڵان** - ڕەزای خوایـان لێبێـت - هەڵبـژاردەی خـوای گـەورەن و، خاوەنـی بەرزترین پێگـە و، گەورەترین فەزڵـن لـە دوای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ).

**ئەوان** - ڕەزای خوایان لێبێت - لە سـەرەتای ئیسـلام لەوکاتەی مسـوڵمانان خاوەنـی هیـچ دەسـەڵاتێک نەبـوون هەمـوو ئـەرک و زەحمەتیەکیـان کێشـا بـە نەفـس و مـاڵ و گیانیـان، بەرگریـکارو سـەرخەری پێغەمبـەری خوابـوون(ﷺ) لـە ڕۆژە قـورس و دژوارەکان، بۆیـە پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) دەفەرموویـت: ((لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ، ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلَا نَصِيفَهُ))، صحیـح البخـاري: ٣٦٧٣، واتـا: جنێـو و قسـەی نابەجـێ بـە **هاوەڵەکانـم** مەڵێـن، وە ئەگـەر یەکێـک لـە ئێـوە بـە وێنـەی کێـوی ئوحـود زێـڕ و ئاڵتـون ببەخشـێت ئـەوا ناگاتـە بەخشـینی مشـتی **یەکێـک لـەوان** و ناشـگاتە نیـو مشـتی بەخشـینی **یەکێـک لـە ئـەوان**.

**هـاوەڵان** - ڕەزای خوایـان لێبێت - درێغیـان نەکرد لـە گەیاندنـی پەیامـی خـوای گـەورە، تاکو ئیسـلام گەیشـتە هەمـوو وڵات و شـار و ماڵێـک.

**هـاوەڵان** - ڕەزای خوایـان لێبێـت - باشـترین ئەمانـەت پارێزبـوون لـە گەیاندنی ئـەوەی فێری ببوون لـە پێغەمـەری خوا(ﷺ)، **ئەوان** - ڕەزای خوایان لێبێت - نزیکتریـن کەسـبوون لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، لـە هەمـوو کایەکـی ژیـان بەردەوامبـوون و دانەبڕاوبـوون لـە پێغەمبەرمـان(ﷺ). بەڵکـو هەرچـی بـەش و کایـەی ژیانیش هەیە کە دەتەوێت تێیدا شوێن پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بکـەوی، دەبینـی **هـاوەڵان** - ڕەزای خوایان لێبێت - زۆر بـەوردی و تـەواوی بۆیـان گێڕاوینـەوە و نەقڵیان کردووە، بۆیـە شـارازبوون لە ژیاننامەی **هاوەڵان** - ڕەزای خوایـان لێبێـت - بەشـێکی گرنگـی زانسـتی شـەرعیە، بەڵکو بەشـێکە لە سـەرچاوە سـاف و پاکەکـەی زانسـتی شـەرعی، هـەر لەگـەڵ خوێندنـەوە و تێڕامـان لـە ژیاننامەیـان- ڕەزای خوایـان لێبێت -، هەسـت بەزیادبوونـی ئیمـان و جـۆش و خـرۆش دەکرێت.

خۆشـەویسـتان، ئـەو کتێبـەی بەڕێز م.نهـاد جلال حبیب یەکێکە لە سـەرچاوە و کتێبە بـاش و چاکەکانـی کتێبخانـەی کـوردی لـە بـواری ژیاننامـەی **هـاوەڵان** - ڕەزای خوایـان لێبێـت -، جـا لـە تایبەتمەندییەکانـی ئـەم کتێبـە ئەوەیـە:

١- ئـەم کتێبـە وەکـو مەوسـوعە و ئینیسـکلۆپیدیایەک وایـە، کـە ژیاننامـەی زیاتـر لـە ٣٤٤٠**هاوەڵـی** بەڕێـزی تێـدا باسـکراوە.

٢- وە یـەک لـە تایبەتمەندییە باشـەکانی تـری ئەوەیـە فرە سـەرچاوەییە، واتـا: نوسـەر تەنها پشـتی بە یەک سـەرچاوە نەبەسـتووە، بەڵکو دەیەها سـەرچاوەی باوەڕپێکـراوی بەکارهێنـاوە، وە لەگـەڵ باسـکردنی هـەر زانیـاری و باسـێک ئاماژەیکـردووە بـۆ سـەرچاوەکەی.

٣- نـاوی **هاوەڵانـی** - ڕەزای خوایان لێبێت - بەپێی پیتەکانی زمانـی عەرەبـی ڕێکخسـتووە ئـەوەش ئاسـانکاری زۆری تێدایـە بـۆ توێژەروخوێنەر.

٤- خاڵێکی گرنگی تر بە کوردی کردنی ناوی **هاوڵەکانە** - ڕەزای خوایان لێبێت - ئەوەش ڕێگایەکی باشە بۆ ئەوەی خوێنەر تووشی هەڵە نەبێت لەکاتی خوێندنەوەی ناوی **هاوەڵان** - ڕەزای خوایان لێبێت -.

دیارە بەڕێز مامۆستا نهادیش ساڵانێکی زۆرە خزمەت دەکات لەم بوارە و سەلیقە و توانایەکی باشی هەیە ما شاء الله، بۆیە داوکارم خوای گەورە بیکاتە مایەی سوود و خێر بۆ مسوڵمانان و نەوەکانی داهاتوومان، تێشوەیەکیش بێت بۆ قەبر و قیامەتی نوسەر و هەموو ئەوانەی هاوکاری بوون.

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين .

## پێشەكی نووسەر

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، خوایە سوپاس بۆ تۆ بەو جۆرەی شیاوی گەورەیی و شكۆتە، سوپاس بۆ تۆ تا رازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ كە رازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ پاش رازی بوونت، هەموو سوپاس و ستایشی بۆ تۆ لەسەر بەخششەكانت.

صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەری خوا، ئەو كەسەی خوا بە حەق ناردی و كردی بە كۆتای پێغەمبەران و سەرمۆری نێردراوانی خۆی.

صەلات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتی نازداری پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوانەی خوا لە قورئاندا باسی كردون و رۆژانەش بەندەكانی خوا لە نوێژەكانیان و لە صەلاوات دانیان لەسەر پێغەمبەری خوا صەڵەوات بۆ ئەوانیش دەنێرن.

صەلات و سەلامی خوا لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا، كەسانێك كە خوای گەورە لێیان رازی بووەو ئەوانیش لە خوا رازی بون، خودای گەورە رێنموونیی ئەوانە بكات كە رازی نین بە رازی بوونی خوا.

كە منداڵ بووم، بەسەرهاتی هاوەڵانم لە نووسینەكانی مامۆستا حەبیب موحەممەد سەعیدەوە -خوای گەورە لێی خۆش بێت- دەخوێندەوە، ئەوكات تەنها وەك چێژ و بەسەرهاتێك مامەڵەم لەگەڵ ئەو دەمە مێژووییەدا دەكرد، دواتر كە چوومە بەشی مێژوو و رۆچوومە نێو دەمە جیاوازەكانی مێژووی ئادەمیزاد، چەندەها پرسیارم بۆ دروست بوو، وەك بڵێیت لە سەرەتاوە دەست پێ بكەمەوەو دواجار بگەمە چەند بەرەنجامێك:

خوایەک هەیە هەموو بوونی بەدیهێناوە، دەبێت ئەو خوایە تەنها بێت و هاوتا و هاوشانی نەبێت، ئەو زاتە بە هەوانتە هیچ شتێکی بەدینەهێناوەو دەستبەرداری بەدیهێنراوەکانیشی نەبووە و نابێت، ئادەمیزادیش وەک نموونەیەکی باڵای بەدیهێنراوەکان دەبێت پشتگوێ نەخرابێت و پەیامێکی روونی لە پەروەردگارەوە بۆ هاتبێت، بەشێک لە ئادەمیزاد پێیان وابووە و ئێستاش زۆرێک هەن وا دەبینن پەیامی خوا پێدانی عەقڵەو لەوێوە دەکرێت پەیوەندی نێوان بەندە و پەروەردگاری رێکبخرێتەوە، بەشێکیش پێیان وابووەو هەتا ئەمڕۆش زۆرن ئەوانەی بڕوایان وایە خوای گەورە بۆ گەیاندنی پەیامی خۆی بە ئادەمیزاد، پێغەمبەرانی ناردووە و عەقڵیش وەک ئامرازێکی تێگەیشتن لە پەیامەکە دەبینن.

هەتا ئێرە دنیایەک بابەت و سەرەباس و پرسیاری جیاواز دێنەبەرباس و ئەمەش مشتومڕی سەربەخۆی دەوێت، ئەوەی من دەمویست ئیشی لەسەر بکەم ئەوەبوو کە ئەو پەیامەی خوا کە لە رێی پێغەمبەرانەوە ئاراستەی ئادەمیزاد کراوە، چۆن دوای مەرگی پێغەمبەران گەیشتووە بەوانی دواتر؟ ئەگەر وەڵامەکە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو ئەوە بێت هاتنی پێغەمبەران بووە وەک تەواوکەری پەیامی پێغەمبەرانی پێش خۆیان، ئەوا بۆ پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد(ﷺ) ئەم وەڵامە پەسەند نیە، چونکە هەم بە دەقی دروست و هەم بە واقیعی مێژوویی موحەممەد(ﷺ) کۆتای پێغەمبەران بووەو نابینین دوای ئەوە پێغەمبەرێکی دی هاتبێت کە دەقێکی پێشوو، یان واقیعی مێژوویی، یاخود هزری ئادەمیزاد پاڵپشتی پێغەمبەربوونی بکات.

دوای وردبوونەوەیەکی زۆری مێژوویی، ئەوەم بۆ روون بوویەوە، کۆی کۆتا پەیامی خوا کە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نێردراوە، لە رێی هاوەڵانەوە پێمان گەیشتووە، یانی ئەگەر هاوەڵان لەو زنجیرە مێژووییە دەربکەین، سەرەداوێکی ئیسلاممان وەچنگ ناکەوێت، چونکە هەمووی لە زاری ئەوانەوە بۆ دوای

خۆیان گوازراوەتەوە هەتا گەیشتووە بە ئێمە، ئەوان قورئانیان لەبەرکرد و نووسییەوەو کۆکردەوەو خەڵکیان فێرکرد و بە ئاسۆ جیاوازەکاندا پەخشیان کرد، ئەوانیش بوون فەرموودەیان گێڕایەوەو بە خەڵکیان گەیاند، هەرچی نووسینی ناو فەرهەنگی ئیسلامیش هەیە، وابەستەییەکی تەواوەتی بەو گێڕانەوەو گەیاندنانەی هاوەڵانەوە هەیە، لە کۆندا بە ملیارەها مرۆڤ و لەمڕۆشدا هەروا و لە داهاتووشدا زیاتر، ئەو هەموو خەڵکە راستەوخۆ کارلێک و بەرکەوتن و کاریگەربوونیان بە دەقەکانی قورئان و فەرموودەوە هەیە و کاریگەریی راستەوخۆی لەسەر ورد و درشتی کایەکانی ژیانیان هەیە، تەنانەت ئەوانەش کە ناحەز و نەیارن بە ئیسلام، یاخود بڕوایان پێی نیە، ناتوانن لە پەیوەندی و بەرکەوتن لەگەڵ ئەو دەقانە دابڕێن، چونکە پاڵنەری فتووحاتی سەدان ناوچەی جیهان ئەو دەقانە و ئەو رێبازە بووە کە هاوەڵان بە ناوی پێغەمبەرەوە(ﷺ) گەیاندوویانە، ئەمڕۆش لە هەر کونج و کەلەبەرێکی ئەم دنیایەدا چەندەها کەس هەن وابەستەی ئیسلامن و واقیعی جیهانی ئەمڕۆ دەبێت مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

پاش توێژینەوەیەکی ورد لەو تاوە مێژووییە، بڕیارم دا نووسینێکی تایبەت بە هاوەڵانم هەبێت و لە قۆناغی سەرەتادا بە زمانی کوردی بینووسم، چونکە کتێبخانەی کوردی زۆر بێبەش بوو لە نووسینی ورد و بەرفراوان لەو بوارەدا. نووسینەکەشم وەک موسڵمانێکی وابەستە بە دەقی دروست نووسیوە، ئەم دیدگایەش بەرەنجامی ئەو وردبوونەوەیەم بوو کە سەبارەت بە هاوەڵان و دورستیی گەیشتنی دەقەکان گرتمەبەر. ئەمە پاڵنەری سەرەکیی پشت نووسینی ئەم کتێبە بوو.

ئینجا دەڵێم:

بە درێژایی مێژوی مرۆڤایەتی کەسایەتی و سەرکردە دیارەکانی ناو گەلان بوونەتە خاڵی وەرچەرخان بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی مێژوویی، ئایا

ئەوە لەسەر ئاستێکی گەورەو بەرفراوان بێت یان لە ئاستێکی بچووک و ڕێژەییدا بێت، هاوکات کەسانێک بە دەوری ئەوانەدا بون تا ببنە دەست و هێز بۆ ئەو سەرکردانە، خوای گەورەش ئەو دوو لایەنە پێکەوە دێنێ، هەم سەرکردەو هەم سەربازانی بەردەستی، وەک خوای گەورە سەبارەت بە فیرعەون ودارودەستەکەی دەفەرموێت (إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ)،[1] (بەراستی فیرعەون و هامان و سەربازەکانی ئەو دوانە هەموویان هەڵە بوون).

بە هەمان شێوەش بۆ موسڵمانانیش خوای گەورە هەمان پێکەوە بوون دەخاتەڕوو کاتێک باسی پێغەمبەری خوا دەکات باسی باوەڕدارەکانیش دەکات کە هەموویان یەک شتیان وتووە (أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ).[2]

هەموو پێغەمبەرێک کە خوای گەورە ناردوویەتی شوێنکەوتە و باوەڕداری لەگەڵدا بووە، بەڵام ڕێژەکە لە پێغەمبەرێکەوە بۆ پێغەمبەرێکی تر جیاوازی هەبووە، ئەمەش هەندێک جار بەپێی قەبارەی فراوانی بابەتی و ناوچەیی و زەمەنی ئایینەکە دەرکەوتووە، بەڵام هەموویان برای یەکن و خوای گەورەش جیاوازی ماوە و زەمەنی نێوان ئەو دوانە ناکاتە بەربەست بۆ برایەتییان، وەک دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) کە باسی پێغەمبەرانی پێش خۆی دەکات بە برای خۆی ناویان دەبات، هەروەها خوای گەورە کاتێک باسی باوەڕدارانی پێشوو دەکات وا باسیان دەکات کە باوەڕدارانی ئەمڕۆ بدوێنێ وەک دەفەرموێت (إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاء حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ).[3] [الحاقة : ١١]).

ئەمە واتە پەیامی خوا لە ناردنی یەکەم پێغەمبەرەوە تا کۆتا پێغەمبەری

---

[1] القصص: ٨٠.
[2] البقرة: ٢١٤.
[3] الحاقة: ١١.

خۆی یەک شتە کە ئەویش پەیامی یەکخواپەرستی و وەستانە لەرووی فرەخوداییدا، راستکردنەوەی لاڕێبوونی ناو کۆمەڵگە و درێژەدانە بەڕێی راستی پەیامی خوا، ئیتر کێ لەو نێوەندەدا بەشدار بێت ئەوە خوای گەورە خۆشەویستی خۆی پێ بەخشیوە تا پشکێکی هەبێت لەو ئەرکەدا.

پێغەمبەران و ئوممەتەکانی پێشین رۆیشتن و ئەوانەی باوەڕیان پێ هێنان سەرکەوتوو بوون و ئەوانەش کە بە پێچەوانەوە بوون ماڵوێران و دۆڕاو بوون، خوای گەورەش دەفەرموێت(تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ).[1]

دواجار خوای گەورە پەیامی کۆتایی خۆی بۆ کۆتای پێغەمبەران نارد تا بیگەیەنێت بە هەموو دنیا تا رۆژی دوایی، بەمە ئیتر ئایینی ئیسلام و موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا بوونە سەرمۆری ئایین و پێغەمبەرانی خوا، هەر بۆیە خوای گەورە نموونەی باڵای کەسانی سەر زەوی هەڵبژارد بۆ هاوەڵێتی ئەو پێغەمبەرەی هەتا ببنە بناغەی مێژووی نوێی کۆتا ئایینی ئاسمانی، کەسانێک کە هێندەیان بەسە خوای گەورە لێیان رازی بووە(لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً).[2]

پێغەمبەر(ﷺ) کە کەوتە گەیاندنی پەیامی خوا پەروەردەیەکی تەواوی هاوەڵانی کرد، پەیامی خوای بێ دەستکاری و بە جوانترین شێوە گەیاند، هەر لە سەرەتاوە هەموو پەیوەندییەکی خستە پاش پەیوەندی ئایینداری، ئیتر هاوەڵان بە تەواوی مانا بوونە پەیڕەوکاری پەیامی برایەتی(إنما المؤمنون إخوة)، ئەوان بوونە یەکەم دەستەی زانایان، موجاهیدان، بانگخوازان، راستی پارێزان...هتد، هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی چاکی ئەوانە دەدات و دەفەرموێت(خير الناس قرني)،[3] هەر هاوەڵان بوون پەیامی خوایان وەرگرت

[1] البقرة: ١٣٤.

[2] الفتح: ١٨.

[3] صحيح البخاري - كتاب الشهادات - باب لا يشهد على شهادة جور إذا أشهد، الرقم ٢٦٥٢، صحيح

و سەلماندیان دەتوانیت لە کەمترین ماوەدا لە لووتکەی نەزانیەوە بگەیتە لووتکەی راستی و زانایی بە گرتنەبەری پەیامی خوا، سەلماندیان هیچ کات بێهیوابوون دروست نیە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی ریشەیی با هەرچەندە دەردە جۆربەجۆرەکان کۆمەڵگەیان پەک خستبێت، هەر بۆیە بەو ماوە کەمەی ژیانیان بۆ هەتاهەتایە رێرەوی مێژوویان گۆڕی.

بە راستی پێویستە هەم وەک موسڵمان هەم وەک هەر تاکێکی سەر زەوی ئاگاداری وردەکاری ژیانی هاوەڵان بین تا بزانین چۆن و بە چی پێناوێک و بە چ نیازێ ئەو گۆڕانە ریشەییەیان ئەنجامدا.

ئەوەی جێی داخە ناحەزانی ئیسلام زۆر کینە لەدڵانە نەویونەتە توێژینەوە لەسەر ئەو هاوەڵانەو هەموو جۆرە لارێکردنێکیان گرتوەتەبەر بۆ ناشیرین کردنی هاوەڵان یان تانە لێدانیان تا لەوێوە گومان لەسەر هەموو بنەرەتەکانی ئیسلام دروست بکەن، چونکە ئەوان ئەگەر توانییان هاوەڵان بشکێنن ئەمانەیان دەست دەکەوێت:

١- دەتوانن بڵێن قورئان دەستکاری کراوە چونکە هاوەڵان بون قورئانیان لەبەر کردووەو بە تەواوەتی نووسیویانەتەوە، هەر بۆیە بە دڵی خۆیان دەستکارییان کردووە.

٢- دەتوانن بڵێن فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) راست نین چونکە هاوەڵان گێڕەرەوەیان بون و بەدڵی خۆیان قسەو بڕوای خۆیان کردووە بە فەرموودە.

٣- دەڵێن کەسێک کە بڕیار بووە هەموو دنیا چاک بکات نەیتوانیوە کەسانی دەوری خۆی چاک بکات کەواتە هەرگیز ناتوانێت ئەمڕۆ چاک بکات و پەیامەکەی بۆ ئەمڕۆش نەگونجاو دەبێت.

---

مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضل الصحابة(ﷺ) ثم الذين يلونهم، الرقم ٢٥٣٣.

٤- دەڵێن کەسێک کە چواردەورەکەی هەمووی خراپ بووبن و بەرژەوەندی و حەزی دنیایی تەنگی پێهەڵچنی بن، کەواتە دەبێت خۆی چۆن بێت، هەر بۆیە ئیمامی مالیک پێی وایە ئەوانەی تانە دەدەن لە هاوەڵان مەبەستیان خودی هاوەڵان نیە بەڵکو مەبەستیان لێدانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

٥- دەڵێن ئەو ئیسلامەی هاواری بۆ دەکەن لە چاکترین قۆناغی خۆیدا کە پێغەمبەرەکەی زیندوو بووە نموونەیەکی وای پێشکەش کردبێت دەبێت ئەمڕۆ چاوەڕوانی چی لێ بکرێت.

بۆیە کەڵەپیاوان و زانایانی ئیسلام بە تەواوی واتا ئەرکی خۆیان بەرامبەر بە هاوەڵان بەجێ گەیاندووەو بە وردی لەسەر ئەو بوارە نووسین و لێکۆڵینەوەیان تۆمار کردووە، بە جۆرێک کتێبخانەی ئیسلامی چەندین کتێبی پڕ بایەخی لەو بارەوە هەیە وەک نووسینەکانی ئیبن سەعد و ئیبن مەندە و بەغەوی و ئەبوو نوعەیم و ئیبن عەبدولبەرو ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەرو ...هتد.

پێویستە گەلی کوردیش لەو مەیدانەدا بە زمانی خۆی نووسینی هەبێت، ئەگەرنا پێشتر تا ئەمڕۆش نەوەکانی کورد بە زمانی عەرەبی خزمەتی بەرچاوی خۆیان کردووە بە بواری تایبەت بە هاوەڵان، چ وەک بەرگری کردن لێیان و وەڵامدانەوەی گومانەکانی دژ بە هاوەڵان کە لەوەدا شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیەی زانای ئیسلامی کورد نموونەیەک بووە، چ وەک لەناوبردنی دوژمنانی هاوەڵان کە نەفرینیان لە هاوەڵان دەکرد وەک سەرکردەی ئیسلامی صەلاحەدینی ئەیووبی کە دەوڵەتی ناحەز بە هاوەڵانی لەناوبرد و دەوڵەتی شەیدایانی هاوەڵانی دامەزراند، چ وەک نووسینی تایبەت بە هاوەلان کە ئیبن ئەثیر کتێبی تایبەتی (أسد الغابە)ی لەو بارەوە نووسیوە.

ئەم بەندەیەی خواش ویستی وەک خزمەتێک بە مێژووی ئیسلامی و پێدانی نموونەی هەزاران سەرمەشق بە موسڵمانان لە نووسینی زانایانی

ئیسلامەوە توێژینەوەیەکی تایبەت بە هاوەڵان دەست پێبکات، خوای گەورە تەوفیقی دام هەتا بتوانم تەواوی بکەم، هەرچەندە کات و ماوەی زۆری ویست بەڵام پشت بەخوا بەردەوام بووم لەم کارە تا تەواو بوو.

لەم نووسینەدا سەرەتا پوختەیەکی ژیانی چەند زانایەکمان هێناوە کە نووسینی تایبەتیان هەیە سەبارەت بە هاوەڵان، ئەوانیش بریتین لە (ئیبن قانع، ئیبن مەندە، ئەبوونوعەیم، ئیبن عەبدولبەر، ئیبن ئەثیر، ئیبن حەجەری عەسقەلانی)، وەنەبێت تەنها ئەوانە نووسینیان لەو بوارەدا هەبێت، نووسینەکانی ئیبن سەعد و ئەبولقاسمی بەغەوی و چەندینی دیکەش هەن، بەڵام ئەوانەمان وەک چەند نموونەیەک لە سەردەمی جیاواز و ناوچەو نەتەوەی جیاواز وەرگرتووە.

هەروەها دەروازیەکمان کردەوە تایبەت بە هاوەڵان کە پێناسێکە بۆ هاوەڵان و زانیاری تایبەت بە هاوەڵان بە گشتی، پاشان لەسەر بنەمای ئەبجەدی دەستمان کردووە بە هێنانی ناو و ژیانی هاوەڵان لەسەر ئەم شێوازە:

- هێنانی ناوی هاوەڵەکەو رەچەڵەک و کەس و ژن و منداڵەکانی.
- ژیانی پێش موسڵمان بوونی.
- کات و شێوەی موسڵمانبوونی
- ژیانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ).
- هێنانی برێک فەرموودە کە گێراویەتیەوە.
- ژیانی پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر ئەو کات ژیا بێت.
- کات وشوێن و شێوازی مردنی.

**سێ خاڵی گرنگ ماون باس بکرێن، ئەوانیش:**

❖ تکایە خوێنەری ئازیز، ئەم نووسینە هەموو زانیاریەک نیە لەسەر هاوەڵان، بەڵکو هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ ئەوەی خوێنەر لێرەوە زیاتر بچێت بە دوای زانیاریەکاندا، هاوکات دەکرێت ناوی چەندەها هاوەڵ بەسەرمدا تێپەڕ بووبێت، ئەمەش بەڵگەیەکی بچووکی و لاوازیمە، بۆیە خوێنەر وا تێنەگات هەر ناوێک لێرەدا تۆمار نەکرابوو ئیدی هاوەڵ نیە، هاوکات لە کونیەکاندا هەوڵمداوە هەرچی کونیەیەک ناوی کەسەکە هەبووبێت لەژێر ناوەکەیدا ژیانەکەی باس بکەم و تەنها ئەو کونیانەم هێناوە کە ناویان دیار نیەو هاوەڵبوونیشیان خراوەتەڕوو، لەم نووسینەدا نزیکەی (٣٤٤٠) هاوەڵ باسکراون.

❖ هیوام وایە خوێنەر ئەم نووسینە زیاتر وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی تەماشا بکات و نەیکاتە سەرچاوەیەک بۆ فەتوادان و هەر بابەتێکی خوێندەوە تایبەت بە بوارێکی بیروباوەڕی یان فیقهی یان هەر بوارێکی تر، وەک فەتوا مامەڵەی لەگەڵ نەکات، بەڵکو پێویستە بۆ ئەو بوارە بگەڕێنەوە سەر سەرچاوە تایبەتەکان هەتا وردەکاری تەواو وەربگرن.

❖ بۆ ناوهێنانی هاوەڵان بڕیارمدا بە شێوەی کوردی ناوەکان بنووسم، چونکە زۆرجار خوێندنەوەی هەڵەی ناوەکان لە ناو جەماوەرەوە بۆ ناوەندە زانستییە بالاکانیش بە روونی و بە بەرفراوانی دەبینرێت، نووسینەوەی ناوەکانیش بە عەرەبی دیسان گرفتی دروست دەکرد لەبەرئەوەی خوێندنەوەی نووسینەکەی هێندەی تر وشک دەکرد، ناچار بڕیارێکم دا کە دەکرێت تا ئێستایش لە دیدی زمانەوانییەوە پەسەند نەبێت، بەلام مامەڵەم لەگەڵ واقیعەکە لا گرنگتر بوو، ئەویش قەرزکردنی چەند پیتێکی عەرەبی بوو بۆ نووسینی ناوەکان، بۆ نموونە بۆ نووسینی ناوی (منذر) نە بەو چەشنە عەرەبییە نووسیومە، نە بە (مونزیر) ی کوردی نووسیومە، بەڵکو

پیتی (ذ) م قەرزکردووەو بە شێوەی (مونذیر) نووسیومە بۆ ئەوەی ناوەکە وەک خۆی دەردەبڕدرێت.

بەوپەڕی ڕێز و سوپاسەوە پێزانینم نیشان دەدەم بۆ دڵسۆزی و ماندووبوونی هەموو ئەوانەی لە سەرەتای ئەم پڕۆژەوە تا ئێستا هاوکارم بوون و هۆکارێکی گەورەی سەرخستنی ئەم پڕۆژەیە بوون، بەتایبەت هەریەک لە (مامۆستا مەحموودی ئازادی، مامۆستا عەبدوستار هەورامی، کاک موصعەب خالید، دکتۆر فازیڵ عەبدولوەهاب، مامۆستا سۆران فائق، م. ئارام عەبدوڵا، م. رزگار فاتیح، کاک ئاکار حەسەن) خوا پایەداریان راگرێت.

وێڕای ماندووبوون و خۆڕاگری زۆری هاوسەرم (مامۆستا بێخاڵ) و دڵسۆزی وردی براکانم (مامۆستا ئەیاد و مامۆستا جیهاد و مامۆستا فریاد) لە هەڵەچنی نووسینەکەو هاوڕێی ئازیزم کاک بابان عەبدولکەریم، خوا خێر و خۆشی بێنێتە ڕێیان، هەروەها سوپاسی دڵسۆزی و خەمخۆری مامۆستا عیرفان ئەحمەد کاکەمەحموود دەکەم.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە ئەم نووسینە وەک کارێکی خێر وەربگرێت بۆ توێشووی رۆژی دوایی، خوێنەرانیش سوودی لێ وەربگرن، ئەوەی هەڵەیە هەڵەی منە و ئەوەی راستە ڕێنوێنی خوای گەورەیە.

(إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ)

نهاد جلال حبيب الله

## پێشەکی دایکی ئازیزم[1]

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە، سوپاسێک شایستە بە گەورەیی و بەخشندەیی خۆی، صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەرێک کە سەرمۆری پێغەمبەرانە، خوا بە دیداری شادمان بکات.

گرنگی هاوەڵان هێندە بەسە کە خۆشەویستی خوا بون و خوا ئەو فەزڵەی پێ بەخشیون کە لە خزمەت سەروەری مرۆڤایەتیدا ژیاون و باوەڕیان پێ هێناوە.

خۆزگە خوا ئەو فەزڵەی بە ئێمەش دەبەخشی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووینایە تا بە دڵ و گیان خزمەتمان بکردایەو دەبووینە پێناوێکی دڵخۆشی بۆ خۆی و سەرخستنی دینەکەی، هەرچەندە خوا ئەو فەزڵەی پێ نەبەخشیوین، بەڵام سوپاسی خوا دەکەین کە بە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزەی داناوین، ئێستا و هەموو کات چاوەڕێی ئەو ساتەم بە خەو لەم دنیا و بە راستی لەو دنیا بە دیداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) شاد بم.

ئەوەی ئامانج و هیوامە خۆم و منداڵەکانم هەموو ژیانمان لە پەیڕەوی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەیدا بێت، ئەوەی لە قورئاندا هاتووەو ئەوەش لە سوننەتی صەحیحدا تۆمار کراوە.

هیوام وایە ئەم نووسینەی ئەم کوڕە ئازیزەم سەبارەت بە هاوەڵان نووسیویەتی ببێتە مایەی خێر بۆ قیامەتی باوکی و من و خۆی و براو

---

[1] دایکم بە زارەکی وتەکانی خۆی خستەڕوو و منیش دامڕشتەوەو بۆم خوێندەوەو پاش رازی بوون لەسەری، لێرە وەک پێشەکیەک دامنا.

خوشکەکانی و ڕێیەکی خێر و چاکە بێت بۆ سەرجەم موسڵمانان، خوای گەورە لەسەر دینەکەی خۆی راوەستاوی بکات و زیاتر و زیاتر زانستی پێ ببەخشێت.

داوام لە خوایە منداڵەکانم بەوجۆرە بژین کە خوا داوای کردووەو تا مردنیان دەستبەرداری ئیسلامەتی نەبن و دەرگای خێر لە من و باوکی رەحمەتییان دانەخەن، داواشم لە هەر خوێنەرێکی ئەم نووسینەیە، لە نزای خێردا خۆم و منداڵەکانم لەیاد نەکات با تەنها بە تاکە نزایەکیش بێت.

إیمان كریم

هەڵەبجەی شەهید

شەوالی ١٤٣٦

## وتەی کەسانێك کە پشتیوانی ئەم بەرهەمە بوون

"گومانی تێدا نیە خستنەڕووی لاپەڕەکانی ژیاننامەی ئەم هاوەڵە بەڕێزانە، جەختکردنەوەیە لەسەر ئەو ئەرک و سەروەریەی پێی هەڵساون لە هەڵگرتن و هەڵکردنی ئاڵای ئەم بانگەوازە خواییەو لەوەی بەسەریان هاتووە لە ئازارو ئەشکەنجە، کاریگەریشی هەیە بۆ بەهرەمەند بوون لە ڕێزو پایەی ئەوان، دەبێ ڕۆڵەکانمان هانبدەین بۆ شوێنکەوتن و شانازی کردن پێیانەوە تا لەڕێگای ناسینی ئەم بەڕێزانە ئەم نەوەیە پابەند بکەین بە ئایینەکەیانەوە، وێڕای وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری و بەراوردێکی ئەوان و سەردەمی ئێستامان، بەڵکو چاوی ویژدان ببڕینە ڕاستیەکان"

دکتۆر فاضل عبدالوهاب

"نووسین لە بارەی ژیانی هاوەڵانەوە(ﷺ):

نووسینە لەبارەی ئیسلامەوە، نووسینە دەربارەی بەشێکی زۆر لە ژیان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، نووسینە لە چۆنیەتی وەرگرتن و لێتێگەیشتن و جێبەجێ کردنی قورئان و پەیامی خوای میهرەبان لە جوانترین و تەواوترین وێنەیدا.

نووسینە لە بەرجەستە بوونی باوەڕو موسڵمان بوون و دینداری و فەرمانبەرداری و خۆ یەکلا کردنەوە بۆ خوا لە جوانترین و تەواوترین وێنەو نمونەیدا.

نووسینە لەبارەی نەوەیەکەوە کە تایبەتمەندی خۆیان هەیەو دووبارەبونەوەی بەو چۆنیەتی و چەندایەتیە لە یەک کات و یەک کۆمەڵگەدا ئەستەمە، دەکرێت لێرەو لەوێ بەشێوەی تاکەکەسی و تا چەند کەسێکیش وەک ئەوان دووبارە بێتەوە، بەڵام بەو ژمارە زۆرەو بەو تایبەتمەندیە زۆر ئەستەمە ئەوە دووبارە بێتەوە.

هاوەڵان – خوا لێیان خۆش بێت – تایبەتمەندی خۆیان هەیە و پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێک کەبیەوێت ئەرکی باوەڕو پەیامەکی بزانێت و جێبەجێ بکات ئەو تایبەتمەندی و نهێنیە بزانێت ."

خالد علی محمد (أبومصعب)

# ژیانی چەند زانایەك
# كە نووسینی تایبەتیان هەیە لەسەر هاوەڵان(رضي الله عنهم)

## ئیبن قانع

ئەبولحوسەین عەبدولباقی کوڕی قانعی کوڕی مەرزووقی کوڕی واثقی ئومەوی، زانای فەرمووودەناس بووە، لە ٢٥ ی ذیلقەعدەی ساڵی ٢٦٥ کۆچی لەدایک بووەو لە حەوتی مانگی شەووالی ساڵی ٣٥١ کۆچی وەفاتی کردووە.[١]

برایەکی هەبوو بە ناوی ئەحمەد کە زانایەکی دیار و شارەزا بووە.[٢]

زانایان رای جیاوازیان هەیە سەبارەت بەم کەسێتیە، ئایا گێڕانەوەکانی وەردەگیرێن یان نا، لەوانە دارەقوتنی پێی وایە کە گێڕانەوەی هەیە بەڵام هەڵەیشی هەیە، بەرقانی بە کەسێکی لاوازی دادەنێت.[٣]

بەڵام خەتیبی بەغدادی سەرسوڕمانی خۆی نیشان دەدات چۆن بەرقانی بە لاوازی داناوەو دەڵێت: ئیبن قانع زانا و هەڵکەوتە بووەو بە گشتی مامۆستاکانمان بە جێ متمانەیان داناوە، لە کۆتایی تەمەنیدا گۆڕاوە،[٤] ئیبن ناصرەدینیش دەڵێت: نزیکەی دوو ساڵ پێش مردنی شتی تێکەڵ دەکرد.[٥]

بەڵام ذەهەبی وا وەسفی دەکات: پێشەوای فەرمووودەناسی هەڵکەوتەی

---

[١] الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد، تحقيق: د. عمر عبدالسلام تدمري، دار الكتب العلمية، بيروت، ج١١، ص٨٨، الذهبي: تأريخ الإسلام،ط١، دار الكتاب العربي، (بيروت-١٩٨٧) ج٢٦، ص٥٨-٥٩.

[٢] الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد، ج٤، ص٣٥٥.

[٣] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص ٥٢٧.

[٤] الخطيب البغدادي: تاريخ بغداد، ج١١، ص٨٨.

[٥] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص٨.

زۆر راستگۆ پشت بەخوا دادوەر ئەبولحوسەین عەبدولباقی کوڕی قانع.... لە پێناو وەرگرتنی فەرموودەو زانستدا زۆر وڵات گەڕاوەو زۆر فەرموودەی بیستووەو بەرچاوڕوون بووە بەو بوارە.[1]

ئیبن قانع کتێبی (معجم الصحابة)ی نووسیوە تایبەت بە ژیانی هاوەڵان کە تیایدا نزیکەی ١٢٢٦ کەسایەتی هێناوە، ریزبەندی هێنانی ناوی هاوەڵانیشی بە پێی ئەبجەدی نووسیوە، ژمارەی ئەو فەرموودانەش تیایدا هاتون کە هاوەڵان گێڕاویانەتەوە ١٩٧١ فەرموودەن.

ئیشکردنی ئیبن قانع لەو نووسینەیدا بەمجۆرە بووە:

ناوی هەموو ئەوانەی هێناوە کە وەک هاوەڵ ناویان هاتووە با هەندێک لەوانەش قسە هەبێت لەسەر هاوەڵ بوونیان.

کە باسی هاوەڵێکی هێناوە ئەگەر فەرموودەی گێڕابێتەوە ئاماژەی پێداوەو هەندێک لەو فەرموودانەشی هێناوە بە بێ گوێدانە صەحیح و لاوازی سەنەدی فەرموودەکان.

هەموو ناوی هاوەڵانی نەهێناوە بەڵکو زۆر هاوەڵ هەبووە کە لە کتێبەکەیدا تۆمار نەکراوە.

ریزبەندی ناوەکانی بەپێی ئەبجەدی هێناوە، ئەمەش بنەڕەتێک بووە بۆ نووسینی دواتری زانایان تا سوود وەربگرن لەو ریزبەندیە وەک ئیبن عەبدولبەر و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر.

وردەکاری نەکردووە لە راستی سەنەدەکاندا.

## ئیبن مەندە

ناوی موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی مەندەی ئەصفەهانیە، کونیەکەی ئەبوو عەبدولایە،[2] ئەم زانایەی

[1] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص ٥٢٦.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج١١، ص٣٣٦.

ئەهلی سوننە فارس بووە، لەساڵی ٣١٠ یان ٣١١ کۆچی لە ئەصفەهان لەدایک بووە،[١] لە ساڵی ٣٩٥ کۆچی لە مانگی ذیلقەعدەو لە شەوی هەینیدا کۆچی دوایی کردووە،[٢] ئیبن کەثیر دەڵێت: لە ساڵی ٣٩٦ لە مانگی صەفەر لە ئەصفەهان مردووە.[٣]

هاوسەرەکەی ناوی ئەسمائی کچی ئەبی سەعد بووە.[٤]

بنەماڵەکەی ناسراو بون بە ئاییندارى و زانستخوازی،[٥] باوکی و باپیریشی زانای دیاری فەرموودە بون،[٦] هەروەها برای باپیریشی کە ئیمام عەبدورەحمانی کوڕی یەحیای ئەصفەهانیە زانایەکی زۆر گەورە بووە،[٧] هەروەها منداڵەکانیشی ئەبولقاسم عەبدورەحمان،[٨]ئەبووعەمر عەبدولوەهاب،[٩] ئەبولحەسەن عوبەیدوڵا،[١٠] عەبدورەحیم،[١١] نەوەکانیشی بە هەمان شێوە زاناو کەسانی زۆر هەڵکەوتەی بواری زانست بون و لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننەو جەماعە بون.[١٢]

هێندە بەسە کە ذەهەبی لە بارەیانەوە دەڵێت: (هیچ بنەماڵەیەکی فەرموودە گێڕەوەکانم نەدیوە وەک بنەماڵەی بەنی مەندە وابن، هەر لە خیلافەتی موعتەصەمەوە تا ساڵی ٦٣٠ ریوایەتی فەرموودەیان تێدا ماوەتەوە).[١٣]

ئیبن مەندە هەر لە منداڵیەوە لەگەڵ شیرپێدانیدا زانستیشی پێدرا و باوکی

---

[١] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٢٩.
[٢] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص١٤٦.
[٣] ابن كثير: البداية والنهاية، ج١١، ص٣٣٦.
[٤] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٩.
[٥] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص١٤٦.
[٦] ابن خلكان: وفيات الأعيان و أنباء أبناء الزمان، ج٤، ص٢٨٩.
[٧] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٢٩.
[٨] ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٢، ص١١٨، الصفدي: الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٣٨.
[٩] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٤، ص١٨٩.
[١٠] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٨، ص٣٥٥.
[١١] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٧.
[١٢] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٨، ص٣٥١، ج١٩، ص٣٩٥.
[١٣] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٩.

گرنگی زۆری پێدا، لە ساڵی ٣١٨ کۆچی بۆ یەکەمجار فەرموودەی وەرگرت و گێڕانەوەی لێوە بیست،[١] تەمەنیشی ئەوکات هەشت ساڵان بوو، باوکی لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ کۆڕی زانایان و گرنگی پێدەدا تا لەسەر بنەمایەکی تەواوی زانستخوازی پەروەردەی بکات.

دواتر ئیبن مەندە پاش وەرگرتنی زانست لەلای زانایانی شاری خۆی، روویکردە دەرەوەی شاری خۆی بۆ گەڕان بە دوای زانستدا، بۆ ئەوەش چەندین شوێنی کرد، ئیتر هێندە گەڕاوە تا ئەوەی ١٧٠٠ مامۆستای هەبووە، ماوەی سی و ئەوەندە ساڵ وڵاتەو وڵاتی کردووە بۆ زانست،[٢] ماوەیەکی زۆریش لە ناوچەی ئەودیو رووبار مایەوە، ئیبن کەثیر دەڵێت: لەوانەیە لەوێ ماوەیەک کاری بازرگانیشی کردبێت و دواتر گەڕابێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.[٣]

ئیبن مەندە خۆی دەڵێت: دوو جار رۆژهەڵات و رۆژئاوام کردووە.[٤]

گرنگترین ئەو شوێنانەی بۆی چووە (ئەسکەندەریە، تەرابلوس، بوخارا، بەغداد، بیت المقدس، بەیرووت، بیکەند، تنیس، حیمص، دیمەشق، صەیدا، طووس، غەززە، قولزوم، قیساریە، کووفە، مەرو، میصر، مەککە، نەیسابوور، هەمەدان).[٥]

ئەبولقاسمی کوڕی دەڵێت: باوکم چوار هەزار بەشی نووسیوە، هەزار بەشی لە مەککە لە ئەبووسەعید ئیبنولئەعرابیەوە، هەزار بەشی لە خەیثەمەی کوڕی سولەیمان لە تەرابلوس، هەزار بەشی لە نەیسابوور لە ئەصەممەوە نووسیوە، هەزار بەشی لە بوخارا لە هەیثەمی کوڕی کولەیبەوە نووسیوە.[٦]

زانای فەرمووەدەناس بووەو لەپێناو زانستدا چەندین وڵاتی کردووە.

---

[١] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص١٤٦.

[٢] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص١٤٦، الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٠.

[٣] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٦.

[٤] ابن أبي يعلى: طبقات الحنابلة، مكتبة ملك فهد الوطنية، مكة المكرمة، ١٩٩٩، ج٣، ص٣٠٠.

[٥] بڕوانە پێشەکی کتێبی (معرفة الصحابة لابن منده) کە دکتۆر عامر حسن صبری نووسیویەتی، ص ٢٣-٢٩.

[٦] ابن العماد الحنبلي:شذرات الذهب، ج٣، ص١٤٦.

**وتەی زانایان لەسەری:**

ئەبوو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی ئەصفەهانی مامۆستای لە بارەیەوە دەڵێت: (کەسی وەک ئەبووعەبدوڵای کوڕی مەندەم نەدیوە).[1]

ئەبوو ئیسماعیلی ئەنصاری هەرەوی دەڵێت: (ئەبووعەبدوڵا ئیبن مەندە لە گەورە کەسانی سەردەمی خۆی بووە).[2]

ئیبن مەندە دەڵێت: یەک فەرموودەم لە کەسی بیدعەچی وەرنەگرتووە.[3]

ئیبن مەندە لەسەر ڕێبازی سەلەف بوو، لەسەر مەزهەب و ڕێبازی ئەهلی سەلەفیش چەندین کتێبی نووسیوە، هەروەک لەسەر دەستەکانی جیا لە ئەهلی سوننەو جەماعە نووسینی زۆری نووسیوەو وەڵامی داونەتەوە، لەوانە وەک موعتەزیلە و مورجیئەو جوهەمیە و شیعەو قەدەریە.[4]

ئیبن مەندە لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بووە، واتە حەنبەلی بووە، ئیبن ئەبی یەعلاش لە (طبقات الحنابلة) دا باسی کردووە.[5]

**ناوی چەند مامۆستایەکی:**

ئیبراهیمی کوڕی ئیسحاقی کوڕی میهران.

ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی صالحی قەنطەری دیمەشقی.

ئیبراهیمی کوڕی یەحیای نەیسابووری.

ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی جامعی میصری.

ئەحمەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئەییووبی نەیسابووری.

ئەحمەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی موحەممەد.

---

[1] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٤.

[2] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٣٤.

[3] ابن أبي يعلى: طبقات الحنابلة، ج٣، ص٣٠٠.

[4] بڕوانە پێشەکی کتێبی (معرفة الصحابة لابن منده) کە دکتۆر عامر حسن صبری نووسیویەتی، ص ١٩.

[5] ابن أبي يعلى: طبقات الحنابلة، ج٣، ص٢٩٩.

ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی عەسکەری میصری.

ئەحمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی عوتبەی رازی.

دەیان زانای تر کە ناوهێنانیان زۆری دەوێت و خوێنەر دەتوانێت لە روانینی بۆ خودی کتێبەکەی ئیبن مەندە ناوی ئەو مامۆستایانەی بخوێنێتەوە کە دەقی لێوە بیستون.[1]

**خوێندکارەکانی:**

ئیبن مەندە خوێندکاری زۆری هەبووە کە زۆرێکیان ناویان نەهاتووە، بەڵام لێرەدا بە نموونە ناوی چەند خوێندکارێکی دەهێنین:

ئەبووبەکر ئەحمەدی کوڕی فەضلی کوڕی موحەممەدی باطیرقانی ئەصفەهانی کە زانایەکی دیاری فەرموودەناس بووە.

ئەبوو مەنصوور شوجاعی کوڕی عەلی کوڕی شوجاعی ئەصفەهانی کە زانایەکی فەرموودەناس بووە.

ئەبولفەضل عەبدورەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی بونداری رازی کە ئیمامێکی گەورە بووە.

ئەبووعەمر عەبدولوەهابی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق کە کوڕی خۆی بووەو یەکێک بووە لە زانا گەورەکانی فەرموودە.

ئوممولفەتح عائیشەی کچی حەسەنی کوڕی ئیبراهیمی وەرکانی کە ژنە زانایەکی فەرموودەناس بووە.[2]

**نووسینەکانی:**

سەبارەت بە نووسینەکانیشی زۆر بون، بەڵام ئەوانەی ناویان هاتووە هەوڵ دەدەین لێرەدا ناوەکانیان بخەینەڕوو:

---

[1] معرفة الصحابة لاين منده.

[2] بروانە پێشەکی کتێبی (معرفة الصحابة لابن منده) کە دکتۆر عامر حسن صبری نووسیویەتی، ص٢٠-٢١.

أسامي مشايخ الإمام البخاري.

الإيمان

معرفة الصحابة

الرد على الجهمية

التوحيد ومعرفة أسماء الله عزوجل وصفاته على الإتفاق و التفرد.

شروط الأئمة.

فتح الباب في الكنى والألقاب

مسند إبراهيم بن أدهم[1]

**کتێبی (معرفة الصحابة):**

سەبارەت بە ناوی ئەم کتێبە ئەو تاکە کەس نیە ئەم ناونیشانەی هەڵبژاردبێت بەڵکو چەندین زانای تر هەمان ناونیشانیان هەڵبژاردووە.

لە نووسینەکەیدا ناوی هەموو ئەوانەی هێناوە کە هاوەڵ بوونیان چەسپاو و بێگومانە، ناوی ئەوانەشی هێناوە کە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ژیاون بەڵام گومان هەیە لەسەر ئەوەی ئایا هاوەڵن یان نا، باسی ئەوانەشی کردووە کە دڵنیابووە هاوەڵ نین بەڵام لە کتێبەکانی پێش خۆیدا باسکراون، ئەوەشی روون کردوەتەوە، ئەوانەشی کە ئەهلی کیتاب بون و پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مردون و پێغەمبەری خوایان دیوە ئەوانەشی هێناوە.

ژمارەی ئەو کەسانەی لەو کتێبەدا ناوی هێناون بریتین لە نزیکەی(٦٧٢) کەسایەتی، ئەمە بەوانەوە کە سەلماوە هاوەڵن و ئەوانەشی کە گومان هەیە لە هاوەڵ بوونیان.

کاتێ باسی کەسایەتیەکی کردووە لەو فەرموودانەشی هێناوە کە ئەو کەسە گێڕاویەتیەوە با هەموویشی نەهێنابێ، لە هێنان و نەهێنانی ئەو گێڕانەوانەشدا گرنگیشی نەداوە بە سەنەدی فەرموودەکە.

---

[1] بڕوانە پێشەکی کتێبی (معرفة الصحابة لابن منده) کە دکتۆر عامر حسن صبری نووسیویەتی، ص ٢١-٢٢.

## ئەبوونوعەیمی ئەصفەهانی

ناوی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی مووسای کوڕی میهرانە، خەڵکی ئەصفەهانە،[1] لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٣٣٦ کۆچی لەدایکبووە.[2]

میهرانی باپیرە گەورەی یەکەم کەس بووە لەو زنجیرەیە کە موسڵمان بووەو مەولای عەبدوڵای کوڕی موعاویە بووە.[3]

زانایەکی گەورەی فەرموودەناس بووەو صۆفی بووە، باوکی یەکێک بووە لە زانا گەورەکان و هەر بە منداڵی زانستی فێر کردووە، داوای کردووە لە بڕێک لە زانایانی فەرمووده لە وڵاتە جیاجیاکان تا وەک خوێندکار وەریبگرن و فەرموودەی پێ بڵێن، ئەوانیش ڕازی بوون، لەوانە خەیثەمەی کوڕی سولەیمان لە شام و ئەبولعەبباسی ئەصەم لە نەیسابوورو ئەبوو سەهلی کوڕی زیاد لە بەغدادو ئەبووبەکر ئیبنوسننی لە دەینەوەرو چەندێکی تر لە زانایانی ناوچەکانی تر، بەو جۆرە ئەبوو نوعەیم لەپێناو زانست وەرگرتندا چەندین وڵاتی کرد.[4]

ئەبونوعەیم زیاتر هەواداری مەزهەبی ئەشعەری بووە،[5] وەک دەبینین لەسەر ئەوەش لەگەڵ حەنبەلیەکان کێشەی هەبووە.

باوکیشی پێشتر لە پێناو فەرموودەدا وڵاتەو وڵات دەگەڕا، بەمە ئەبوونوعەیم شوێن پێی باوکی خۆی هەڵگرت.[6]

---

(1) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٤، ابن كثير: البدايةو النهاية، ج١٢، ص٤٥.

(2) ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج١، ص٩٢.

(3) ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج١، ص٩١.

(4) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٤.

(5) ابن كثير: البدايةو النهاية، ج١٢، ص٤٥.

(6) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٤.

ئەبونوعەیم لە تەمەنی هەشتساڵیەوە فەرموودەی لە باوکیەوە بیست،[1] هەر لەو تەمەنەدا لە ماmۆستاکانیشیەوە فەرموودەی بیست، ئەوەبوو لای ئەبوو موحەممەد عەبدوڵای کوڕی جەعفەری مامۆستای لە ساڵی ٣٤٤ واتە لە تەمەنی هەشت ساڵیدا فەرموودەی وەرگرت.[2]

لە دیارترین نووسینەکانی بریتین لە:

معجم الصحابة

حلية الأولياء

معجم الشيوخ

المستخرج على الصحيحين

تأريخ أصبهان

صفة الجنة

دلائل النبوة

علوم الحديث

كتاب النفاق.[3]

هەندێ لە خوێندکارەکانی:

کوشیاری کوڕی لیالیزوری جیلی.

ئەبوو سەعدی مالینی.

خەطیبی بەغدادی.

ئەبوبەکری هەمەدانی.

ئەبوو عەلی وەخشی.

هیبەتوڵای شیرازی.

عەبدوسەلامی کوڕی ئەحمەدی قاضی.

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵای ئەدمی.[4]

---

[1] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص٢٤٥.

[2] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٤.

[3] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٥-٤٥٦.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٦-٤٥٧.

ئیبنوننەجار دەڵێت: ئەبوونوعەیم تاجی فەرموودەناسان و یەکێکە لە کەسە دیارەکانی ئیسلام.[1]

ئیبنولموفەضهل دەڵێت: ئەبوطاهیری سەلەفی مامۆستامان باس و ژیانی ئەبوو نوعەیمی کۆکردوەتەوەو ئەو فەرموودانەشی هێناوە کە لەوی بیستووە کە هەشتا فەرمووده بون و دەڵێت: کتێبی وەک (حلیة الأولیاء) هەرگیز نەنووسراوە.[2]

ئیبن کەثیر دەڵێت: زانای فەرموودەناس ئەبوونوعەیم قسەو هەواڵی راهیب و قەشەو عەرەبەکانی زۆر هێناوە، زۆر بە زۆری و چاکی و جوانی هێناویەتی، رەحمەت و رەزامەندی خوا بیگرێتەوە.[3]

کاتێ کتێبی (حلیة الأولیاء) ی نووسیوە براوە بۆ نەیسابوور و لەوێ فرۆشتوویانە بە چوارسەد دینار.[4]

لە سەردەمی ئەم زانایەدا سوڵتان مەحموودی کوڕی سەبەکتەکین والیەکی لەسەر ئەصفەهان دانا، دواتر خەڵکەکە ئەو والیەیان کوشت، بۆیە سوڵتان لە رۆژی هەینیدا چوو بۆیان تا تۆڵە بکاتەوە، لەو رۆژەدا خوێندکارەکانی ئەبوو نوعەیم مامۆستاکەیان لە مزگەوت دەرکرد نەوەک ئەویش تووش بێت، بۆیە کە سوڵتان هات کوشتارێکی زۆری لێکردن، بەڵام ئەبوونوعەیم پارێزرا.[5]

خەتیبی بەغدادی جیا لە خوێندکارەکانی تری باس لەوە دەکات کە لە پێدانی فەرموودەدا ئەبوونوعەیم تا رادەیەک دەستی شل کردووە، بەڵام ذەهەبی بە هێنانی قسەی خوێندکارانی تری دەیسەلمێنێ وانەبووەو هەردەم بە نووسین فەرموودەکەی هێناوە کە خۆی نووسیویەتی و وتوویەتی خۆم

---

[1] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص٢٤٥.
[2] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٥٨.
[3] البدايةو النهاية، ج٢، ص٣١٩.
[4] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص٢٤٥.
[5] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٦٠.

ئەم فەرموودەم بیستووە، بۆیە دەڵێت: ئەبوونوعەیم تۆمەتبار نیە و بەڵکو زۆر راستگۆیە و لەو بوارەدا زۆر زانا بووەو هیچ تاوانێکی لێ بەدی ناکەم.[1]

لەبەرئەوەی ئەبوونوعەیم ئەشعەری بووەو ئیبن مەندەش حەنبەلی بووە جۆرێ ناکۆکی لەنێوانیاندا هەبووە، تەنانەت ئەبوو نوعەیم لە کتێبەکەیدا تأریخ أصبهان لەسەر ئیبن مەندە قسە دەکات، ئەمەش لەبەر ئەو ناکۆکیە مەزهەبیەی هەیانبووە.[2]

ئیبنولعمادی حەنبەلی قسەی ئیبن ناصرەدینی هێناوە کە قسەی هیچکام لەو دوانە (ئەبونوعەیم و ئیبن مەندە) بەرامبەر بە یەکتر وەرناگیرێت چونکە نێوانیان چاک نەبووە، واتە حوکمدانی هەرکام لەوانە بەسەر ئەوی تردا بە هەند وەرناگیرێت.[3]

ئەبوو نوعەیم لە مانگی صەفەر یان دەوترێ لە بیست و یەکی مانگی موحەرەم[4] یان بیست و هەشتی موحەرەم[5] یان دەوترێ لە بیستی مانگی موحەرەمی ساڵی ٤٣٠ کۆچیدا وەفاتی کردووە کە لەو کاتەدا تەمەنی نەوەدو چوار ساڵ بووە.[6]

## ئیبن عەبدولبەر

ناوی یووسفی کوڕی عەبدوڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدولبەری قورطوبیە، کونیەکەی ئەبوو عومەر بووە،[7] زانایەکی گەورەی فەرموودەو هەڵکەوتەی ناسراوی سەردەمی خۆی بووە.

لە رۆژی هەینی بیست و پێنجی رەبیعولئاخیری ساڵی ٣٦٨ کۆچی لە

[1] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٦١.
[2] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٦٢.
[3] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٣، ص٢٤٥.
[4] ابن خلكان، وفيات الأعيان، ج١، ص٩٢.
[5] البدايةو النهاية، ج١٢، ص٤٥.
[6] سير أعلام النبلاء، ج١٧، ص٤٦٢.
[7] الذهبي، تاريخ الإسلام، ج٣١، ص١٣٦.

نیوەرۆیدا لەدایک بووە.[1]

کوڕێکی هەبووە بەناوی عەبدوڵا کە کونیەکەی ئەبوو موحەممەد بووەو یەکێک بووە لە شارەزایانی بواری ئەدەب.[2]

ئیبن عەبدولبەر لە پاش ساڵانی ٣٨٣ بە دواوە بەدوای فەرموودەدا گەڕاوەو شوێنانی ناو خاکی ئەندەلوسی کردووە، ئەمەش چەند ساڵێک پێش لەدایک بوونی زانای فەرموودەناسی رۆژهەڵاتی ئیسلامی خەطیبی بەغدادی بووە.[3]

لە دیارترین مامۆستاکانی کە فەرموودەی لێوە گێڕاونەتەوە بریتین لە:

ئەبولقاسم خەلەفی کوڕی قاسم

عەبدولوارثی کوڕی سوفیان

سەعید نەصر

ئەبوو موحەممەدی کوڕی عەبدولموئمین

ئەبوو عومەری باجی و ئەبوو عومەری طلمنکی

ئەبولوەلید ئیبنولفەرضي لە ئەندەلوس

لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیش:

ئەبولقاسم سقطی مەککی

عەبدولغەنی کوڕی سەعید

ئەبووذەری هرەوی

ئەبوو موحەممەد ئیبنونوحاسی میصری و چەندێکی تر.[4]

لەدیارترین خوێندکارەکانیشی بریتی بوون لە:

أبو العباس الدلائي

أبو محمد بن أبي قحافة

---

[1] ابن خلكان، وفيات الأعيان ج٧ص٦٦.

[2] ابن خلكان، وفيات الأعيان ج٧ص٧١.

[3] الذهبي، تاريخ الإسلام، ج٣١، ص١٣٧.

[4] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٧، ص٦٦.

أبوالحسن بن مفوز

أبو عبد الله الحميدي

أبو علي الغساني

أبو بحر سفيان بن العاص و

محمد بن فتوح الأنصاري

أبو داود سليمان بن نجاح المقرئ[1]

زانای دادوەر ئەبولوەلیدی باجی دەڵێت: لە مەغریبی ئیسلامیدا کەس نەبووە لە بواری فەرموودەدا وەک ئەبوو عومەر ئیبن عەبدولبەر بێت.[2]

ذەهەبی دەڵێت: هەموو مامۆستاکانی کە فەرموودەی لێ وەرگرتون ناگەنە حەفتا کەس و بۆ فەرموودەش وڵاتانی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەمتر نیە لە خەطیبی بەغدادی و بەیهەقی و ئیبن حەزم لە زۆری شارەزاییدا، بەڵکو لەوانەیە ئەو راستگۆیی و ئایینداری و چەسپاوی و چاکی بیروباوەڕەی لای ئەم هەبووبێت لای ئەوان هێندەی ئەم نەبووبێت، رەحمەتی خوای لێ بێت.[3]

ئیبن عەبدولبەر سەرەتا سەر بە مەزهەبی ظاهیری بوو، بەڵام زیاتر ئەوەی لەم زانایە بینراوە زیاترینی کاتی ژیانی و بیروراکانیشی سەر بە مەزهەبی شافیعی بووە، بەڵام ذەهەبی دەڵێت: من دەڵێم ئەو بیروباوەڕی سەلەفی بووەو ئاینداری زۆر پتەو بووە.[4]

لە نووسینەکانی:

الإستيعاب في معرفة الأصحاب

كتاب التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد

الاستذكار لمذاهب علماء الأمصار

جامع بيان العلم وفضله

---

[1] الذهبي، تأريخ الإسلام، ج٣١، ص١٤٢.

[2] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٧، ص٦٦.

[3] الذهبي، تأريخ الإسلام، ج٣١، ص١٤٢.

[4] الذهبي، تأريخ الإسلام، ج٣١، ص١٤٢.

الدرر في اختصار المغازي والسير

العقل والعقلاء وما جاء في أوصافهم

قبائل العرب وأنسابهم

بهجة المجالس وأنس المجالس[1]

الكافي

الإكتفاء في قراءة نافع وأبي عمرو

الإنباه على قبائل الرواة

الإنتقاء لمذاهب الثلاثة

البيان في تلاوة القرآن

الأجوبة الموعبة

المعروفين بالكنى

القصد والأمم في أنساب العرب والعجم وأول من نطق بالعربية من الأمم

الشواهد في إثبات خبر الواحد

الإكتفاء في القراءات

الإنصاف فيما في اسم الله من الخلاف

الفرائض[2]

ماوەیەکی زۆر لە خزمەت زانای گەورەی ئەندەلوس ئەبووعومەر ئەحمەدی کوڕی عەبدولمەلیکی ئیشبیلیدا زانستی وەرگرتووە.[3]

ئەم زانایە قورتوبەی جێهێشت بۆ گەڕان بە دوای زانستدا و ماوەیەکی زۆر بە رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئەندەلوسدا گەڕا، ماوەیەک لە رۆژهەڵاتی ئەندەلوس مایەوەو لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیبنولئەفطەسدا ماوەیەک بوو بە دادوەری ئشبوونە و شنترین.[4]

---

[1] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٧، ص

[2] الذهبي، تأريخ الإسلام، ج٣١، ص١٤٠.

[3] الذهبي، تأريخ الإسلام، ج٣١، ص١٤١.

[4] ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب،ج٣، ص٣١٦.

ئیبن عەبدولبەر لە رۆژی هەینی لە کۆتا رۆژی مانگی رەبیعولئاخیری ساڵی ٤٦٣ لە شاری شاطبە لە رۆژهەڵاتی ئەندەلوس کۆچی دوایی کرد، لە هەمان ساڵدا زانای فەرموودەناسی رۆژهەڵاتیش خەطیبی بەغدادی کۆچی دوایی کرد.[١]

مردنەکەی لە شەوی هەینیدا بوو و ئەسپەردەکردنەکەشی لە عەسری رۆژی هەینیدا بوو،[٢] کاتێک وەفاتی کرد تەمەنی نەوەد و پێنج ساڵ بوو.[٣]

**کتێبی (الإستیعاب في معرفة الأصحاب):**

لەم کتێبەیدا ئیبن عەبدولبەر هەوڵیدا تا بتوانێت ناوی چی هاوەڵ هەیە کە لە نووسینەکانی پێشتردا هەبون بیانهێنێت، بە جۆرێ ئەو ناوەی لێ ناوە وەک کۆکەرەوەیەک بۆ ناوی هەموو ئەو هاوەڵانەی ناویان زانراوە، هەرچەندە ناوی هەندێک هاوەڵی نەهێناوە کە لە کتێبەکانی تردا تۆمار کراون، هاوکات ناوی ئەوانەشی هێناوە کە راجیایی هەیە لەسەر هاوەڵ بوونیان، ریزبەندیەکەشی بە پێی ئەبجەدی کردووەو پاشانیش لە کۆتاییەوە ئەوانەی هێناوە کە بە کونیەکەیان زیاتر ناسراون لەگەڵ ناوی ئافرەتە هاوەڵەکانیشدا کە لە کۆتاییەوە ناوی هێناون، هەموو ئەو ناوانەی لەو کتێبەدا تۆماری کردون ٤٢٢٥ کەسایەتین.

## ئیبن ئەثیر

ناوی عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی عەبدولواحیدی جزیری شەیبانیە، ناسراوە بە عیزەدین ئیبنولئەثیر،[٤] زانایەکی گەورەی موسڵمانانە و بە رەچەڵەک کوردە.

---

[١] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٧، ص٧١.

[٢] الذهبي، تأريخ الإسلام، ج٣١، ص١٤٢.

[٣] ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب،ج٣، ص٣١٤.

[٤] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣ص ، الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢٢ ص٣٥٣، ابن كثير، البدايةو النهاية، ج١٣، ص١٣٩، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٥ص١٣٧.

لە چواری مانگی جەمادیلئوولایساڵی ٥٥٥ کۆچی لە جزیرەی ئیبن عومەر لەدایک بووە.[1] دوو برای دیار و زانای هەبوو کە ئەوانیش بریتی بوو لە مەجدەدین و وەزیر ضیائەدین.[2]

پاش ماوەیەک لە ژیانیان باوکیان ئەوانی بردووە بۆ موصڵ، لەوێ دەرفەتی زیاتریان بۆ لواوەو نەویونەتە زانست و هەوڵیانداوە تا ئەوەی بوونەتە کەسی دیار و هەڵکەوتە.[3]

سەردەمی ژیانی ئەم زانایە هاوسەردەمی سەرکردەی گەورەی ئیسلامی کورد صەلاحەدینی ئەیووبیە و بە وردیش زۆر رووداوی پەیوەست بەو سەرکردەی لە کتێبە مێژووییەکەیدا (الکامل فی التاریخ) تۆمار کردووە.[4]

لە مامۆستاکانی بریتی بوون لە:

خەطیب ئەبولەضلی طووسی

یەحیای کوڕی مەحموودی ثهقەفی

موسلیمی کوڕی عەلی سیحی

عەبدولمونعیم ئیبن کولەیب

یەعیشی کوڕی صەدقە

عەبدولوەهابی کوڕی سکینە

ئەبولقاسم ئیبن صەصری.

هەندێ لە خوێندکارەکانی:

ئیبن دوبەیثی

مەجدەدین ئیبنولعەدیم

زانا ئەلقووصی

ئیبن عەساکیر کە فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە

[1] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣ص٣٤٩.

[2] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢٢ ص٣٥٣.

[3] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣ص٣٤٩

[4] بروانە کتێبەکەی خۆی (الكامل في التأريخ).

ئەبوو سەعیدی قضائی.[1]

ماڵەکەی لە موصڵ ببووە لانەیەک بۆ زانایان و زانستخوازان، زانایەکی دیاری هەڵکەوتە بوو لە هەردوو بواری مێژوو و فەرموودەشدا.[2]

لە دیارترین نووسینەکانی

أسد الغابة في معرفة الصحابة

الكامل في التأريخ

التاريخ الباهر في الدولة الأتابكية

جامع الأصول في أحاديث الرسول

اللباب في تهذيب الأنساب

ئیبن ئەثیر سەر بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی بووە.[3]

لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا بە تەواوەتی روویکردوەتە زانستی فەرموودە و خۆی سەرقاڵ کردووە بەو بوارەوە.[4]

لە ساڵی ٦٢٦ کۆچیدا وەک نوێنەر چووە بۆ شام و لە دیمەشق و حەلەب سەرقاڵی فەرموودە بووە، لەوێ طواشی شەهابەدین طوغرول بە گەرمی پێشوازی لێکردووەو رێزی زۆری گرتووە، پاشان لە ساڵی ٦٢٧ دا چووە بۆ دیمەشق، ماوەیەک لەوێ ماوەتەوەو دواتر لە ساڵی ٦٢٨ دا گەڕاوەتەوە بۆ حەلەب و ماوەیەکی کەم لەوێ ماوەتەوە ئینجا گەڕاوەتەوە بۆ موصڵ.[5]

سەبارەت بە مردنی راجیایی هەیە لەسەر مانگی مردنەکەی، لە ساڵی ٦٣٠ کۆچیدا وەفاتی کردووە، رایەک پێی وایە لە مانگی رەمەزاندا مردووە، رایەکی تر پێی وایە لە ٢٥ شەعباندا وەفاتی کردووە، رایەکی تر هەیە کە دەڵێت:

---

[1] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢٢ ص ٣٥٤.

[2] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣ص٣٤٨.

[3] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٥ص١٣٧.

[4] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢٢ ص٣٥٦.

[5] ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣ص٣٤٩.

لە مانگی شەعباندا بووە بێ ئەوەی رۆژەکەی دیاری بکات، بەڵام ئیمامی ذەهەبی دەڵێت: دەست نووسێکیم دیوە کە تەصحیحی نووسینێکی کردووە لە پانزەی شەعباندا نووسیویەتی، واتە تا ئەوکاتە وەفاتی نەکردووە.[1]

کاتێ وەفاتی کردووە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵ بووە.[2]

**کتێبی (أسد الغابة في معرفة الصحابة):**

نووسەر لەم کتێبەدا هەوڵیداوە ناوی هەموو ئەو هاوەڵانە بهێنێت کە ناویان زانراوەو رەچەڵەکیان باس بکات، کاتی موسڵمان بوونیان و ژیانیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و هەندێک لەو فەرموودانەی کە گێڕاویەتیەوە دێنێ، دواتریش شوێن و کاتی وەفاتی دێنێ، ناوی ئەوانەشی هێناوە کە راجیایی هەیە لەسەر هاوەڵبوونی، هەروەها ناوی ئەو جنۆکانەش دێنێ کە باوەڕدار بون بەڵام راستەوخۆ دان نانێت بە هاوەڵ بوونیاندا، پێچەوانەی ئیبن حەجەر کە راشاکاوانە بە ناوهێنانی ئەو جنۆکانە بە هاوەڵیان دەزانێت مادەم مەرجەکانی هاوەڵ بوونیان تێدایە.

لەم کتێبەدا ئیبن ئەثیر ژیانی ٧٥٥٤ کەسایەتی هێناوەو هاوەڵ بوونی هەرکام لەوانەی باسکردووە، ئەوەشی گومان هەیە لەسەر هاوەڵبوونی ئاماژەی پێداوە، تیایدا زۆر پشتی بەستووە بە هەریەک لە نووسینەکانی ئەبوو موسا و ئیبن مەندە و ئەبوو نوعەیمی ئەصبەهانی و ئیبن عەبدولبەر تایبەت بە هاوەڵان، ئەم کتێبە یەکێکە لە ناوازەترین نووسینەکانی تایبەت بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ئیبن حەجەری عەسقەلانی

ناوی ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدە، ناسراوە بە ئیبن حەجەر، ئەمەش لەبەر بنەماڵەکەی کە بەوە

[1] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢٢ ص٣٥٦.

[2] ابن كثير: البداية و النهاية، ج١٣، ص١٣٩، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٥ص١٣٧.

ناسراو بوون و لە عەسقەلان نیشتەجێ ببوون.[١]

لە دوانزەی شەعبانی ساڵی حەوت سەد و حەفتاو سێی کۆچی لەدایک بووە، هەر لە سەرەتاکانی تەمەنیەوە باوکی کۆچی دوایی کردووە، بۆیە کەسانی نزیکی باوکی سەرپەرشتییان کردووەو ئەرکی بەخێوکردنیان گرتوەتە ئەستۆ.[٢]

بەرەبەر کە گەورە دەبوو کەوتە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و لە تەمەنی نۆ ساڵیدا هەموو قورئانی لەبەرکرد، زۆر شەیدای شیعر بوو و زۆربەی کاتی خۆی پێوە سەرقاڵ دەکرد، تا ئەوەی خوای گەورە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەلا شیرینتر کرد و بە تەواوەتی خووی دایە ئەو بوارەو لای مامۆستایانی تایبەتی فەرمووده فەرموودەی بیست، لەو پێناوەشدا زۆر گەڕا و چوو بۆ لای مامۆستایانی شوێنە جیاجیاکان.[٣]

ئیبن حەجەر سەر بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی بووەو ماوەیەکیش وەک دادوەری شافیعی لە میصر دادوەری کردووە،[٤]

لە مامۆستاکانی:

السراج البلقيني

ابن الملقن

العراقي

البرهان الأبناسي

نور الدين الهيثمي

صدر الدين الأبشيطي

أحمد بن محمد الخليلي

أحمد بن محمد الأيكي

---

[١] الشوكاني: البدر الطالع، دار المعرفة، بيروت، بلا سنة الطبع، ج١، ص٨٨.

[٢] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧٠.

[٣] الشوكاني: البدر الطالع، ج١، ص٨٨.

[٤] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧١.

صالح بن خليل بن سالم
شمس الدين القلقشندي
بدر الدين بن مكي
محمد المنبجي
محمد بن عمر بن موسى
بدر الدين بن قوام البالسي
فاطمة بنت المنجا التنوخية
فاطمة بنت عبد الهادي
عائشة بنت عبد الهادي
زين الدين أبي بكر بن الحسين

ئیبن حەجەر بۆ دەستخستنی زانست و وەرگرتنی فەرمووده زۆر ناوچەی دەکرد و دەگەڕا، لەوانە (قاهیرە، سریاقووس، غەززە، ڕەملە، بەیتولمەقدیس، دیمەشق، منا، مەککە، یەمەن).[1]

ئیتر بوو بە زانایەکی هەڵکەوتەی نموونەیی و لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا ناسراوو دیار بوو، ببووە زیندووکەرەوەی سوننەو نەیاری سەرسەختی بیدعەکاران.

زانایانی میصر و زانایانی ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامی دەهاتن و زانستیان لێ وەردەگرت،[2] نزیکەی بیست ساڵ لە خانەقای سوڵتان بیبرس مایەوە، دوای ئەوەی لە پۆستەکەی لابرا چوویە دارولحەدیثی کامیلی و ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە، دواتر دەسەڵاتداری سەردەمی ئیبن حەجەر کە مەلیک برسبای بوو و یەکێک بوو لە سەرکردەکانی مەمالیکەکان لە میصر پۆستی دادوەری مەزهەبی شافیعی دایە دەست ئیبن حەجەر، بەو بارەوە مایەوە تا دواجار خۆی وازی هێنا لەو پۆستەو لە ماڵەوە خۆی

---

[1] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧١.
[2] الشوكاني: البدر الطالع، ج١، ص٨٩.

یەکلا کردەوە بۆ وانەوتنەوەو نووسین.[1]

ماوەی دادوەری ئیبن حەجەر لە ساڵی ٨٢٧ کۆچی بۆ ٨٥٢ کۆچ بوو، لەو ساڵەدا خۆی وازی لێهێنا، چونکە سەرەتاش پاش چەند جار داواکاری لێی ئینجا رازی بوو.

لە نووسینەکانی:

تعليق التعليق

فتح الباري شرح صحيح البخاري

فوائد الاحتفال في بيان أحوال الرجال المذكورين في البخاري

زيادة على تهذيب الكمال

تجريد التفسير من صحيح البخاري على ترتيب السور

تقريب الغريب

اتحاف المهرة بأطراف العشرة

أطراف المسند المعتلى بأطراف المسند الحنبلي

أطراف الصحيحين

أطراف المختارة للضياء

تهذيب تهذيب الكمال للحافظ المزي

مختصره تقريب التهذيب

تعجيل المنفعة برواية رجال الأئمة الأربعة

الإصابة في تمييز الصحابة

لسان الميزان

تحرير الميزان

تبصير المنتبه بتحرير المشتبه

طبقات الحفاظ

الدرر الكامنة في المائة الثامنة

أنباء الغمر بأبناء العمر

---

[1] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧١.

قضاة مصر

الكاف الشاف في تحرير أحاديث الكشاف

التمييز في تخريج أحاديث الوجي

الدراية في منتخب تخريج أحاديث الهداية

الإعجاب ببيان الأسباب

الأحكام لبيان ما في القرآن من الابهام

الزهر المطول في بيان الحديث المعدل

شفاء الغلل في بيان العلل

تقريب النهج بترتيب الدرج

الأفنان في رواية القرآن

المقترب في بيان المضطرب

التعريج على التدريج

نزهة القلوب في معرفة المبدل من المقلوب

مزيد النفع بما رجح فيه الوقف على الرفع وبيان الفصل

تقويم السناد بمدرج الإسناد

الإيناس بمناقب العباس

توالى التأسيس بمعالى ابن إدريس

المرجة الغيثية عن الترجمة الليثية

الاستدراك على الحافظ العراقي في تخريج أحاديث الأحياء

تخريج أحاديث مختصر ابن الحاجب الأصلي

تحفة الظراف بأوهام الأطراف

المطالب العالية من رواية المسانيد الثمانية

التعريف الأوحد بأوهام من جمع رجال المسند

تعريف أولى التقديس بمراتب الموصوفين بالتدليس

الأعلام بمن ولي مصر في الإسلام

تعريف الفئة بمن عاش مائة من هذه الأمة

القصد الأحمد فيمن كنيته أبو الفضل واسمه أحمد

إقامة الدلائل على معرفة الأوائل

الخصال المكفرة للذنوب المقدمة والمؤخرة

الشمس المنيرة في معرفة الكبيرة

الاتقان في فضائل القرآن

الأنوار بخصائص المختار

الآيات النيرات للخوارق المعجزات

النبأ الأنبه في بناء الكعبة

القول المسدد في الذب عن المسند

بلوغ المرام بأدلة الأحكام

بذل الماعون بفضل الطاعون والمنحة

الأجوبة المشرقة على الأسئلة المفرقة

منسك الحج

شرح مناسك المنهاج

تصحيح الروضة

نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر وشرحها

نزهة النظر بتوضيح نخبة الفكر

الانتفاع بترتيب الدارقطني على الأنواع

مختصر البداية والنهاية لابن كثير

تخريج الأربعين النووية بالأسانيد العلية

الأربعين المتباينة

شرح الأربعين النووية وترجمة النووي

ديوانێكی شیعریشی نووسیوه.[1]

---

[1] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧٢-٢٧٣.

لە ساڵی ٨٣٣ کۆچیدا شاهروخی کوڕی تەیموور نامەیەکی نارد بۆ سەرکردەی مەملووکیەکان سوڵتان ئەشرەف برسبای، یەکێک لە داواکاریەکانی ئەوەبوو کتێبی فتح الباری بشرح صحیح البخاری بۆ بنێرێ کە ئیبن حەجەر نووسیبووی، ئیبن حەجەریش سێ بەرگی ئەو کتێبەی بۆ نارد چونکە هێشتا هەمووی تەواو نەبووبوو، دواتر لە ساڵی ٨٣٩ هەمان داوای ناردەوەو ئەویش دووبارە برێ بەرگی تری بۆ نارد چونکە هەمووی تەواو نەبووبوو، دواتر لە سەردەمی تاهیر جومقدا نوسخەیەکی تەواو ئامادەکرا و نێردرا بۆی، چونکە نووسینی ئەو کتێبەی لە ساڵی ٨١٧ دەست پێکرد و لە ساڵی ٨٤٢ دا تەواوی کرد، کاتێکیش نووسینەکەی بە تەواوەتی کۆتایی هات ئاهەنگێکی گەورە بۆ ئەو نووسینەی گێڕدرا و پارەیەکی زۆر بەخشرایەوەو شیعری تێدا خوێنرایەوە، خودی ئیبن حەجەریش شیعری خوێندەوە.[1]

هەروەها سوڵتان عەبدولعەزیزی حەفصیش نامەی بۆ نووسی، ئەویش نوسخەیەکی ئەو کتێبەی بۆ نارد.

ئیبنولعیمادی حەنبەلی بەمجۆرە ناوی دێنێ (شیخ الإسلام علم الأعلام أمیر المؤمنین في الحدیث حافظ العصر شهاب الدین أبو الفضل).[2]

ریشێکی سپی و جەستەیەکی لەڕ و زمانێکی پاراو و دەنگێکی زاڵی هەبوو، نوێژ و رۆژووی سوننەتی زۆر بوو، لە پەرستشی خوادا زۆر پێشڕەو بوو، تەواو پەیوەست بوو بە مەنهەجی سەلەفی صالح، کاتی تایبەتی دانابوو بۆ خوێندکارەکانی، کاتی هەبوو بۆ فەتوادان سەبارەت بەو پرسیارو کێشانەی دەبرانە بەردەمی، کاتی تایبەتیشی دانابوو بۆ نووسین.[3]

لە شەوی شەممە هەژدەی مانگی ذیلحیجەی ساڵی (٨٥٢) کۆچی

---

[1] الشوکانی: البدر الطالع، ج١، ص٨٨ -٨٩.

[2] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧٠.

[3] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧٣.

وەفاتی کرد و لە رومەیلە ئەسپەردە کرا، مەراسیمی نوێژ لەسەرکردن و ئەسپەردەکردنەکەی زۆر قەرەباڵغ بوو،[1] ئەمیری باوەڕداران وسوڵتان هاودەم بە ژمارەیەکی زۆری زانایان و خەڵک تیایدا ئامادە بوون، خەلیفەش هات بۆ نوێژ کردن لە سەری.[2]

[1] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج٧، ص٢٧٣.
[2] الشوكاني: البدر الطالع، ج١، ص٨٩.

# پێناسی هاوەڵان

گرنگە پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتەکانی پەیوەست بە هاوەڵان، ناسینێکی سەرەتاییمان بۆ هاوەڵان هەبێت لە رووی چەمک و واتا و ژمارە و چینی هاوەڵان و چینەکانی ناو کۆمەڵگەیەک کە هاوەڵان تیایدا دەژیان.

## چەمکی هاوەڵ

چەمکی(صەحابە) هاوەڵ، لە رووی زمانەوانیەوە واتای هاودەمی و پارێزگاری کردنە.

لە (لسان العرب)دا هاتووە: (صحب صحبه يصحبه صحبة بالضم وصحابة بالفتح وصاحبه عاشره والصحب جمع الصاحب... والأصحاب جماعة الصحب)،[1] صحابە بە واتای هاودەمی و لەگەڵبوون دێ، هەروەها بە واتای پاراستن دێ وەک خوا دەفەرموێت(ولا هم منا يصحبون) (وە لە لایەن ئێمەشەوە هیچ یارمەتیی و پەنایەک نادرێن) یان لە فەرموودەدا هاتووە(اللهم اصحبنا بصحبة).[2]

سەبارەت بە واتا شەرعیەکەی چەمکی هاوەڵ، چەند پێناسە و رایەکی جیاجیا هەن لەسەر مەرجەکانی هاوەڵبوون، بەڵام ئەوەی لە کۆی پێناسەکانەوە وەریدەگرین ئەوەیە:

هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بریتیە لە:(هەر کەسێکی موسڵمان کە بە موسڵمانی لەواقیعدا گەیشتبێت بە پێغەمبەر(ﷺ) و لەسەر باوەڕداری مردبێت).

---

[1] ابن منظور: لسان العرب، ط١، دار صادر، بيروت، ج١، ص٥١٩-٥٢٠.

[2] لسان العرب، ج١، ص٥٢٠.

بەم پێیە ئەم مەرجانە لەخۆدەگرێت:

١- موسڵمانی: واتە مەرجە ئەو کەسە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) موسڵمان بووبێت و بە موسڵمانیش چووبێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە ئەگەر کەسێک بە بێباوەڕی سەد جاریش چووبێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام تا دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان نەبووبێت و دواتر باوەری هێنابێت، ئەوە بە هاوەڵ دانانرێ.

٢- گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ): مەرجە ئەو کەسە بە موسڵمانی چووبێتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەگەرنا نەجاشی کە باوەڕداریش بوو و پێغەمبەریش(ﷺ) نوێژی غیابی لەسەر کرد، لەبەرئەوەی نەچوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە بە هاوەڵ دانانرێ، هەندێک مەرجەکەیان وا هێناوە کە بینینی پێغەمبەر (ﷺ)بێت، بەڵام وا جوانترە بڵێین گەیشتن بە خزمەتی، چونکە هەبووە نابینا بووەو نەیتوانیوە پێغەمبەر(ﷺ) ببینێت و چووەتە خزمەتیشی، واتە بینینی پێغەمبەر(ﷺ) یان چوونەخزمەتی بەبێ بینین بۆ ئەوانەی بەربەستی بینینیان هەبووە وەک نابیناکان، نموونەی ئەوانەش ئیبن ئوم مەکتومە.

٣- مەبەست لە بە حەقیقی بوون ئەوەیە کە ئەو کەسە بە حەقیقی و بێ خەیاڵ و خەو چووبێتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، جا ئەگەر کەسێک لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) یان لە دواتردا تا ئەمرۆ و تا رۆژی دواییش، خەوی دی چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوە نابێت بە هاوەڵی.

٤- مردن بە موسڵمانی: ئەمەش مەرجێکی تری گرنگە، چونکە ئەگەر کەسێک بە باوەڕداریش چووبێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام دواتر مورتەد بووبێتەوە، ئەوە بە هاوەڵ دانانرێت، ئەگەر دوای مورتەدبوونەوەکەشی هەمدی باوەڕی هێنابێتەوە و ئەو دووەم جار باوەڕهێنانەوەی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و لە خزمەتی ئەودا بووبێت، ئەوە سیفەتی هاوەڵبوونی دەمێنێتەوە، هەندێک

پێیان وایە ئەگەر دوای مورتەدبوونەوەکەشی دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) هەمدی باوەڕی هێنابێتەوە، ئەوە سیفەتی هاوەڵبوونی دەمێنێتەوە، بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە بەو یەکجار مورتەدبوونەوەی مەرجی هاوەڵێتی نامێنێ، بەڵام هەموان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەر کەسێ بە موسڵمانی گەیشتبێت بە پێغەمبەر(ﷺ) و دواتر بە بێباوەڕی مردبێت ئەوە هاوەڵ نیە.

بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێت:(هەر موسڵمانێک هاودەمی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردبێت یان بینیبێتی ئەوە هاوەڵیەتی).

ئیبن حەجەر دەڵێت:(راستترین پێناسێک بۆ هاوەڵان بیزانم ئەوەیە هاوەڵ هەر کەسێکە بە باوەڕداری گەیشتبێت بە پێغەمبەر(ﷺ) و لەسەر ئیسلام (بە موسڵمانێتی) مردبێت، ئیتر هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە زۆر لەگەڵیدا دانیشتبێت یان کەم لەگەڵی بووبێت یان ئەوەی فەرموودەی لێوە گێڕابێتەوە یان فەرموودەی لێوە نەگێڕابێتەوە یان غەزای لەگەڵ کردبێت یان غەزای لەگەڵ نەکردبێت یان هەر بینیبێتی با لەگەڵیشی دانەنیشتبێت یان لەبەر بەربەستێک نەیدیبێت وەک نابینایی.[1]

ئیبنوصەلاح چەند پێناسەیەکی هێناوە، لەوانە:

مروزی دەڵێت: فەرموودەناسان دەڵێن هەرکەس کە فەرموودەیەکی یان وتەیەکی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لێوەگێردرابێتەوە، ئەوە هاوەڵە، هێندە مەجالەکە فراوان دەکەن تا ئەوەی دەڵێن هەرکەس پێغەمبەری (ﷺ) دیبێ ئەوە لە هاوەڵانە، ئەوەش لەبەر گەورەیی پلەوپایەی پێغەمبەر(ﷺ) واتای هاوەڵێتییان داوە بەهەر کەس کە پێغەمبەری دیبێت.

وشەی صەحابی لەرووی زمانەوانی و روخسارییەوە بۆ کەسێکە کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت و زۆر لە کۆڕیدا بووبێت و شوێنکەوتەی بووبێت و فەرموودەی لێ وەرگرتبێت، ئەمەش بڕوا و قەناعەتی ئوصوولیەکانە.

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ط١، دارالجيل(بيروت - ١٩٩٢)، ج١، ص٦.

سەعیدی کوڕی موسەیب تەنها کەسێکی بە هاوەڵ داناوە کە ساڵێک یان دوو ساڵ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مابێتەوە و غەزایەک یان دوو غەزای لەگەڵدا کردبێت.[1]

## ماوەی هاوەڵان

زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرکەس دوای سەدساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بانگەشەی هاوەڵبوونی کردبێت، بڕوای پێ نەکەن،[2] ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە مانگێ بەر لە مردنی فەرمووی(أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ، فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ)،[3] واتە (ئەمشەوتان ئەبینن، لەمشەوەوە تا سەد ساڵی تر لەم سەرزەویەدا یەک کەس نامێنێ کە ئەمڕۆ لەسەریەتی).

## ژمارەی هاوەڵان

سەبارەت بە ژمارەی هاوەڵان ڕاجیایی هەیە، ڕاستیش ئەوەیە کە بە وردی ژمارەی هاوەڵان نازانرێت، چونکە ژمارەیەکی زۆر بووەو لەو سەردەمەشدا سەرژمێری ورد نەبووە، ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان لە دووری مەککە و مەدینەوە هاتون و وەک وەفد هاتون و دواتر چوونەتەوە بۆ ناوچەی خۆیان، لێرەدا تەنها چەند گێڕانەوەیەک بە نموونە دێنینەوە لەسەر ژمارەی هاوەڵان لە چەند قۆناغێکدا:

هاوەڵانی بەشداربوو لە غەزای بەدردا ٣١٣ کەس بوون،[4] ژمارەیەکی زۆریش لە مەدینە بوون لە پیاو و ژن و منداڵ کە نەچووبوون بۆ ئەو غەزایە.

---

[1] مقدمة ابن الصلاح، دار الفكر المعاصر ( بيروت – ١٩٧٧)، ج١، ص٢٩١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨-٩.

[3] صحيح البخاري – كتاب العلم – باب السمر في العلم، الرقم ١١٦.

[4] رواه أحمد والطبراني.

هاوەڵان لە بەیعەتی ریضواندا ژمارەیان نزیکەی ١٤٠٠ یان ١٥٠٠ هاوەڵ دەبوو،[١] خوای گەورەش ئایەتی لەسەر دابەزاندون (لقد رضي الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة) واتا: (بێگومان خوا ڕازیبوو لە ئیماندارەکان کاتێ- لە ژێر ئەو درەختەدا پێی دەڵێن: (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت ئەی موحەممەد(ﷺ).[٢]

هاوەڵانی بەشداربوو لە ساڵی دەی کۆچیدا کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشدار بوون بۆ چوون بۆ مەککە، لە سەروو دە هەزار کەسەوە دەبوون، وەک لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ فِي رَمَضَانَ مِنَ الْمَدِينَةِ وَمَعَهُ عَشَرَةُ آلَافٍ)،[٣] واتە (لە ئیبن عەبباسەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە رەمەزاندا لە مەدینە دەرچوو و دە هەزار کەسی لەگەڵدا بوو).

لە غەزای حونەیندا ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون دە هەزار کەس بوون لەگەڵ (الطلقاء)دا،[٤] واتە ئەوانەی لە دوای فەتحی مەککە بوونە شوێنکەوتەی پێغەمبەر(ﷺ).

ئیبن حەجەر دەقێکی ئەبوزورعەی رازی هێناوە کە دەڵێت:(پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە وەفاتی کرد ئەوانەی دیبوویان و فەرموودەیان لێوەگێڕابوویەوە لەسەروو سەد هەزار کەسەوە دەبوون لە ژن و پیاو کە هەموویان فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە، ئایا فەرموودەی بیستراو بێت یان بینراو).[٥]

بەڵام ئەمە پێویستی بە روونکردنەوە هەیە، چونکە ئەگەر سەیری ئەو کتێبانە بکەین کە تایبەت بە هاوەڵان نووسراون و سەیری سەنەدەکانی کتێبەکانی فەرموودەش بکەین لەگەڵ ئەم گێڕانەوەدا یەک ناگرنەوە.

---

[١] ابن عبدالبر: الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ط١، دار الجيل(بيروت -١٤١٢هجري)، ج١، ص ٣ و ٥.

[٢] الإسراء: ١٨.

[٣] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب غزوة الفتح في رمضان، الرقم ٤٢٧٦.

[٤] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب الخروج وكيفية الجهاد - ذكر ما يستحب للإمام أن يدعو أنصاره إذا حزبه أمر، الرقم ٤٦٧٩.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢.

بۆیە دەکرێت بوترێت گونجاوە ئەو ژمارەی هاوەڵان بووبێ یان ژمارەیەکی نزیک بەو ژمارەیە، فەرموودەشیان لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بیستبێت و گێڕابێتەوە بۆ خەڵکی دەوروبەریان، بەڵام ئەو گێڕانەوانە هەموویان تۆمار نەکراین و نەگەیشتبنە نەوەکانی داهاتوو، وەک ئەوەی چەندین کەس بە جیاجیا یان وەک وەفد هاتبن و لەو ماوە کەمەی بینینی پێغەمبەردا(ﷺ) بڕێک فەرمودەیان وەرگرتبێت و دواتر چووبنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و لەوێ ئەو فەرموودانەیان گێڕابنەوە، بەڵام دواتر ئەو فەرموودانە تۆمار نەکرابن.

هەروەها ئیبن حەجەر گێڕانەوەیەکی ئەوری هێناوە کە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، دوانزە هەزار هاوەڵ هەبوون کە پێغەمبەر (ﷺ) لێیان رازی بوو.[1]

لە (المستدرک علی الصحیحین) دا هاتووە(ثَارَتِ الْفِتْنَةُ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ - عَشَرَةُ آلَافٍ)،[2]واتە (فیتنەی نێوان هاوەڵان هەڵگیرسا و ئەوکات دەهەزار هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) مابوون).

بەمجۆرە چەند ژمارەیەکی جیاجیامان لەرووی کات و شوێنەوە وەرگرت، چونکە هەم بەپێی ماوەکان بە مردنی هاوەڵان، ژمارەیان کەم بوەتەوە، هەم بەپێی شوێنەکان جیاواز دەبێت، چونکە ئەو ژمارانە کە باسکراون زیاتر لەسەر ژمارەی هاوەڵانی ناو نیمچەدوورگە هاتون، ئەگەرنا ئەو هەمووە هاوەڵەی بە وەفد هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ژمارەیان باس نەکراوە.

## چینەکانی کۆمەڵگە لە سەردەمی پێغەمبەردا

لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) چوار کۆمەڵی سەرەکی لە کۆمەڵگەدا هەبوون کە ئەوانیش بریتی بوون لە(کۆمەڵی بێباوەڕان، کۆمەڵی هاوەڵان، کۆمەڵی ئەهلی کیتاب،کۆمەڵی دووڕووان).

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣.

[2] المستدرک علی الصحيحين - كتاب الفتن والملاحم - خطبة عمر(ﷺ) في الفتنة، الرقم ٨٤٥٢.

یەکەم: کۆمەڵی بێباوەڕان: ئەمانە بڕوایان بە حەقیقەتی ئیسلام و پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) نەبوو و لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە دژایەتی توندی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد، ئازاری موسڵمانانیان دەدا، هێرشی ماددی و مەعنەوییان دەکردە سەر ئیسلام، هێرشی ماددی بە ئازاردانی جەستەیی موسڵمانان، هێرشی مەعنەوی بە لێدانی مەعنەوی بۆ موسڵمانان وەک گومان خستنە سەر کەسایەتی و بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ)، سووکایەتی کردن بە موسڵمانان و چەندین شێوازی تری دژایەتی.

ئەمانە ئازاردانەکەیان هێندە توندبوو هەتا موسڵمانانیان ناچارکرد مەککە جێبهێڵن و بەرەو حەبەشە و مەدینە کۆچ بکەن، بەڵام هەر وازیان نەهێنا و روویانکردە حەبەشە بۆ جێ لەقکردن بە موسڵمانان و گەڕاندنەوەیان بۆ مەککە تا ئازاریان بدەن و بشتوانن ڕێبازەکەیان لەناو ببەن، رووشیانکردە مەدینە تا بتوانن دەوڵەتەکەیان لەناو ببەن و چەند جەنگێکیان لەگەڵ موسڵماناندا ئەنجامدا و ئامادەش بوون لەگەڵ جوولەکە و دووڕووانیشدا یەکبگرن و هاودەستی تەواوەتی بکەن دژ بە موسڵمانان، واتە هەموو هەنگاوێکی بەرچاو و شاراوەی دژایەتیکردنی موسڵمانانیان گرتەبەر.

خوای گەورە بۆ قۆناغی مەککە جیهادی دژی ئەوانی فێری پێغەمبەر(ﷺ) کرد تا بە قورئان جیهادیان بکات، وەک خوا دەفەرموێت(فَلا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَاداً كَبِيراً)[1](جا کەواتە تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ)-! بەردەوامبە لەسەر گەیاندنی پەیامی خۆت و هەرگیز گوێڕایەڵی بێ بڕوایان مەکە، وە بەم قورئانە (وەک ئیبن عبباس دەڵێ)بە هەموو هێزو توانایەکت جیهادو ململانەیەکی گەورەو زۆریان لەگەڵ بکە).[2]

[1] الفرقان: ٥٢.

[2] ئیبن عەبباس بۆ (جاهدهم بە) دەڵێت: واتە بە قورئان، لەبەرئەوەش سوورەتەکە مەککیە ئەم رایە راستترە.بڕوانە: القرطبي: الجامع لأحكام القرآن، دار عالم الكتب(الرياض-٢٠٠٣)، ج١٣، ص ٥٨.

دووەم: کۆمەڵی هاوەڵان: ئەمەش ئەو چینەی کۆمەڵگە دەگرێتەوە کە باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمانەش چەند بەشێکیان لەخۆدەگرت، ئەو هاوەڵانەی کە زوو موسڵمان ببوون و بەشداری ئازار و نارەحەتیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، ئەوانیش دوو دەستە بوون(کۆچەران، پشتیوانان)، سەبارەت بە کۆچەران هەندێکیان کۆچیانکرد بۆ حەبەشە و لەوێ لە غەریبیدا مانەوە تا لە غەزای خەیبەردا گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە، زۆرینەشیان کۆچیان کرد بۆ مەدینە و لەوێ بوونە دامەزرێنەرانی یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی، هەندێکی کەمیش لە مەککە مانەوە، ئەمانە یان بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە تا ئەرکی پێ سپێردراویان بەجێبگەیەنن وەک عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ)، هەندێکیان بە ناچاری دەمانەوە چونکە کۆیلە بوون وەک ئەسلەمی کۆیلەی عەبباس، هەندێکیان بێتوانا بوون و نەیاندەتوانی کۆچ بکەن، هەندێکیش دوای قۆناغی کۆچکردن موسڵمان دەبوون، ئەمانە دواجار دەرووی خواییان لێکرایەوە کاتێک ئەبووبەصیر توانی بێ شکاندنی رێککەوتننامەی حودەیبیە لە سەرەڕێی بازرگانی شام و قورەیش بنکەی دووەمی دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێنێ و لەوێوە موسڵمانبوانی مەککە بچنە ئەوێ تا دواتر بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانیش چوون بۆ مەدینە، هەندێکی تر لە هاوەڵان ئەوانە بوون کە لە سەروبەندی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوون، هەندێکیان بە ناچاری موسڵمان بوون و دواتر موسڵمانێتیەکەیان لە روخسارەوە چووە ناو دڵەکانیان و بوونە شەیدایانی ئیسلام، هەندێکیشیان هەر لە سەرەتاوە بە ویستی خۆیان و لە دڵەوە موسڵمان بوون و هەوڵیان دەدا قەرەبووی رابردووی لەدەست چوویان بکەنەوە.

پشتیوانانیش موسڵمانانی مەدینە بوون کە بوونە پشت و پشتیوانی تەواوەتی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و برا کۆچەریەکانیان، هێندە رێزیان لای پێغەمبەر(ﷺ) گەورە بوو کە دەیفەرموو(آيَةُ الْإِيمَانِ حُبُّ الْأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ

الْأَنْصَارِ)،[1] واتە:(نیشـانەی ئیمانـداری خۆشەویسـتی پشـتیوانانە و نیشـانەی دووڕوویيـش ڕق لـێ بوونیانـە).

هەروەهـا دەیفەرموو(لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الْأَنْصَارِ ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا وَشِعْبًا لسَلَكْتُ وَادِيَ الْأَنْصَارِ وَشِعْبَهَا)،[2]واتە:(ئەگەر كـۆچ نەبوایـە بەدڵنیاییـەوە مـن یەكێـك دەبووم لـە پشـتیوانان، ئەگەریش خەڵكی دۆڵـێ یان شـیوێ بگرنەبەر و پشـتیوانانیش دۆڵـێ یـان شـیوێ بگرنەبـەر بەدڵنیاییـەوە مـن دۆڵ یـان شـیوی پشـتیوانان دەگرمەبـەر).

پشـتیوانان بوونـە پاڵپشـتی مـاددی و مەعنـەوی بۆ كۆچـەران و پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) برایەتـی و میراتگـری خسـتە نێـوان كۆچـەران و پشـتیوانانەوە، دواتـر پـاش چاكبوونـی بـاری دارایـی كۆچەرانیـش بـە بڕیـاری خـوای گـەورە برایەتیـە ئیمانیەكـە مایـەوەو میراتگریەكـە هەڵوەشـایەوە.

هـاوەڵان بـەردی بناغـە و هێزی یەكەمـی ئیسـلام و شـەیدایانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، ئیتر هێندەیـان بەسـە كە خوا لێیـان ڕازی بـوو و ئەوانیش لـە خوا ڕازی بـوون، بەڕاسـتی شـیاویانە لەگـەڵ ناوهێنانیاندا بوترێ(ﷺ)، ئەمانـە هـاودەم و پارێزەری پێغەمبـەر(ﷺ) بـوون، بشـكێ دەسـتێ و لاڵ بـێ زمانـێ و كوێر بێت چـاوێ و كـەڕ بێت گوێیـەك و لەئیش بكەوێت دڵـێ كە بـە نیازی خـراپ لـە ژیانیـان دەنەوێت.

سێیەم: ئەهلی كیتاب:

لـە مەككـە و تائیفدا كەمینەیەكی مەسـیحی هەبوون كە بـە پەنجـەی دەسـت دەژمێـردران و ژمارەیـان زۆر كـەم بـوو، ئەمانـە لەژێـر كاریگـەری سـەردان و هاتوچـۆی ناوچەكانـی ژێـر دەسـەڵاتی ڕۆمەكانـدا ئایینـی مەسـیحیەتیان وەرگرتبـوو، هەندێـك لەوانەیـش نەبووبـوون بـە مەسـیحی، بەڵكـو خوێندنەوەیان هەبـوو بۆ كتێبی پیرۆز و نووسـینە مەسـیحیەكان و شـارەزاییان وەرگرتبوو

[1] صحيح البخاري - كتاب الإيمان - باب علامة الإيمان حب الأنصار، الرقم ١٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب التمني - باب ما يجوز من اللو، الرقم ٧٢٤٥.

لەسەر ئەو زمانەی نووسینە پیرۆزە مەسیحیەکانی پێ دەنووسرا، نموونەی ئەوانەش وەرەقەی کوڕی نەوفەل بوو.

هەرچی جوولەکەکانن لە ماوەیەکی مێژووییدا چووبوونە مەدینە و لەوێ مابوونەوە، جوولەکەکان زۆر بە دەگمەن کەسیان تێدا موسڵمان دەبوو، ئەمانە بە هەموو شێوەیەک دژایەتی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد، بەلام زۆر کات بە نهێنی دژایەتییان ئەنجام دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) کە هاتە مەدینە لە نوسراوی تایبەتیدا بۆ مەدینە ماف و ئەرکی جوولەکەکانی دیاری کرد و ئەوانیش رازی بوون پێی، کەچی دواتر ناپاکییان نواند، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) یەکدوای یەک لە مەدینە دەریکردن، دواجاریش پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی بردە سەر قەڵاکەیان قەڵای خەیبەر و دواجار خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان کاتێک ئیمامی عەلی بوو بە ئاڵاهەڵگری موجاهیدان.

لای جوولەکەکان تاکی ناو خۆیان تا ئەوکات عاقڵ و ژیر بوو کە دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان بکات، ئیتر کە موسڵمان بوو بە بڕوای ئەوان ئەو کەسە دەبوویە نەفامێکی بێڕێزی نەشارەزا، نموونەی ئەوەش موسڵمانبوونەکەی ئیبن سەلام بوو.

جوولەکەکان لەڕووی سیاسیەوە هاوپەیمان و هاریکاری کارای بێباوەڕان بوون، چاکترین نموونەش لەو بارەوە لە جەنگی خەندەقدا بەدیدەکەین.

خوای گەورە کینە و رقی جوولەکەی بۆ موسڵمانان خستوەتەروو وەک دەفەرموێت(لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ) (بێگومان جوولەکەو هاوبەشدانەرەکانت دەست دەکەوێت ئەی پێغەمبەر! کە پتر لە هەموو خەڵکانی تر، دژایەتی ئیماندارەکان دەکەن، چونکە دڵیان پڕە لە کینەو ڕک و ئیرەیی و عینادیی).[1]

چوارەم: چینی دووڕووان: ئەمانە بە روخسار خۆیان بە موسڵمان نیشان دەدا و لە ناخیشدا بێباوەڕ بوون، روخساری موسڵمانبوونیشیان تەنها لای

[1] المائدة: ٨٢.

پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بوو ئەگەرنا لای یاران و دۆستانیان ناخی خۆیان دەردەبڕی وەک خوا دەفەرمویێت(وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ، اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ، أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ)،[1] (وە ئەو دووڕووانە کاتێک تووشی ئەوانە ئەبن باوەڕیان هێناوە، بۆ فریودانی ئیمانداران ئەڵێن: ئێمەش وەک ئێوە باوەڕمان هێناوەو موسڵمانین!! کاتێکیش دەگەنە لای فەرماندە شەیاتینەکانیان دەڵێن: لەراستییدا ئێمە لەگەڵ بەرنامەو بیروباوەڕی ئێوەداین، ئێمە هەر گاڵتەیان پێدەکەین، بەراستیی خوای باڵادەست گاڵتە بەوان دەکات و یەک دوو ڕۆژێ مۆڵەتیان دەدات، تا پترخۆیان بەدبەخت بکەن و لە سەرکێشیی و لاڕێیی خۆیاندا سەرگەردان بن، ئەو ناپاکانەن هیدایەت و ڕێنوێنیان بە ڕێبازی چەوت وگومڕایی فرۆشت و ڕێبازی راست و دروستیان دۆڕاند جائەو سەوداو بازرگانیەیان سوودبەخش نەبوو، قازانجیان لێ نەکرد وە ڕێگەی بەختیاریی و هیدایەتییان دەست نەکەوت).

بەلام کە دەچوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دەیانوت شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خوایت بەلام خوا بە درۆی خستنەوە وەک دەفەرمویێت(إِذَا جَآءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ * اتَّخَذُواْ أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)،[2] (کاتێ دوو ڕووەکان هاتن بۆلات ئەی پێغەمبەر -ﷺ- ! ئەڵێن: شایەتی ئەدەین کە بەراستیی تۆ پەیامبەری خوایت لە حاڵێکدا خوا خۆی دەزانێ کە تۆ پەیامبەری ئەویت وە خوا گەواهیی دەدات کە ئەو دووڕووانە درۆ دەکەن، سوێندە درۆیینەکانیان کردە سپەرو قەڵغان بۆ پاراستنی ئابڕوو و سەرو ماڵی خۆیان، هەر شتێک دێتە پێشێ، بە خێرایی ئەوان سوێندێکی پیا دەکێشن! ڕێی دینی خوایان لە خەڵک گرت! بەراستیی ئەوانە کارێکی خراپ و نا بەجێیان کرد).

[1] البقرة: ١٤-١٦.

[2] المنافقون: ١-٢.

ئەمانە دەیانزانی پەیامەکەی پێغەمبەر(ﷺ) راستە و لای خواوە سروشی بۆ دێ، بۆیە هەمیشە دەترسان خوا ئایەتیان لەسەر دابەزێنێ و پیسی و پیلانیان ئاشکرا بکات وەک خوا دەفەرموێت(يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِم قُلِ اسْتَهْزِؤُواْ إِنَّ اللّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ)،[1] (دوو رووەکان هەمیشە دەترسن کە لە بارەیانەوە سوورەتێک بێتە خوارێ نهێنیەکانی دڵیانیان بە بڕوادارەکان بڵێت، بڵێ: بەئارەزووی خۆتان گاڵتە بکەن بەدین و ئیمان بەنهێنی و بەئاشکرا! بێگومانبن لەهەرچی دەترسن خوا دەریخات، زۆر بەباشی ئاشکرای دەکات).

عەبدوڵای کوڕی ئوبەی گەورەی دووروەکان بوو کە لە مەدینە نیشتەجێ بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هیچ کات هێزی لەدژیان بەکارنەدەهێنا، چونکە پێی باش و جوانیش نەبوو خەڵکی بڵێن موحەممەد یارانی خۆی دەکوژێت، ناوی دوورووەکانیش لای حوذەیفەی کوڕی یەمان بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووبوو کامانە دووروون بەڵام رێی بەویش نەدا ناویان ئاشکرا بکات.[2]

## چینەکانی هاوەڵان

ئەو کەسانەی لەسەر ژیانی هاوەڵان نوسیویانە، هەرکامەو بەجۆرێک دابەشکاری دەکەن بۆ چینەکانی هاوەڵان، هەیانە پێشینەی موسڵمان بوون بەمەرج دەگرێ، هەیانە خزمەتی باڵا بە مەرج دەگرێ، ئێمەش بە کورتی چەند نموونەیەکیان لەسەر دێنین:

ئیبن سەعد بەمجۆرە دابەشیان دەکات:

یەکەم: کۆچەرە بەدریەکان(بەشداربوانی بەدر).

دووەم: پشتیوانە بەدریەکان(بەشداربوانی بەدر).

[1] التوبة: ٦٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٥٧٣.

سێیەم: ئەوانی زوو موسڵمان ببوون بەڵام بەشداری بەدر نەبون.

چوارەم: ئەوانەی پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوون.

پێنجەم: ئەوانەی دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوون.[1]

حاکم دابەشیان دەکات بۆ دوازدە چین:

یەکەم: ئەوانەی زوو لە مەککە موسڵمان بوون وەک ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی(ﷺ).

دووەم: یارانی داروننەدوە.

سێیەم: ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە.

چوارەم: ئەوانەی لە عەقەبە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ).

پێنجەم: هاوەڵانی عەقەبەی دووەم.

شەشەم: یەکەمین ئەو کۆچەرانەی گەیشتن بە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک لە قوباء بوو پێش ئەوەی بێتە مەدینە.

حەوتەم: بەشداربوانی بەدر.

هەشتەم: ئەوانەی لە نێوان بەدر و حودەیبیەدا کۆچیان کرد بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).

نۆیەم: بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان.

دەیەم: ئەوانەی لە نێوان حودەیبیە و فەتحی مەککەدا کۆچیان کرد بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).

یانزەهەم: ئەوانەی رۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوون.

دوانزەهەم: ئەو مندالانەی رۆژی فەتحی مەککە و لە وتاری ماڵئاوایدا پێغەمبەریان(ﷺ) بینیوە.[2]

[1] بروانە الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣ و ٤.

[2] الحاكم النيسابوري: معرفة علوم الحديث، ط٢، دار الكتب العلمية(بيروت - ١٩٧٧)، ج١، ص٢٣.

## عەدالەتی هاوەڵان

ئەهلی سوننەو جەماعە پێیان وایە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مەرجی عەدالەتیان تێدایە، لەمەوە بەجێگەیاندنی فەرزەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان بەرهەم دێت، بەدوایدا پەیرەوی کارە چاکەکان و دوورکەوتنەوە لە کارە ناحەز و پەستەکان دێت.

بە واتایەکی تر عەدالەت بە واتای دروستی پەیوەندی نێوان تاک و خودای گەورە و پەیوەندی نێوان تاک و بەندەکان دێت.

ئیبن حەجەر دەڵێت:( اتفق أهل السنة على أن الجميع عدول ولم يخالف في ذلك إلا شذوذ من المبتدعة)،[1] (ئەهلی سوننە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هەموو هاوەڵان عەدالەتیان هەیە و کەس لەوەدا راجیا نیە جگە لە برێکی زۆر کەمی بیدعەچییان).

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: (إجماع أهل الحق من المسلمين وهم أهل السنة والجماعة على أنهم كلهم عدول)، [2] (یەکدەنگی ئەهلی حەق و راستی موسڵمانان کە ئەهلی سوننە و جەماعەیە، ئەوەیە هاوەڵان هەموویان عەدالەتیان هەیە).

ئەو ئایەت و فەرموودانەش کە سەبارەت بە پلەوپایەی هاوەڵان باسمانکردن، بەڵگەن بۆ عەدالەتی هاوەڵان.

لەراستیدا سێ وشە هەن کە پێویستە وریا بین و تێکەڵیان نەکەین و واتای هەرکامیان بزانین:

١. هەڵە: ئەمە هەموو مرۆڤێکی سەرزەوی پشکی هەیە تیایدا، وەک پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت(كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ)،[3] واتە(هەموو ئادەمیزادێ هەڵەکارە، چاکترینی هەڵەکارانیش ئەوانەن کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩.

[3] سنن ابن ماجه - أبواب الزهد - باب ذكر التوبة، الرقم ٤٣٧٥.

بەڵام ئەمەش دوو جۆری هەیە، جۆرێکیان بە ئەنقەستە کە ئەمە تاوانە، واتە سزای لەسەرە، جۆری دووەمیان بە ئەنقەست نیە، ئەمەیان بۆ خەڵکی ئاسایی ئومێدی لێخۆشبوونی خوایی هەیە، بەڵام بۆ پێغەمبەران ئیجتیهاد بووە، هەروەها ئەمە بۆ موجتەهیدانی ناو ئوممەتی ئیسلامیش هەیە وەک پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:( إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)،[1](ئەگەر حاکم حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد دواتر پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد و دواتر نەیپێکا و هەڵەی کرد ئەوە پاداشتێکی بۆ هەیە).

٢. عیصمەت: ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەرانی خوا کە خوای گەورە هەرچی نیازێکی خراپە هەیە لە دڵیاندا دەریکردووەو تەواوی نیاز و کاریان تەنها و تەنها بۆ خواو لەبەر خوایە، ئیتر ئەوان مەعصومن لە نیازی هەر کارێکی هەڵە یان خراپ.

٣. عەدالەت: ئەمە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێتەوە، جگە لە هاوەڵانیش دەگرێتەوە، واتە ئەوانەی بە ڕێی هاوەڵاندا هەنگاو بنێن و بەپێی قورئان و سوننەت بجووڵێنەوەو هەڵسوکەوت بکەن، پشت بەخوا مەرجی عەدالەت دەیانگرێتەوە، ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە هەموو هاوەڵان عەدالەتیان هەبووە نەوەک عیصمەت.

## بڕوای ئەهلی سوننەو جەماعە سەبارەت بە هاوەڵان

ئەهلی سوننە و جەماعە پێیان وایە هاوەڵان هەموویان خاوەنی عەدالەت بوون و کەسانی دڵسۆز بۆ ئایینی خوا و دڵسۆزانی دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوون، پێیان وایە قسەوتن بە هاوەڵان لە تاوانە گەورەکانە و سنووری هاوەڵان هێڵی سوورەو نابێت ببەزێنرێت، هەروەها پێیان باشە لە فیتنەی

[1] صحيح البخاري - كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة - باب أجر الحاكم إذا اجتهد فأصاب أو أخطأ، الرقم ٧٣٥٢.

نێوان هاوەڵاندا دەمیان راگرن و هیچ نەڵێن، چونكە بڕوایان وایە هاوەڵان دڵسۆز و خواناس بون و ئەوەش لەنێوانیاندا روویداوە، ئەنجامی ئیجتیهادە جیاجیاكانیانە بۆ خزمەت بە ئیسلام و قۆستنەوەی بارەكەیە لە لایەن ناحەزانی ئیسلامەوە، هەروەها سەردەمی هاوەڵان بە چاكترین سەردەم دەزانن و هاوەڵان بە پێشەنگ دەزانن بۆ خۆیان، بۆ ئەمەش چەند نموونەیەكی وتەی زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە دەخەینەروو:

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت:(یەكدەنگی ئەهلی حەق و راستی موسڵمانان كە ئەهلی سوننە و جەماعەیە ئەوەیە هاوەڵان هەموویان عەدالەتیان هەیە). [1]

نەوەوی دەڵێت: (بزانە قسەوتن بە هاوەڵان حەرامەو لە هەرە ناشیرینترینی حەرامەكانە، ئیتر قسەوتن بێ بەو هاوەڵانەی لە رووداوەكانی فیتنەی نێوان هاوەڵاندا هەبون، یان جگە لەوان بن، چونكە ئەوانە موجتەهید بوون لەو جەنگانەدا). [2]

ئیبن تەیمیەش دەڵێت: (ئەركی سەرشانمانە هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان خۆش بوێن لەبەر ئەوەی خوا ستایشی كردون، چونكە بڕوایان بە خوا هەبووە و پێغەمبەری خوایان بە راست زانیوە و سەریانخستووە، چونكە خوا بە جیهادی ئەوان لە رێی سەرخستنی ئایینی ئیسلامدا ئێمەی سوودمەند كردووە، ئەو ئایینەی كە خوا ئێمەی پێ منەتبار كرد، ئەو هاوەڵانە بە پاك و پوختی گەیاندیان بە ئێمە).[3]

ئیبن حەجەر دەڵێت:(ئەهلی سوننە یەكدەنگن لەسەر ئەوەی هەموو هاوەڵان عەدالەتیان هەیە و كەس لەوەدا راجیا نیە جگە لە برێكی زۆر كەمی بیدعەچییان).[4]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩.

[2] النووي: المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، ط٢، دار إحياء التراث العربي(بيروت-١٣٩٢هـ)، ج١٦، ص٩٣.

[3] ابن تيمية: الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان، المكتبة الشاملة، ص٢٠٥.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠.

## هاوەڵان لە قورئانی پیرۆزدا

ئەگەر بڕوانینە دەقەکانی ناو قورئانی پیرۆز و لەو ئایەتانە وردببینەوە کە ئاماژە بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، دەبینین بەم چەشنە باس لە هاوەڵان کراوە:

چاکترینی ئوممەتانی ناو ئادەمیزاد کە راسپێردراون بە رێگری لە خراپە و تەشەنەپێدانی چاکە.

هەوڵدانیان بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا و سەرخستنی پەیامی ئیسلام.

راستگۆبوونیان لەگەڵ پەروەردگاریان و شوێنکەوتەیی راستەقینەیان بۆ پێغەمبەرەکەی.

بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا و رازی بوونی ئەوانیش لە پەروەردگاریان.

بەدەستهێنانی لێخۆشبوونی پەروەردگاریان.

چەشنی براله سیفەت و ئاکاری پێغەمبەری خوایان وەردەگرت.

لەنێوخۆیاندا بەسۆز و میهرەبان و بەرامبەر بێباوەڕانی سەرسەخت توند و بەهێز.

بەڵێنی چاکە و بەهەشت دراوە بە زۆرێک لە هاوەڵان لەپای هەڵوێستە ناوازەکانیان لە وێستگە جیاوازەکانی وەک کۆچ و بەدر و بەیعەتی ریزوان.

بۆ ئەمەش پانزە ئایەتی قورئانی پیرۆز بە نموونە باس دەکەین کە تیایاندا باسوخواسی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە:

**هاوەڵان چاکترین دستەن:**

هاوەڵان سەردەستەی ئەو ئوممەتەن کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت(كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ

# پەیوەندییەکانی هاوەڵان

## پەیوەندی هاوەڵان و پەروەردگاریان

یەکێک لەو پرسە گرنگانەی کە زۆرجار مرۆڤ ناتوانێت مامەڵەیەکی دروستی لەگەڵ بکات، پەیوەندییەتی لەگەڵ پەروەردگاریدا، ئەمەش بەشێکی پەیوەستە بە دەروونی خۆیەوە کە بە تەواوەتی خۆی نەداوەتە دەست فەرمانی خوا، بەشێکیشی پەیوەستە بە لاوازی ئەو کەسە لە ئاست پیلانەکانی شەیتانی دوژمنی سەرسەختیدا کە زۆرجار بە بیانووی چاکەی تر سەرقاڵمان دەکات لە ڕێگە ڕاستەکە، لەنێو ئەوانەشدا مامەڵەمان لەگەڵ پەروەردگارمان.

جاری وا هەیە تاکی موسڵمانی ئەمڕۆ هێندە سەرقاڵ دەبێت بە جۆری مامەڵەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پیاوچاکانەوە، بیری دەچێتەوە خۆشەویستی ئەمانە بەهۆی پەروەردگاریەوەیەتی، هەندێک جار دەگاتە ئاستی هاوەڵدانان بۆ خوا، یان کەسانێک بە بیانووی خەمخۆرییان بۆ بانگەواز، زۆرجار بیریان لای ئەوە نیە ئایا بازنەی پەیوەندییان لەگەڵ پەروەردگاریان لە چ حاڵەتێکدایە، بۆیە بە بیانووی خەمخواردنی ئوممەتەوە نوێژە فەرزەکان دەفەوتێنن، موناجاتی پەروەردەگاریان پشتگوێ دەخەن، ئەمانە و دەیان هۆکاری تر کە هەڵەی باون.

جوانی حاڵەتی هاوەڵان لەوەدایە ئەگەر هەرکامێکیان لەم بوارەدا هەڵەیەکی کردبێت یان ڕێی لێ ون بووبێت، خێرا ڕاستکراوەتەوە، بەشێکی دیاری ئەم ئەزموونەش بۆ ئێمە بەجێماوە.

پێویستە لە دوو ڕووی جیاوازەوە لەسەر ئەم پرس و پەیوەندییە بدوێین، ئەویش بریتیە لە:

## مامەڵەی خوا لەگەڵ هاوەڵان

گەورەترین میهر و بەخشندەیی خوا بەرامبەر بە هاوەڵان بریتی بوو لە ڕێنیشاندانیان، ئەمە منەتێکە خوای گەورە بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا دەیکات (لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ يتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ)، (بێگومان خوا منەتی نا بەسەر باوەڕداراندا، چونکە هەر لەخۆیان پەیامبەرێکی میهرەبان ودلۆڤانی بۆناردن، هەتا بەئاسانی وتووێژی لەگەڵ بکەن و لێی تێبگەن ئایەتەکانی خوایان بەسەرا دەخوێنێتەوەو، دڵ و دەرونیشیان لەهەر ئاکارێکی دزێوو خراپ پاکژ دەکا و فێری قورئان و حیکمەت و فەرموودەکانیشیان دەکات بێ شک بەر لە هاتنی ئەو پێغەمبەرە، سەرلێشێواو بوون و هیچ شتێکیان نەدەزانی و، زۆریش بەدخوو بوون و، دارو بەردیان دەپەرست، کچیان زیندە بەچاڵ دەکرد، بە ژنان سووکایەتییان ئەکرد، بێ سنوور مەیی و شەرابیان دەخواردەوە، لە سوورەتی (جومعە)شدا کورتەیەک هەر لەم باسە دواوین، دەتوانی تەماشای بکەیت).

فەزڵی پەروەردگار بەرامبەر بە هاوەڵان ئەوەبوو هاوەڵێتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) پێ بەخشین، ئەمەش بەخششێک بوو کە هاوەڵان شوکرانەبژێرییان لەسەر دەکرد، ئەگەرچی هێندەی ئەوەی فەزڵ بوو، هێندەش تاقیکردنەوە بوو بۆیان کە لەو سەردەمەدا پێغەمبەرێکی لەنێویاندا نارد کە خەڵکانێکی زۆر نەوەک نەیانتوانی بچن بەدەم بانگەوازەکەیەوە، بەڵکو دژایەتیەکی سەرسەختانەی پەیامەکەیان دەکرد، ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی خوایی بوو کە دۆڕاو تیایدا ماڵوێران و براوە تیایدا خاوەن فەزڵی تایبەت بوو، هاوەڵانیش بەر ئەو فەزڵە کەوتن.

هەروەها خوای گەورە رق و دژایەتی و دووبەرەکی نێوان هاوەڵانی هەڵگرت و لەبری ئەوە برایەتی خستە نێوانیان، برایەتیەک کە ئەگەر هەموو

خەرجی سەر زەوی و توانا مرۆییەکانی بۆ بخرایەتەگەڕ، بەو چەشنە لەنێو دڵاندا نەدەچەسپا (وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنْفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)، (و هۆگریی و تەبایی خستە دڵ و دەرونیانەوە، مەبەست لە موسڵمانانی هۆزی (ئەوس)و (خەزرەج)ـە، ئەوانبوون پاش ئەو هەموو کێشەو دوژمنایەتییە مێژووییەی سەردەمی نەفامییان-بەفەزڵی ئیسلام- ئاشتبوونەوەو بوونە برا ئەگەر هەرچی لەم زەوییەدایە بەختت کردبا لە پێناوی ئەو ئاشتەواییەدا نە تدەتوانی دۆستی و تەبایی ئاوا لە دڵیاندا جێگیر بکەیت لە نێوان دڵەکانیاندا بەڵام خوای دلۆڤان - بە میهرەبانیی و توانایی خۆی - ئاشتیکردنەوەو هۆگری خستە نێوانیان بێگومان ئەوخۆی دەسەڵاتداری لەکارزان و کارجوانە).

خوای گەورە وەرگرتنی پەیامەکەی و گەیاندنی بە هەموو سەرزەوی دایە دەست هاوەڵان، ئەمەش لەلایەکەوە فەزڵ و گەورەیی بوو، بۆیە چاکە و دەستکەوتی قیامەتی هەر موسڵمانێک لەسەر زەویدا پشکی هاوەڵانی تێدایە، لەلایەکیشەوە بەرپرسیارێتیەکی سەخت بوو، چونکە ئەوان ئەزموونی یەکەمی ئوممەت بوون، بۆیە جاری واهەبوو لەسەر هەڵەیەکی یەکێک لەوان ئایەت دادەبەزی، هەندێک جار خوای گەورە لە ئاست هەڵە و تاوانەکانیاندا سزای ئاشکرای دەدان، نموونەش ئەو سێ هاوەڵە بوو کە لە غەزای تەبووک دواکەوتن، سزادانەکە بەردەوام بوو هەتا بە ئایەتی قورئان لەسەریان هەڵگیرا (وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)، (خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش وەرگرت کەخۆیان لە غەزاکە گرتە دواوە، واتە: لە مەدینە مانەوەو نەچوونە جەنگی تەبووک تا لەخەفەتدا وای لێهات ئەم زەوییە فراوانەیان لاتەنگ بوو و لەخەم و خەفەتا لە گیانی خۆیان بێزار بوون، چونکە پەیامبەر(ﷺ) بڕیاریدابوو نابێ هیچ کەسێک تەنانەتی سڵاویشیان لێ

بکات، هەتا فەرمانی خوا دێت!! ئیتر زانییان کە هیچ پەنایەکیان نەماوە، مەگەر هەر پەنا بەخوا بەرن لەپاشان خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن، بۆئەوە تەوبە بکەن، ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کردو خوا بەخشینی بەڕاستیی تەنها ئەو خوایە قەبوولکاری تەوبەو، لێبوردە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە).

خوای گەورە پشتیوانی خۆی بە هاوەڵان بەخشی، چ لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، چ لە مەیدانی جیهاد و بانگەوازی ڕێی خوادا، ئەو کاتەی دوژمن سەنگەری لێ دەگرتن، هێزی پشتیوانی فریشتەکان بە فەرمانی خوا پشتی هاوەڵانی دەگرت (وَلَقَدْ نَصرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٢٣) إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُنْزَلِينَ (١٢٤) بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ (١٢٥) وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُمْ بِهِ وَمَا النَّصرُ إِلَّا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ (١٢٦)، (بێ سۆ لەڕۆژی (بەدر)دا خوا بەسەر دوژمندا سەریخستن و، ناتەواوو کەم و بێ دەسەڵات و کزو لاوازیشبوون، بەڵام چونکە (صەبر)و (تەقوا)تان هەبوو، خوا سەریخستن، ئێستایش ئەر هەروا بمێننەوە، خوا هەر سەرتان دەخات دەساهەر لەخوا بترسن و خۆبپارێزن ، بەڵکو بتوانن شوکری بکەن،ئەو دەمە وەبیربێنە ئەی پێغەمبەر (ﷺ)! (ڕۆژی بەدەر، یان ئوحود) کە بە باوەڕدارەکانت دەگوت: ئاخۆ ئەوەندەتان بەس نەبێ کە: پەروەردگارت لە فریشتەکانی خۆی (سێ هەزار) بنێرێتە خوارێ بۆهاوکاریتان، واتە: هێشتای بەو حاڵەتەشەوە، لەبەر کەمیتان ورەتان نەمابوو. تەفسیر نووس و مێژوو نووسەکان لەوەدا هاودەنگن کەخوا لەوڕۆژەدا فریشتەی ناردو جەنگیشیان کرد، (ئەسەر)ێکی زۆرییش هاتووە کە فریشتە بە مێزەرەی سپی و ڕەش و زەردەوە چوونە ناوگۆڕەپانی جەنگەوە. (ئەبوداودی مازنیی) دەڵێت: لە جەنگی (بەدر)دا کەوتمە دوای کابرایەک تا لە ملی بدەم، جا پێش ئەوە من بیگەمێ، دیتم سەری پەڕیی و هیچ کەسێکیش لەپێشمەوە نەبوو، بەڵێ ئەو

ئەندازەیە بەسە، ئەگەرئێوە خۆڕاگربن و لەسنوورەکانی خوا پارێز بکەن و خۆ لەم کاتەدا پەلامارتان بدەن پەروەردگارتان بە پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدار کۆمەکتان دەکات،خوای کارجوان ئەوەیشی هەر بۆئەوە کرد: ببێتە مژدەیەک بۆ ئێوە و پێیشی دڵنیاو بە ئارامبن. واتە: بۆیە خوا فەرمووی: و فریشتەیش هاتن تا ببێ بە مژدە بۆتان و دڵیشتان ئەستوور ببێ و، ئیتر لەزۆری ژمارەی ئەوان نەترسنئەگینە خۆ سەرکەوتن تەنها بەدەستی خوای باڵادەست و کارجوانە، بەهێزو فریشتەو هۆ ئەسباب نیە، چونکە ئەر بیەوێ سەرتانخات، بێ ئەوش سەرتان دەخات).

هاوکات شایەتی ئەوەی بۆ دان کە باشترینی ئوممەتن، ئەمەش هەم لە قورئاندا تۆمار کراوە (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ)، (ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵک گەیاندن بەمەردم و ڕێنمایی کردنیان فەرمان بەچاکە دەدەن و، ڕێ لەکاری خراپەو شیرک دەگرن و باوەڕیشتان بەخوا هەیە، بەڵام گەلانی تر، وەک ئێوە گشت ئەم سیفەتانەیان تێدانییە) هەم پێغەمبەریش(ﷺ) ئەو شایەتیەی دەربڕی (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)[1] واتە:(چاکترینی خەڵک سەدەی منن، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان).

تەنها ئەوەش نا، بەڵکو بە دەقی ڕاشکاوی قورئان ڕەزامەندی خۆی بۆ هاوەڵان نیشان دا (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا)، (بێگومان خوا ڕازیبوو لە ئیماندارەکان کاتێک – لە ژێر ئەو درەختەدا پێی دەڵێن: (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت ئەی موحەممەد جا خوا بەو ڕاستیی و وەفایەی لە دڵیاندا بوو بۆ پەیامەکەت ئاگاداربوو، ئینجا لەکاتی پەیمانەکەدا ئارامیی دابەزاندە سەریان و بە سەرکەوتنێکی نزیک - فەتحی خەیبەر- لەسەر (بيعة الرضوان) پاداشتی دانەوە)

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الشهادات – باب لا يشهد على شهادة جور إذا أشهد، الرقم ٢٦٥٢، صحيح مسلم – كتاب فضائل الصحابة – باب فضل الصحابة(ﷺ) ثم الذين يلونهم، الرقم ٢٥٣٣.

لە سـەروو ئەوەشـەوە موژدەی بەهەشـت و پاداشـتی چاکەی پێدان (لَا يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ)، (چوونیـەک نین ئـەو کەسـەتان کـە پێش (فەتح) و (ئازادکردنی مەککە) مـاڵ و دارایـی خۆی بەخت کردووەو، لەگـەڵ دوژمنانی خـوادا جەنگاوە، لەگـەڵ ئەوانـەی تـردا کـە پـاش فەتحی مەککە دێن و مـاڵ و دارایی خۆیان بەخت دەکەن و دەجەنگێن، چونکە پێش ئازادکردنی مەککە، زیاتر پێویستی بە بەخشینی مـاڵ بوو ئا ئەوانە کە لە پێش فەتحی مەککەوە ماڵیـان بەختکردووەو جەنگاون، پلەیان گەورە ترە لەوانە کە لـە پاش فەتحی مەککەوە ماڵیـان بەختکردووەو جەنگاون. وە هەریەکێ لەوانـەش ماڵیان بەخت کردووەو جەنگاون، بـە پێی پلـەی خۆیـان خـوای میهرەبـان بەڵێنـی بەهەشـتی داونەتێ وە خـوای هـەق ئـاگادارە بـە کارەکانتـان).

کاتێک بەنـی سـولەیم ناپاکیەکەیان کرد، حەرام چوو بۆ لایـان و سـەبارەت بـە پێغەمبـەر(ﷺ) قسـەی دەکرد بۆیـان، ئەوەبوو ئیشـارەتیان کرد بۆ کەسێک و ئەویش بـە ناپاکـی لێیدا، حەرامیش هـاواری کـرد و وتـی: اللـه أكبـر سـوێند بـە خـوای کەعبـە بردمـەوە، ئینجا بەنـی سـولەیم کەوتنـە کوشـتنی هاوەڵانـی تر، دواتـر جیبریـل هەواڵـی دا بـە پێغەمبـەر(ﷺ) کـە ئەوانـە گەیشـتون بـە خـوای گـەورە و خـواش لێیـان رازیـە و ئەوانیش لـە خـوا رازین.[1] پێغەمبـەر(ﷺ) بـە هاوەڵانـی فەرمـوو (إن إخوانكم قد قتلوا، وإنهم قالوا: اللهم بلغ عنا نبينا أنا قد لقيناك فرضينا عنك، ورضيت عنا)، (براکانتان کوژران و ئەوەشیان دەوت خوایە لە زاری ئێمـەوە بـە پێغەمبەرەکەمـان بگەیەنـە کـە پێت گەیشـتوین و لێت رازیـن و تۆیش لێمـان رازیـت).[2]

ئەمانە و چەندەها خاڵی تر کە لە بازنەی گشـتی هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە، هاوکات خـوای گەورە چاکەی بەسـەر هاوەڵانێکی تایبەتدا هەبوو کە لە بازنەی

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الجهاد والسير – باب من ينكب في سبيل الله، الرقم ٢٨٠١.

[2] صحيح مسلم – كتاب الإمارة – باب ثبوت الجنة للشهيد، الرقم ٦٧٧.

مامەڵەی تایبەتی نێوان بەندە و پەروەردگاریدا بوو، کاتێک هاوەڵانێک چەند قۆناغێکی تایبەتی ئیمانییان دەبڕی و شیاوی ئەو مامەڵە تایبەتە دەبوون، خوای گەورە فەزڵی ئەو مامەڵە تایبەتەی لەگەڵیاندا دەنواند.

- ناوهێنانی هاوەڵێک لەلایەن پەروەردگارەوە:

خوای گەورە ناوی هەندێک هاوەڵی هێناوە، بۆ نموونە:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرمووو (إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ : { لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ })، (خوای گەورە فەرمانی پێکردوم ئەم ئایەتە بخوێنمەوە بەسەرتدا)، ئوبەی وتی: یانی خوا ناوی منی هێنا؟ فەرمووی: بەڵێ، ئوبەی خۆی پێ نەگیرا و دەستی کرد بە گریان.[1]

ئەمەش شتێکی نامۆ نەبێت لامان، چونکە فەرموودەیەکی قودسی زۆر جوان وێنای ئەم حاڵەتەمان بۆ دەکات کە دەفەرموێت (أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي ، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي ، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي ، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ)،[2] (من لەگەڵ گومانی بەندەکەمم بەرامبەرم، هەرکات یادی کردم لەگەڵیدام، ئەگەر لە نەفسی خۆیدا یادی کردم لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، ئەگەریش لەناو جەمعێکدا یادی کردم، منیش لە جەمعێکی چاکتر لەو گرۆی ئەو یادی دەکەم).

- سەلام لێکردن:

جیبریل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: (يَا رَسُولَ اللهِ ، هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ ، مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ إِدَامٌ أَوْ طَعَامٌ أَوْ شَرَابٌ ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلَامَ مِنْ رَبِّهَا وَمِنِّي ، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لَا صَخَبَ فِيهِ وَلَا نَصَبَ)، (ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە خەدیجەیە وا دێت، قاپێکی پێیە کە ئیدام یان خواردن یان خواردنەوەیەکی تێدایە، ئەگەر هات بۆ لات سەلامی پەروەردگاری و سەلامی منیشی پێ

[1] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب مناقب أبي بن كعب(ﷺ)، الرقم ٣٨٠٩.

[2] صحيح البخاري - كتاب التوحيد - باب قول الله تعالى ويحذركم الله نفسه، الرقم ٧٤٠٥.

بگەیەنەو موژدەی بدەرێ بەماڵێک لە بەهەشتدا کە لە یاقووت و مرواری دروستکراوەو هات و هاوار و ماندووبوونی تێدانیە).[1]

- گیرابوونی نزای تایبەت:

هەندێ لە هاوەڵان مامەڵەیان لەگەڵ پەروەردگاریان دەگەیشتە ئاستێک بێخەم بوون لە گیرابوونی نزاکانیان، بە چەشنێک کە نزایان دەکرد، وردەکاری داواکارییەکەشیان دەوت، خوای پەروەردگاریش نزاکەی گیرا دەکردن، نموونەی ئەوانەش سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بوو کە نزا تایبەتەکانیشی گیرا دەبوون، ئەوەبوو جارێک خەڵکی کووفە لای عومەری کوڕی خەططاب سکاڵایان لە سەعد کرد و وتیان نازانێت جوان بەرنوێژی بکات، ئەویش وتی: من هەمان ئەو نوێژەیان بۆ دەکەم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیکرد، خەلیفە وەفدێکی نارد بۆ وەرگرتنی رای خەڵکی لەو بارەوە، هەموان وەسفی چاکەی سەعدیان دەکرد جگە لە کابرایەک بە ناوی ئەبووسوعدە کە گومانی خستە سەر دادپەروەری و راستێتی سەعد، سەعدیش کە ئەوەی بیستەوە پێی ناخۆش بوو و وتی: خوایە ئەگەر درۆ دەکات، چاوی کوێر بکەیت و ماوەیەکی زۆر هەژاری بخەیت و دووچاری فیتنەشی بکەیت، عەبدولمەلیک کە شایەتحاڵی ئەو کابرایە بوو دەیوت: کابرام بینی کە خەڵک هەواڵیان دەپرسی، دەیوت: پیرێکی هەژاری تووشبوو بە فیتنەم، نزاکەی سەعدم لێ گیرا بوو.[2]

ئەنەسی کوڕی نەضر کە نەیتوانی بوو لە جەنگی بەدردا بەشدار بێت، دوای جەنگی بەدر چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە یەکەم جەنگدا کە دژ بە بێباوەڕان ئەنجامت دا من ئامادە نەبووم، سوێند بەخوا ئەگەر ئەمجار خوا دەرفەتم دەدات جەنگی بێباوەڕان ببینم و بەشدار بم تیایدا خوای گەورە دەبینێت چی دەکەم، ئەوەبوو جەنگی ئوحود هات و

---

[1] صحيح البخاري – كتاب مناقب الأنصار – باب تزويج النبي(ﷺ) خديجة، الرقم ٣٨٢٠.

[2] صحيح البخاري – كتاب الأذان – باب وجوب القراءة للإمام والمأموم في الصلوات كلها في الحضر والسفر، الرقم ٧٥٥.

تیایدا ئەنەسی کوڕی نەضریش بەشداری کرد، کاتێک موسڵمانان شکان و بڵاوەیان تێکەوت ئەنەس وتی: خوایە من لەبەردەمتدا پۆزش دێنمەوە لەوەی کە ئەوانە کردیان-واتە موسڵمانەکان- وە لەبەردەم تۆدا دوورەپەرێز دەبم و تەبەرا دەکەم لەوەی ئەوانە بۆی هاتون و دەیکەن-واتە بێباوەڕان- دواتر لێنەوی، سەعدی کوڕی موعاذی بینی وتی: ئەی سەعد ئەوە بەهەشتە سوێند بەخوا بۆنی دەکەم لە خواروو ئوحودەوە، سەعد دەڵێت: ئەوەی ئەنەس کردی من نەمتوانی بیکەم، ئەوەبوو ئەنەس لەو جەنگەدا شەهید بوو.[1]

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا عەبدوڵای کوڕی جەحش پێی وتم: وەرە با لە خوا بپاڕێینەوە، ئەوەبوو چووینە سووچێکەوە، من نزام کرد وتم: خوایە سبەی بگەم بە کابرایەکی زۆر بەهێز و لەپێناو تۆدا لەگەڵی بجەنگم و دواتر بەسەریدا سەربکەوم تا بیکوژم و شمەکەکەی بەدەستکەوت بەرم، عەبدوڵای کوڕی جەحشیش وتی: خوایە سبەینێ تووشم بێت بە تووشی کابرایەکی زۆر بەهێزەوەو لەپێناو تۆدا لەگەڵی بجەنگم، دواتر بمکوژێت و گوێ و لووتم ببڕێت، کە ڕۆژی دوایی گەیشتمەوە بە تۆ بفەرموویت ئەی عەبدوڵا بۆچی گوێ و لووتت بڕاوە؟ منیش بڵێم لەپێناو تۆ و پێغەمبەرەکەتدا، تۆیش بفەروویت ڕاست دەکەیت، سەعد دەڵێت: نزاکەی عەبدوڵا لەوەی من باشتر بوو، کۆتای ڕۆژی ئوحود تەرمەکەیم بینی گوێ و لووتی کرابوون بە دەزوویەکەوە.[2]

- بەخششی تایبەت:

هەندێ لە هاوەڵان خوای گەورە بەخششی تایبەتی پێ دەبەخشین، بەخششێک کە لە تێڕوانینی ئادەمیدا هاتنەدییان سەخت بوو، ئەمەش نموونەی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب قول الله تعالى من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه، الرقم ٢٨٠٥؛ صحيح مسلم - كتاب الإمارة - باب ثبوت الجنة للشهيد، الرقم ١٩٠٣.
الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦٤٢.

[2] المستدرك على الصحيحين - كتاب الجهاد - رأس الأمر الإسلام وعموده الصلاة وذروة سنامه الجهاد، الرقم ٢٤٢٢، صححه الذهبي في التلخيص.

هەمان ئەو حاڵەتانەیە کە پێشتر خوای گەورە بۆ ئەولیاکانی خۆی هەیبووە وەک ئەوەی بە مەریەمی بەخشی.

کاتێک خوبەیب بەدیل گیرا، ئەو ئافرەتەی ئاگاداری بوو هەتا رانەکات، حاڵەتێکی نامۆی بینی کە دواتر گێڕایەوە، دەیوت: رۆژێک خوبەیبم بینی هێشووە ترێیەکی بەدەستەوە بوو و لێی دەخوارد لەکاتێکدا بە ئاسن کۆت کرابوو، ئەو ترێیە لەناو هەموو مەککەدا نەبوو.[1]

- لەرینەوەی عەرشی خوا:

لە فەرموودەی صەحیحدا تۆمار کراوە کە عەرشی خوا بۆ مەرگی سەعدی کوڕی موعاز لەریوەتەوە.[2]

- موژدەی راستەوخۆی بەهەشت:

خوای گەورە فەزڵی بەرامبەر بە هاوەڵانێک نیشاندا کە هەر لە ژیانی دنیادا موژدەی بەهەشتیان پێ بدرێت، ئەمەش پەیوەستە بە زانستی خوای گەورەوەو هەڵسەنگاندنە عەقڵییەکان ناتوانن بڕیار لەسەر ئەو بابەتە بدەن، ئەو هاوەڵانەش کە موژدەی راستەوخۆی بەهەشتیان پێ دراوە ژمارەیان لە سەروو بیست هاوەڵەوە بوو، ئەمە تەنها ئەوانەی کە لە فەرموودەکاندا ئاماژەیان پێ دراوە، خوای گەورەش خۆی زاناترە چەند هاوەڵی تر موژدەی راستەوخۆی پێ درابێت، بەڵام بە ئێمە و هاوەڵانی دەوریشیان نەگەیشتبێت، وەک چۆن ژمارەیەکی زۆری پێغەمبەران تەنانەت بۆ پێغەمبەری خوایش(ﷺ) باس نەکراون، وەک خوای گەورە دەفەرموێت (وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ)، (وە لەپێشەوە چەند پێغەمبەرێکی تریشمان ناردووە، و پێغەمبەر گەلێکی تریش هەن ، کە لەقورئاندا بۆم باس نەکردویت).

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

[2] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب مناقب سعد بن معاذ(ﷺ)، الرقم ٤١٣٩.

# مامەڵەی هاوەڵان لەگەڵ پەروەردگاریان

**ملکەچی بۆ خوا:**

جوانترین و لەپێشینەترین خاڵی پەیوەندی هاوەڵان بە پەروەردگاریانەوە، بریتی بوو لە خۆتەسلیمکردنیان بە خوای گەورە، بڕواهێنان پێی و هاوەڵ بۆ بڕیارنەدانی و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتنی پەیامەکەی و ملکەچبوون بۆی لە هەموو حاڵەتێکدا نەوەک تەنها لەو حاڵەتانەی لەگەڵ حەز و ئارەزوویاندا دەهاتەوە.

کاتێک صوهەیب کۆچی کرد بۆ مەدینە، قورەیشییەکان کەوتنە شوێنی و ڕێیان پێگرت، ئەویش کەوانەکەی گرتەدەستی و وتی ئێوە دەزانن من لە تیرهاوێژیدا لە هەمووتان بەهێزترم، بەخوا تا خۆتان دەگەیەننە لام هەموو ئەم تیرانەم تێدا تەواو کردون، دواتریش تا دەستم مابێت بەم شمشێرەی دەستم لەگەڵتان دەجەنگم، ئەگەر سامانەکەی منتان دەوێت، پێتان دەڵێم لە کوێیە، ئەوانیش وتیان: دەی سامان و باخەکەت بدە بە ئێمە ئیتر وازت لێدێنین، صوهەیب بەڵێنی لێ وەرگرتن، ئینجا پێی وتن سامانەکەی لەکوێیەو خۆی چوو بۆ مەدینە، پێغەمبەر(ﷺ) کە صوهەیبی بینی فەرمووی (مامەڵەکەت بردەوە ئەی ئەبوو یەحیا)، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە(ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضات الله والله رؤوف بالعباد)(لە ناو خەڵکی مرۆڤی وایش هەیە لەبەر ڕەزای خوای گەورە گیانی خۆی دەبەخشێ خوایش لەتەک بەندەکانی خۆیدا بە بەزەیی و دلۆڤانە).[1]

---

[1] المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٣٦١٤.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەیوت: ڕەحمەتی خوا لە ئافرەتە کۆچەرییە یەکەمینەکان، کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) خێرا پارچەیەک لە جلەکەی بەریان دڕاند بۆ داپۆشینی سەروملیان (یان دەموچاویان).[1]

ئەم حاڵەتە ئافرەتە پشتیوانیەکانیشی دەگرتەوە، هەروەک ئومموسەلەمە سەبارەت بەم ئایەتە (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ) دەڵێت: ئافرەتە پشتیوانییەکان -کە ئەم ئایەتەیان بیست- هاتنەدەرەوە بەهۆی رووماڵی سەریانەوە دەتوت قەڵەڕەش بەسەر سەریانەوەیە،[2] مەبەستی ئەوەبوو خێرا بەشێک لە جلی بەریان کرد بە لەچک بۆ سەروملیان.

ئەنەسی کوڕی مالیک بەسەرهاتێکی زۆر ناوازە لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە ماڵی ئەبووطەلحە بووین، من خەریک بووم مەیم دەگێڕا بۆ خەڵکەکە -ئەوکات مەی حەرام نەکرابوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە کەسێک کرد هاوار بکات (مەی حەرام کرا)، کە ئەمەمان بیست، ئەبووطەلحە پێی وتم: بڕۆ دەرەوە بیرێژە، منیش بەگوێم کرد، بەشێک لە هاوەڵان خەم دایگرتن سەبارەت بەو بەشەی پێش ئەو فەرمانە خواردبوویانەوە هەتا ئایەتی خوا دابەزی (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا).[3]

هاوەڵان زۆر بە جوانی لەم ئایەتە تێگەیشتبوون (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ)، (پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ و « ئەتانەوێ لێی نزیک ببنەوە» دەبێ پەیڕەوی لەشەریعەت وبەرنامەکەی من بکەن، ئەوسا خوایش ئێوەی خۆش دەوێ و لە هەڵەو گوناهەکانیشیان خۆش دەبێت چونکە ئەوخوایە زۆر چاوپۆشیکارو، زۆریش دلۆڤان و میهرەبان.)، بۆیە بە سەلماندنی خۆشەویستییان بۆ خوا و

[1] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة النور - باب وليضربن بخمرهن على جيوبهن، الرقم ٤٧٥٨.

[2] سنن أبي داود - كتاب اللباس - باب في قول الله تعالى يدنين عليهن من جلابيبه، الرقم ٤١٠١.

[3] صحيح البخاري - كتاب المظالم - باب صب الخمر في الطريق، الرقم ٢٤٦٤.

بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی، زۆر بە جوانی شوێنکەوتیی خۆیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) نیشاندەدا، بەدیهاتنی ئەم مەرجە لەلایەن هاوەڵانەوە ئەنجامەکەی پێ بەخشین کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بوو، ئەو ڕەزامەندییەش بە دەقی ئایەت لە قورئاندا تۆمار کرا.

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت: خەڵکی لە قوباء لە نێو نوێژی بەیانیدا بوون، کەسێک هات و وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمشەو قورئانی بۆ دابەزیوەو فەرمانی پێکراوە ڕووبکاتە قیبلە -پێشتر ڕوویان لە بەیتولمەقدیس دەکرد-، هاوەڵان کە ئەمەیان بیست خێرا ڕووەو کەعبە ڕوویان وەرچەرخاند.[1]

هەندێ جار فەرمانی پێغەمبەری خوایشیان(ﷺ) نەدەبیست، تەنها دەیانبینی پێغەمبەرەکەیان شتێک دەکات، ئەوانیش دووبارەیان دەکردەوەو چاوەڕێی ئەوە نەبوون فەرمانیان پێ بکرێت ئینجا وابکەن، بۆ نموونە ئەبووسەعیدی خودری دەگێڕێتەوە جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی دەکرد نەعلەکانی لابرد، هاوەڵانیش خێرا نەعلەکانیان لابرد، کە نوێژ تەواو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بۆچی نەعلەکانتان داکەند؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆمان بینی واتکرد، ئەویش فەرمووی (إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ بِهِمَا خَبَثًا ، فَإِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَيْهِ، فَلْيَنْظُرْ فِيهِمَا، فَإِنْ رَأَى بِهَا خَبَثًا فَلْيُمِسَّهُ بِالْأَرْضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فِيهِمَا)،[2] (ئەوە جیبریل هات بۆ لام و هەواڵی پێدام ژێر نەعلەکانم پیسییان پێوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان هاتە مزگەوتەوە با نەعلەکەی هەڵگێڕێتەوە و سەیری ژێرەوەیان بکات، ئەگەر پیسی پێیانەوە بینی با بیانخشێنێت بە زەویدا ئینجا نوێژیان پێوە بکات).

عەبدوڵای کوڕی عومەر باسی عومەری کوڕی خەططابی باوکی دەکات کە لە ئاست خوای گەورەدا چ ئەدەب و لەخواترسیەکی هەبووە، دەیوت:

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الصلاة - باب ما جاء في القبلة، الرقم ٤٠٣.

[2] مسند أحمد بن حنبل، مسند أبي سعيد الخدري(ﷺ)، الرقم ١١٣٢٢، قال شعيب الأرناؤوط صحيح على شرط مسلم.

هەركات عومەرم دەدی تووڕە بوایە، لەو كاتەدا باسی خوای بۆ بكرایە، یان بە بیرخستنەوەیەک بترسێنرایە، یان هەركەسێک ئایەتێكی قورئانی لەلا بخوێندایە، یەكسەر لەو هەڵوێستی تووڕەییەی دەوەستا و وازی دەهێنا.[1]

**پشتبەستن بە خودا:**

پشتبەستن بە خوا كرداری دڵە نەوەک گوفتاری زمان یان جووڵەی جەستە،[2] ئەویش بریتیە لەوەی دڵ بە تەواوەتی پشت بە خوا ببەستێت بۆ بەدەستهێنانی سوود و لەكۆڵبوونەوەی هەموو زیانەكانی دنیا و ئاخیرەت، ئەو كەسە لە دڵەوە بگاتە ئەو بڕوایەی بەخشین و گرتنەوەو سوود و زیان تەنها بەدەست خوایە.[3]

خوای گەورە فەرمانی بە باوەڕداران كردووە تەنها پشت بە الله ببەستن (وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ)، (با بڕواداران تەنها پشت بە خوا ببەستن).

پێغەمبەریش(ﷺ) وانەی تەوەكولی فێركردبوون (لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيرُ، تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا)،[4] (خۆ ئەگەر ئێوە وەک خۆی پشت بە خوا ببەستن، دڵنیابن خوای گەورە رزۆیتان دەدات وەک چۆن رۆزی باڵندە دەدات، وەک چۆن بەری بەیان بە برسێتی دەردەچێت و دەمەو ئێوارە بە تێری دەگەڕێتەوە).

ئەوان بە جوانی تێگەیەنرابوون دەبێت پشت بە چ زاتێک ببەستن:

- زیندوویەک كە نامرێت (وتوكل على الحي الذي لا يموت)
- بەتوانایەک كە هەموو شتێكی پێ دەكرێت (وَمَن يتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)
- دانایەک كە چاكترینەكان دەزانێت
- زانایەک كە غەیب و نهێنییەكانیش دەزانێت (وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا)

---

[1] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص ٤٨.

[2] مدارج السالكين لابن القيم، ج٢، ص ١١٤.

[3] ابن رجب الحنبلي: جامع العلوم والحكم، الطبعة السابعة، مؤسسة الرسالة – بيروت ٢٠٠١م، ج٢، ص ٤٩٧.

[4] جامع الترمذي – أبواب الزهد عن رسول الله(ﷺ) – باب في التوكل على الله، الرقم ٢٣٤٤ و قال حسن صحيح.

• بە ئاگایەک کە نانوێت و هەمیشە ئاگادارە (وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ)
• میهرەبانێک کە سۆزی لە دایک و باوک زیاترە بۆمان (قُلْ هُوَ الرَّحْمَنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا)

هەروەها فێرکرابوون ئەگەر پشتبەستنت بەخوا هەبوو، چیت دەستدەکەوێت
خوا خۆشی دەوێیت (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)
ئیتر خوات بەسە (وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ)
بێخەمت دەکات (فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ)
شەیتان پێت ناوێرێت (إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)

بۆیە بە تەواوی واتا لە سارد و گەرمی ژیانیاندا پشتیان بەخوا دەبەست، راگەیاندن و هاتوهاوار و هەڕەشەی چواردەوریان نەیدەترساندن، بەپێچەوانەوە ئیمانیان زیادی دەکرد، ئەنجامەکەشیان چنییەوە، خوای گەورەش ئەم شایەتیەی بۆ داون (الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ (١٧٢) الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١٧٣) فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ (١٧٤) إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ)، (ئەو هاوەڵانە کەلەپاش بریندار بوونیشیان (لە ئوحود) وەڵامی خواو پەیامبەریان دایەوە ئەوانەیان کە ئاکاری چاکیان کردو، دوای پەیامبەر کەوتن و پارێزگاری سنوورەکانی خوا بوون، پاداشتێکی گەورەو فراوانیان بۆ هەیە، ئەو هاوەڵانەی وا خەڵکێک پێیگوتن: بێگومان ئەو خەڵکانە بۆ لەناوبردنی ئێوە هەموو کۆبوونەتەوەو، ئەیانەوێ گەلەکۆمەڵتان لێبکەن، ئەشێ بترسن و خۆتان تووش نەکەن، کەچی بەهەڕەشەکە بڕواو ورەیان بەهێزتر بوو و وتیان: ئێمە هەرخوامان بەسە، ئەویش چاکترین چاودێرو یارمەتیدەرە، ئینجا لە ئاکامی ئەوپشت بەستنەیان بەخواوەوە، بەبەخشش و نیعمەتێکی فراوانی خواوە گەڕانەوە مەدینە و تووشی هیچ ناخۆشیی و ناڕەحەتییەکیش نەبوون، لەو هەڕەشانە

دەیانکرد هەر لەڕەزامەندیی و خۆشنوودی خوا دەگەڕان، خواش خاوەنی بەخشش و بەهرەیەکی زۆر گەورەیە، دیارە ئەوە هەرەشەی شەیتانەو دەیەوێ ئێوە بەهاو دۆستانی خۆی بترسێنێت، جا ئەگەر باوەڕتان بەهێزە، لەوان مەترسن ، لەخۆم بترسن).

**پەرستشی پەرومردگار:**

جوانییەکی دیکەی مامەڵەی هاوەڵان لەگەڵ پەروەردگاریان پەرستشی دروستیان بوو بۆ پەروەردگاریان، ئەوان لە پەرستشدا بەوجۆرە خوایان دەپەرست کە لێیان داواکرابوو نەوەک بەو چەشنەی حەزی پێبکەن یان واقیع لێیان بخوازێت.

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ڕێنموونیکاریان بوو لەم پرسەدا، هەم وردەکاری پێدەدان، هەم بە باسکردنی پاداشت و دەستکەوتەکان و هەرەشەی کەمتەرخەمی هانی دەدان، هەم گەرمی دەکردن لەسەر پەرستش و دەستی دەگرتن بۆ گورجوگۆڵی لەو بابەتەدا.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک خوەیلەی کچی حەکیم هاتەژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بینی شێوەیەکی شپرز و شێواوی هەیە، بە عائیشەی فەرموو ئەوە بۆ وایە؟ عائیشە وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ژنە مێردی نیە، چونکە مێردەکەی بە ڕۆژ ڕۆژوو دەگرێت و بە شەویش شەونوێژ دەکات، دەستی لە خۆی شتووەو خۆی وێران کردووە،[1] پێغەمبەریش(ﷺ) ناردی بە شوێن عوثمانی کوڕی مەظعووندا ئەویش هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عوثمان پشتت کردوەتە سوننەتم؟) عوثمان وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (بەڵکو بە شوێن سوننەتی تۆدا هەنگاو دەنێم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فَإِنِّي أَنَامُ وَأُصَلِّي ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ ، وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ فَاتَّقِ اللهَ يَا عُثْمَانُ فَإِنَّ لِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا ، وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧٣٣، حسنه شعيب الأرناؤوط.

حَقًّا فَصُمْ وَأَفْطِرْ ، وَصَلِّ وَنَمْ)،[1] (دەی مـن دەخـەوم و نوێژیـش دەکـەم، ڕۆژوو دەگـرم و بەربانگیـش دەکەمـەوە، ژن بەهاوسـەر دەگـرم، دەی ئـەی عوثمـان لەخـوا بترسە، چونکە ژن و منداڵـت مافیان هەیـە بەسـەرتەوەو میوانت مافی هەیـە بەسـەرتەوەو جەستەشـت مافی هەیـە بەسـەرتەوە، دەی ڕۆژوو بگـرەو ڕۆژووش بشـکێنە، نوێـژ بکـەو بشـخەوە).

عەلـی کوڕی ئەبووطالیب دەگێڕێتـەوە کە شـەوێک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە دەرگای ماڵـی دان و ئـەو و فاطیمـەش لـە ماڵـەوە بـوون، پێـی فەرمـوون؟ (أَلَا تُصَلِّيَانِ؟)[2]، ئـەریٚ ئـەو دوانەتـان سـەرقاڵ نابـن بـە نوێژەوە؟

ئیبـن عومـەر دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خوا(ﷺ) جارێک لە ڕێی حەفصەوە ئامـۆژگاری کردووە بـۆ گرنگیـدان بـە شـەونوێژ و فەرموویەتـی (نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ)، (عەبدوڵا پیاوێکی زۆر باشە، بریا شەونوێژی هەبوایە)، ئیتر لەوەبـەدوا ئیبـن عومەر گرنگی بە شـەونوێژ دەدا.[3]

جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: لە غەزایەکدا بووین، شـەومان بەسـەردا هات و پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کەسـێک لـە کۆچـەران و یەکێک لە پشـتیوانانی راسـپارد پاسـەوانیی سـوپای موسـڵمانان بکـەن، سـەرەتا پشـتیوانییەکە پاسـەوانیی کرد و کۆچەرییەکـە خـەوت، پشـتیوانییەکە دەسـتی کـرد بـە نوێژکـردن، یەکێـک لـە دوژمنـان هـات، کـە بینیـی ئـەم هاوەڵـە لە نوێژدایـە، تیرێکی بۆ هاویشـت، تیرەکە بـەر پشـتیوانییەکە کـەوت، بـەڵام نوێژەکـەی نەبڕیـی و تیرەکـەی دەرکرد، کابـرا تیرێکـی تریشـی هاویشـت و هەمـدی پێـکای، هاوەڵەکـەش تیرەکـەی دەرکـرد و نوێژەکـەی نەبڕیـی، تیریـی سـێیەمیشـی بەرکـەوت و بـە هەمـان شـێوە نوێژەکـەی نەبڕیـی، کـە ویسـتی بچەمێتـەوە، هاوەڵـە پشـتیوانییەکە راچڵەکـی و کابـرای دوژمنیـش رایکـرد، کۆچەرییەکـە بـە هاوەڵـە پشـتیوانییەکەی وت:

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٩٤٩، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[2] صحيح البخاري - أبواب التهجد - باب تحريض النبي(ﷺ) على صلاة الليل والنوافل، الرقم ١١٢٧.

[3] صحيح البخاري - أبواب التهجد - باب فضل من تعار من الليل فصلى، الرقم ١١٥٧.

خۆزگە لەگەڵ ئەوەی تیرەکەت بەرکەوت، بێدارت بکردمایەتەوە، ئەویش وتی: لە سوورەتێکدا بووم، حەزم نەکرد بیبڕم هەتا تەواوی دەکەم، سوێند بەخوا، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە کە ترسم هەبوو سەنگەرێک بفەوتێنم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردوم بیپارێزم، هەتا گیانم دەرنەچوایە، ئەو نوێژەم نەدەبڕیی.[1]

هاوەڵان لە پەرستشە فەڕزەکاندا درێغییان نەدەکرد و ئامادەییان هەبوو، وەک ڕۆژوو و زەکات و حەج و پێنج نوێژەکە بەتایبەت ئەنجامدانی بە جەماعەت، لەو پەرستشە سوننەتانەیش کە بەرچاو بوون کێبڕکێیان دەکرد، جوانتر لەوانەش گرنگییەکی تایبەتیان دەدا بە پەرستشە نهێنییەکان کاتێک بە بەرچاوی خەڵکەوە نەبوون، واتە ساتەکانی تەنهاییان بۆ ڕازیکردنی پەروەردگاریان دەقۆستەوە نەوەک بۆ بەزاندنی سنوورەکانی خوا.

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، کتاب الطهارة، الرقم ٥٠٧ وصححه و وافقه الذهبي.

## پەیوەندی هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ)

هاوەڵان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوون و خوای گەورە هاوەڵێتی هەم جەستە و هەم فەرمایشت و پەیامەکەی سەروەری بە نسیب کردن و ئەوانیش بە تەواوی مانا قەدریان زانی، ئێمەش فەرمایشت و پەیامەکەیمان بۆ رەخسێنراوەو جێی خۆیەتی ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەین و پێی لێ دانەبڕین.

ئەوان هەوڵیان دەدا رۆژانە بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بگەن، ئەبووبەکری صدیق نەیدەتوانی رۆژێک بەسەر ژیانیدا تێپەڕێت و بە خزمەتی پێشەوامان نەگات، هێندە راستگۆیانە لە دەوری بوو، وەڵامی ئەو هۆگرییەی لە رەفتاری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەرگرت، وەک عائیشەی کچی ئەبووبەکر دەگێڕێتەوەو دەڵێت: هێشتا من تەواو عەقڵم نەگرتبوو کە دایک و باوکم باوەڕیان هێنابوو بە پێغەمبەر(ﷺ)، هەرچی رۆژێکیش هەبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیانی و ئێوارە سەردانی دەکردین.[1]

پشتیوانانیش بە هەمان شێوە، هەتا پێغەمبەرەکەیان لە مەککە بوو، وابەستەی پەیامەکەی بوون، کە تەشریفیشی هێنا بۆ شارەکەیان، یەکپارچە کات و دڵ و ژیانی خۆیان پەیوەست کرد بە پێشەواکەیانەوە، کێبڕکێیان بوو لەسەرئەوەی چۆن خزمەتی بکەن، چی بکەن دڵخۆشی بکەن، لە مزگەوت، بازاڕ، حەج و عومرە، جیهاد و غەزاکاندا، هاوەڵیی پێغەمبەری خوایان دەکرد و لە فەرمان و رێنماییەکانی دەرنەدەچوون:

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الصلاه، باب المسجد يكون في الطريق من غير ضرر بالناس و به، الرقم ٤٧٦.

یەکێکیان خۆی یەکلادەکردەوە بۆ بواری وەرگێڕان هەتا لەو ڕوانگەوە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات، نموونەی ئەوەش زەیدی کوڕی سابت بوو کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد خۆی فێری زمان و نووسینی جوولەکەکان بکات هەتا وەرگێڕانی گوفتار و نووسراوەکانیان بکات بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، زەیدیش هێندە خێرا چوو بە دەم فەرمایشتەکەیەوە هەتا لە ماوەی پانزە ڕۆژدا خۆی فێرکرد.[1]

هەیانبوو خۆی یەکلادەکردەوە بۆ وەرگرتنی فەرموودەکانی بواری فیتنە و ناڕەحەتییەکان کە دێنە ڕێی موسڵمانان، حوزەیفەی کوڕی یەمان سەرمەشقی ئەو بوارەیە، وەک خۆی دەڵێت: (خەڵکی سەبارەت بە بواری چاکە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکرد، منیش سەبارەت بە خراپە و فیتنە پرسیارم لێ دەکرد).[2]

عەبدوڵای کوڕی مەسعوود کە یەکێک بوو لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان، هێندە وابەستەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، خۆی دەڵێت: سوێند بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە جگە لەو، هەر سوورەتێک لە قورئاندا هەیە، ئەزانم کەی دابەزیوە و لەسەر چی دابەزیوە،[3] پێغەمبەری خوایش(ﷺ) شایەتی دەدا بۆ شارەزایی ئیبن مەسعوود لە قورئاندا و دەیفەرموو (اسْتَقْرِئُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ: مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَبَدَأَ بِهِ)،[4] (بۆ فێربوونی خوێندنەوەی قورئان، گوێ لە چوار کەس بگرن، عەبدوڵای کوڕی مەسعوود، واتە پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم ناوی ناو چوار کەسەکە بەو دەستی پێکرد)،

هاوەڵی وایش هەبوو ئەگەر بۆی نەگونجایە زۆر لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بێت، کاتی تایبەتی بۆ تەرخان دەکرد و سەرجەم ئیشوکارەکانی تری لەگەڵ ئەو کات و دەرفەتەدا دەگونجاند، نەوەک ئیشوکارەکانی دەست پێ بکات و هەرکات

[1] سنن أبي داود، كتاب العلم، باب رواية حديث أهل الكتاب، الرقم ٣٦٤٢.
[2] السنن الكبرى للنسائي، كتاب فضائل القرآن، الأمر بتعلم القرآن، الرقم ٧٩٧٨.
[3] صحيح مسلم، كتاب فضائل الصحابة، الرقم ٢٤٦٣.
[4] صحيح البخاري، كتاب فضائل الصحابة، الرقم ٣٧٥٨.

لێبوویەوە، ئینجا بچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وەک چۆن عومەری کوڕی خەططاب دەگێڕێتەوەو دەڵێت: من و دراوسێیەکی پشتیوانیم کە ماڵمان لە سەرووی مەدینەوە بوو، کردبوومان بە سەرە، هەر ڕۆژەو یەکێکمان دادەبەزین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ڕۆژێک ئەو و ڕۆژەکەی تریش من، ئەو ڕۆژەی من بچوومایە، هەرچی وەحییەک دابەزیایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خۆم دەمهێنایەوە بۆ دراوسێ پشتیوانییەکەم، ئەو ڕۆژەش کە ئەو دەچوو، هەر وایدەکرد.[1]

هاوەڵانێکیش کە درەنگ کەوتن لە گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، هەوڵیان دەدا قەرەبووی ماوەی لەدەستچوویان بکەنەوە، جوانترین نموونەش لەنێویاندا ئەبووهورەیرە بوو، چونکە ئەم هاوەڵە چوار ساڵ پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە و لە خزمەت پێشەواماندا مایەوە، هەوڵیدا قەرەبووی ساڵانی لەدەستچووی بکاتەوەو بە شەو و ڕۆژ خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ هاوەڵێتی خۆشەویستمان و وەرگرتنی فەرموودەکانی، وەک خۆی دەڵێت: من کەسێکی هەژاری ناو ئەهلی صوففە بووم کە دایم هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بووم.[2]

ئافرەتانیش هەوڵیان دەدا پێ لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانەبڕن و کاتێکی تایبەتی لێ وەربگرن بۆ خۆیان، وەک چۆن ئەبووسەعید دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیاوان فەرمایشتەکانت دەبیستن و دەرفەتیان زۆرە گوێت لێ بگرن، دەی بەشێک لە کاتەکەشت بدە بە ئێمە و ڕۆژێکمان بۆ دابنێ هەتا بێینە خزمەتت و ئەوەی پەروەردگار فێری کردویت، فێرمان بکەیت، ئەوەبوو پێغەمبەریش(ﷺ) کاتێکی بۆ تەرخان کردن.[3]

هاوەڵە مێردمنداڵ و کەمتەمەنەکانیش بە هەمان شێوە، زۆر هەوڵیان دەدا

---

[1] صحيح البخاري، تاب العلم، باب التناوب في العلم، الرقم ٨٩.

[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٩٥و صححه الذهبي.

[3] صحيح البخاري، كتاب الإعتصام بالكتاب والسنة، باب تعليم النبي أمته من الرجال و النساء، الرقم ٧٣١٠.

بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە زۆر لە مەیدانی جیهاددا دەیگێڕانەوە و نەیدەهێشت لەبەر کەمی تەمەنیان بەشداریی بکەن، لە کاتی ئاساییشدا، لە دەوری بوون و فەرموودەیان لێوە وەردەگرت، بۆیە دەبینیت زۆرترین فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن ئەو هاوەڵانەوە گێڕدراونەتەوە کە لە سەردەمی سەروەرماندا لە هەرەتی مێردمنداڵی و لاوێتیدا بوون.

خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەری خوا:

هاوەڵان خۆشەویستیەکی بێپایانیان بۆ پێغەمبەری خوا هەبوو، خۆشەویستیەک کە ئادەمیزاد زۆرجار بۆ خودی خۆیشی نیەتی، ئەوان ئەوکات خۆشحاڵ بوون کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشحاڵ بوایە، بێتاقەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبوویە هۆکار بۆ خەم و خەفەتی ئەوان، بیریان لای ئەوەبوو نەک تەنها لە دنیادا، بەڵکو چۆن لە قیامەتیشدا لە تەنیشت پێغەمبەرەوە(ﷺ) بن.

پرسیار کرا لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب سەبارەت بە خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەری خوا، ئەویش وەڵامی دایەوە (بەخوا لە خۆمان و ماڵ و سامان و ژن و منداڵ و دایک و باوکمان لەلامان خۆشەویستتر بوو، خۆشەویستیەک زیاتر لە خۆشەویستی کەسێکی تینوو بۆ ئاوێکی سارد).[1]

خانووەکەی ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری دوو قات بوو، کاتێک خۆشەویستمان هیجرەتی کرد بۆ مەدینە و بڕیاریدا لە ماڵی ئەو بمێنێتەوە، ئەبوو ئەیووب پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە قاتی یەکەم داناو خۆی و خێزانی چوونە قاتی سەرەوە، جارێک بڕێک ئاو لە ژوورەکەیاندا ڕژا، خێرا هەستان و بە بەرگ و ڕاخەرێک کە هەیانبوو ئاوەکەیان هەڵدەمژیەوە، بەڵام هەر کەمێک لە ئاوەکە داچۆڕایە خوارەوە، بۆیە ئەبوو ئەیووب چوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شیاو نیە ئێمە لە سەرەوە بین و تۆ لە خوارەوە بیت، دەبێت جەنابتان بچنە سەرەوە، پێم خۆش نیە بەسەر جەنابتانا بچمە سەرەوەو ئێوە لە خوارەوە

[1] القاضي عياض بن موسى اليحصبي: الشفا بتعريف المصطفى، دار الفكر، سنة ١٩٨٨م، ج٢، ص ٢٢.

بن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوارەوە بۆ من ئاسوودەترە، ئەبوو ئەیووبیش وتی قەت ناچمە قاتی سەرەوە جەنابتان لە خوارەوە بن، ئیتر ئەبوو ئەیووب چوویە خوارەوە، زۆر جار خواردنی ئامادە دەکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و بۆی دەبرد، کاتێک بۆی دەگێڕایەوە ئەبوو ئەیووب تەماشای دەکرد بزانێت پێغەمبەر(ﷺ) لە کوێدا پەنجەی داناوە بۆ ئەوەی لەو بەشە بخوات.[1]

ئەبوو ئەیووب دەڵێت: کە خواردنێک دەهێنرا بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، لێی دەخوارد و زیادەکەی دەنارد بۆ ئێمە، ڕۆژێک خواردنێکی بۆ هاتبوو هەمووی ناردبوو و هیچی لێ نەخواردبوو، چونکە سیری تێدا بوو، منیش وتم ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ حەرامە؟ فەرمووی: (لا ولكني أكرهه من أجل ريحه)، (نا، بەڵام من لەبەر بۆنەکەی رقم لێیەتی)، ئەبوو ئەیووبیش وتی دەی منیش حەز بە شتێک ناکەم کە تۆ حەزی پێ نەکەیت.[2]

ئەنەسی کوڕی مالیکیش دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووم بۆ خوانێک، نان و شلەیەک خرایە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) کە کوولەکەی تێدابوو، پێغەمبەریش(ﷺ) بەناو قاپەکەدا بەدوای کوولەکەکەدا دەگەڕا، ئیتر لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ حەزم لە کوولەکەیە.[3]

سولەیمانی تەمیمی دەڵێت: هەرکات وەرزی کوولەکە بوایە، هەرچی بچووینایە بۆ لای ئەنەس، سەیرمان دەکرد شلەکەی کوولەکەی تێدابوو.[4]

ئەوەش نەبوو خۆی زۆر حەزی پێ کردبێت، بەڵکو لە خۆشەویستی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بووە، جارێک ئەنەس کوولەکەی دەخوارد و دەیوت: چ بەرێکیت! تەنها لەبەرئەوە حەزم لێتە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لێت بوو.[5]

---

[1] مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٢٨٩٠، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب إباحة أكل الثوم، الرقم ٢٠٥٣.

[3] صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب ذكر الخياط، الرقم ٢٠٩٢.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٣٥٦٣.

[5] جامع الترمذي - أبواب الأطعمة عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في أكل الدباء، الرقم ١٩٧٨.

ڕۆژێک ئەنەس داوایەکی لە پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو، خۆی دەڵێت: داوام لێکرد لە قیامەتدا شەفاعەتم بۆ بکات، فەرمووی: دەیکەم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جا لە ڕۆژی دواییدا لە کوێ بتدۆزمەوە؟ فەرمووی: یەکەمجار کە بۆم گەڕایت لای صیراط بۆم بگەڕێ، منیش وتم: ئەی ئەگەر لەوێ نەمبینیت؟ فەرمووی: دەی لای میزانم، وتم: ئەی ئەگەر لەوێیش نەمبینیت؟ فەرمووی: دەی لای حەوزم، لە ڕۆژی دواییدا لەو سێ شوێنە تێناپەڕم.[1]

دوای وەفاتی خۆشەویستمان(ﷺ)، زۆر جار ئەنەسی کوڕی مالیک خەوی پێوە دەبینی، تەنانەت دەیوت: چی شەو هەیە خەو دەبینم بە خۆشەویستمەوە، پاشان دەستی دەکرد بە گریان،[2] چونکە تەواو تاسەی ئەوەی هەبوو بگاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).

ئەنەس دەیوت: هیوام وایە لە ڕۆژی دواییدا بگەم بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێی بڵێم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە خزمەتکارە بچکۆلەکەی خۆتە.[3]

بڕوانە دیمەنی خۆشەویستی و توانەوەی هاوەڵان بۆ پێشەواکەیان لەو ساتەی گەرمەی جەنگ و ناڕەحەتییە، زەیدی کوڕی سەهل (ئەبووطەلحەی ئەنصاری) لە غەزاکەدا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) تیری دەهاویشت، پێغەمبەریش(ﷺ) لە دوایەوە بوو و قەڵغانی بۆ گرتبوو، کاتێک تیرێکی دەهاویشت پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرز دەکردەوەو تەماشای دەکرد بزانێت تیرەکە کوێی گرتووە، زەیدیش سەرسنگی خۆی بەرز دەکردەوەو دەیوت: ئابەوجۆرە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی بەدایک و باوکمەوە بەقوربانت بم، تیرت بەرنەکەوێت، سنگم دەکەمە قەڵغان بۆت، ئەی پێغەمبەر(ﷺ) من زۆر جیڕو بەهێزم، چی ئیشێکت هەبوو فەرمانم پێ بکە.[4]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٠٣٢٢، جامع الترمذي - أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في شأن الصراط، الرقم و قال حسن غريب، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٣.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٣٥٢١، صححه شعيب الأرناؤوط.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٤٢٧٤، صححه شعيب الارناؤوط.

سەعدی کوڕی رەبیع لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و لەو غەزایەشدا شەهید بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی دەفەرموو (کێ هەواڵی سەعدی کوڕی رەبیعم بۆ دێنێت؟) کابرایەک هەستا و وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەنێو کوژراوەکاندا دەگەڕا تا پێی گەیشت، هێشتا سەعد تەواو گیانی دەرنەچووبوو، سەعد بە کابرای وت: چیتە وا دەگەڕێیت؟ وتی: پێغەمبەر(ﷺ) منی نارد تا هەواڵی تۆی بۆ بەرم، سەعد وتی: دەی بڕۆ بۆ لای و سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ لە دوانزە لاوە پێکراوم و پێکانەکەشم کوشندەیە، بە هۆزەکەشت بڵێ لای خوا هیچ بیانوویەکیان بۆ نیە ئەگەر بێتو پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکوژرێت و تاکە کەسێک لەوان زیندوو مابێت.[1]

عەوفی کوڕی مالیک دەڵێت: لە غەزای تەبووکدا چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ناو گومەزیەکی لەپێستە دروستکراودا بوو، فەرمووی: (اعدد ستا بين يدي الساعة: موتي..)،[2] (شەش شت بژمێرە کە پێش قیامەت دێن: مەرگی من، ..) جا کاتێک فەرمووی: مەرگی من، مات کەوتم و دڵم داگیرا،[3] گریانێک دایگرتم خەریکبوو بدەمە پرمەی گریان، پێغەمبەر(ﷺ) هێوری دەکردمەوەو بێدەنگی دەکردم،[4] ئینجا فەرمووی: بڵێ یەک، منیش وتم: یەک، دواتر ئەوانی تریشی بۆ باسکردم.[5]

عائیشەی دایکی باوەڕداران و کچی ئەبووبەکری صدیق دەگێڕێتەوە کە باوکی لەدوایین رۆژی ژیانیدا پرسیاری کرد: ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟ وتمان: دووشەممەیە، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لە چ رۆژێکدا وەفاتی کرد؟ وتمان: دووشەممە، وتی: هیوام وایە نەگەمە شەو.[6]

[1] موطأ الإمام مالک - كتاب الجهاد - الترغيب في الجهاد، الرقم ٤٥٤.
[2] صحيح البخاري - كتاب الجزية - باب ما يحذر من الغدر، الرقم ٣١٧٦.
[3] سنن ابن ماجه - أبواب الفتن - باب أشراط الساعة، الرقم ٤٠٤٢.
[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث عوف بن مالک الأشجعي الأنصاري(ﷺ)، الرقم ٢٤٦١٨، صححه شعيب الأرناؤوط.
[5] سنن ابن ماجه - أبواب الفتن - باب أشراط الساعة، الرقم ٤٠٤٢؛ صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني.
[6] أبوالسعادات ابن الأثير الجزري: المختار من مناقب الأخيار، تح: مأمون الصاغرجي و آخرون، ط١، دار

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەیوت: هۆکاری مردنی ئەبووبەکری صدیق خەفەت و پەژارەی بوو بۆ لەدەستدانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیتر بەردەوام جەستەی لاواز دەبوو هەتا وەفاتی کرد.[1]

ئەدەبیان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا:

رێزی هاوەڵان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە وردو درشتی ژیانیاندا رەنگی دابوویەوە، ئەوەی کەم کەس لە مەیدانی رێزدا بیری لێدەکاتەوە، ئەوان سەراپا بەجێیان دەگەیاند، ئەمەش چەند نموونەیەک:

پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە عومرەی جیعرانە، بۆ حەج ئەبووبەکری صدیقی کرد بە ئەمیری حەجەکە و خۆی نەچوو و لە مەدینە مایەوە، ئەبووبەکر و موسڵمانان لەنێو گەرمەی رێوڕەسمەکانی حەجدا بوون، کتوپڕ ئەبووبەکر وەستا لە تەکبیر کردن (وتنی الله أکبر)، هۆکارەکەش ئەوەبوو گوێی لە دەنگی وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لەکاتێکدا بە بیری کەسدا نەدەهات ئەوە دەنگی وشتری پێغەمبەر(ﷺ) بێت بەو پێیەی لە مەدینە بوو و نەهاتبوو بۆ حەج، ئەبووبەکر هێندە تێکەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە دەنگی وشترەکەشی دەناسییەوە، خێرا وەستا و وتی: لەوانەیە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی هاتبێت، با بوەستین و لەگەڵ ئەودا نوێژ بکەین، کەچی دواتر تەماشای کرد عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەسەر وشترەکەوەیە و وەک نوێنەری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خوێندنەوەی پەیامێک هاتووە،[2] ئەبووبەکری صدیق بە دەنگی وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەوەستا و پێش نەدەکەوت، ئێمەی موسڵمانی ئەم سەردەمەش بە دەقی ئایەتەکانیش ناوەستین و بێشەرمانە پێش خواو و پێغەمبەرەکەی دەکەوین.

---

ابن کثیر، دمشق، ٢٠٢١م، ج١، ص ٣٣.

[1] ابن عساکر: تاریخ مدینة دمشق، ج٣٠، ص ٤٠٨.

[2] سنن النسائي - کتاب مناسک الحج - باب الخطبة قبل یوم الترویة، الرقم ٢٩٩٣، صحیح ابن حبان - کتاب التاریخ - باب إخباره(ﷺ) عما یکون في أمته من الفتن والحوادث - ذکر وصف قراءة علي(ﷺ) سورة براءة علی الناس، الرقم ٦٦٤٥.

ئوسامەی کوڕی شەریک دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵانیشی لە دەوری بوون، هێندە بێدەنگ و بێجووڵە بوون دەتوت باڵندە بەسەر سەریانەوە نیشتۆتەوە.[1]

عەمری کوڕی عاص دەڵێت: هیچ کەسێک نەبوو هێندەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەلام خۆشەویست بێت و بە چاوی ڕێز و گەورەییەوە تەماشای بکەم، تەنانەت بەهۆی ئەو گەورە تەماشاکردنەوە نەمئەتوانی تێری چاوم تەماشای بکەم، ئێستایش پرسیارم لێبکرێت بۆ ئەوەی وەسفی بکەم ناتوانم چونکە تێری چاوم تەماشام نەکرد.[2]

حوذەیفەی کوڕی یەمان دەڵێت: ئێمە کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نانمان دەخوارد دەستمان نەدەبرد بۆ خواردنەکە تا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێدەکرد.[3]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: دەرگای ماڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە نینۆک تەقەیان لێدەدرا،[4] واتە هێندە ڕێزیان بۆ ئەو خۆشەویستە دادەنا، لە تەقەدان لە دەرگای ماڵەکەیشیدا ڕەنگی دابوویەوە.

جارێک پرسیار کرا لە عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ): ئەرێ تۆ گەورەتر بوویت یان پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ مەبەستیان لە ڕووی تەمەنەوە بوو، ئەویش بەم چەشنە وەڵامی دانەوە (ئەو لە من گەورەتر بوو و منیش لەپێش ئەو لەدایکبووم)،[5] واتە ئامادەیی نەبوو دەستەواژەی (من لەو گەورەترم) بەکاربهێنێت ئەگەرچی تەمەنی لەو زیاتر بوو، چونکە وشەی گەورەیی تێدابوو.

ئەم حاڵەتە تەنها لە کاتی ژیانیدا نەبوو، بەڵکو پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵان دەستیان گرتبوو بە هەمان ڕێز و ئەدەبیانەوە لە ئاست پێغەمبەری خوادا.

---

[1] سنن أبي داود - كتاب الطب - باب الرجل يتداوى، الرقم ٣٨٥٥.

[2] صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب كون الإسلام يهدم ما قبله وكذا الهجرة والحج، الرقم ١٢١.

[3] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب آداب الطعام والشراب وأحكامها، الرقم ٢٠١٧.

[4] المطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية - كتاب الأدب - باب الاستئذان، الرقم ٢٦٤٩.

[5] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الأدب - في الرجل يسأل أنت أكبر أم فلان ما يقول، الرقم ٢٦٧٨٠.

عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) چۆڕاوگەیەکی لەماڵەکەیدا هەبوو کە دەڕژا بەسەر کۆڵاندا، جارێک عومەری کوڕی خەططاب جلی تایبەتی ڕۆژی هەینی لەبەرکرد، عەبباسیش دوو مریشکی سەربڕیبوو، کاتێک عومەر بەوێدا تێپەڕی، خوێناوەکە بەر جلەکانی کەوت، ئەویش لەبەر بەرژەوەندی موسڵمانان بۆ ئەوەی لەو ڕێگەوە جلوبەرگیان پیس نەبێت، بڕیاریدا ئەو چۆڕاوگەیە لاببەن، عومەر ڕۆیشت و خۆی گۆڕی و گەڕایەوە، عەبباس هات بۆ لای و پێی وت: سوێند بەخوا ئەوەی لاتبرد پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لەوێدا داینابوو، عومەریش بە عەبباسی وت: دەی دەبێت بێیتە سەر پشتم و سەرکەویت و بیخەیتەوە هەمان ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیایدا دایتابوو، عەبباسیش بەگوێی کرد.[1]

وابەستەییان بە فەرمانی پێغەمبەرەوە:

وابەستەیی هاوەڵان بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نموونەیەکی باڵا بوو، چ لە ژیانی شەخسیی خۆیاندا، یان لەمامەڵەیان لەگەڵ دەوروبەر، لە ورد و درشتی جووڵە و بیرکردنەوەو مامەڵەیاندا، شوێنکەوتەییان بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بەرچاو بوو.

کاتێک حەفصەی کچی عومەر بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عوسمان، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوەیە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێک لە بێتاقەتی ڕوی تێکرد، ئەوەبوو پاش پێغەمبەر(ﷺ) داوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی، وتی: دڵت شتێک نەکات بەرامبەرم، من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە -ئەمەشم پێ نەوتیت- وتم با نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨١٥، حسنه شعيب الأرناؤوط.

نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر(ﷺ) حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.[1]

کەعبی کوڕی مالیک دەڵێت: جارێک داوای قەرزێکم کردەوە لە ئیبن ئەبی حەدرەد، لە مزگەوت بوو داوای قەرزەکەم کردەوە، ئیتر دەنگمان بەرزبوویەوە تا ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی خۆیەوە-کە لەپاڵ مزگەوت بوو- دەنگی بیستین، هاتە دەرەوەو فەرمووی: ئەی کەعب، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی: ئەوەندە لە قەرزەکەت وەربگرە، بە دەستی ئاماژەی دا کە نیوەی وەربگرمەوە، منیش وتم: باشە وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

ئەبووسەعید دەڵێت: جارێک نەبوونی زۆری بۆ هێناین و دایکم منی نارد تا بچم لای پێغەمبەر(ﷺ) داوای شتی لێ بکەم، کە گەیشتمە خزمەتی فەرمووی: (مَنِ اسْتَغْنَى أَغْنَاهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ، وَمَنِ اسْتَعَفَّ أَعَفَّهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ، وَمَنِ اسْتَكْفَى كَفَاهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ، وَمَنْ سَأَلَ وَلَهُ قِيمَةُ أُوقِيَّةٍ فَقَدْ أَلْحَفَ)، (هەرکەس خۆی لە دەستی خەڵک بێباک بکات (چاوی لە دەستی خەڵک نەبێت) خوا دەوڵەمەندی دەکات، هەرکەس خۆی پاک ڕاگرێت خوا پاک و دوور لە دەستی خەڵک ڕایدەگرێت، هەرکەس هەوڵ بدات بەوە ڕازی بێت کە هەیەتی، خوا بەشی پێویستی پێ دەدات، هەرکەس بەهای ئۆقیەیەکی هەبێت و داوا بکات ئەوە زۆر لەسەر داواکردن چووە)، منیش کە ئەوەم بیست وتم: خۆ وشترەکەم زۆر باشترە لە ئۆقیەیەک، بۆیە گەڕامەوەو داوای هیچم لێ نەکرد.[3]

---

[1] مسند أبي يعلى الموصلي - مسند أبي بكر الصديق، الرقم ٦.

[2] صحيح البخاري - كتاب الصلاة - باب التقاضي والملازمة في المسجد، الرقم ٤٥٧؛ صحيح مسلم - كتاب البيوع - باب استحباب الوضع من الدين، الرقم ١٥٥٨؛ سنن أبي داود - كتاب القضاء - باب في الصلح، الرقم ٣٥٩٥.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند أبي سعيد الخدري(ﷺ)، الرقم ١١٢١٧؛ سنن النسائي - كتاب الزكاة - باب من الملحف، الرقم ٢٥٩٤، قال شعيب الارناؤوط إسناده قوي، قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي: حسن صحيح.

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (لَوْ تَرَكْنَا هَذَا الْبَابَ لِلنِّسَاءِ)، (خۆزگە ئەم دەرگایەی مزگەوتمان جێبهێشتایە بۆ ئافرەتان، واتە تایبەت بوایە بەوانەوە)، نافیع کە فەرموودەکەی لە ئیبن عومەرەوە گێڕاوەتەوە دەڵێت: ئیبن عومەر هەتا ئەو ڕۆژەی مرد لەو دەرگایەوە نەچوویە مزگەوت.[1]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەیگێڕێتەوە کابرایەک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فڵانەکەس دارخورمایەکی هەیە و منیش خەریکم دیوار بنیاد دەنێم پێی بفەرموو با ئەو دارخورمایەم بداتێ و منیش بتوانم دیوارەکەم بنێم، پێغەمبەر(ﷺ) بە کابرای فەرموو (أَعْطِهِ إِيَّاهَا بِنَخْلَةٍ فِي الجَنَّةِ) (بەرامبەر بە دارخورمایەک لە بەهەشتدا ئەو دارخورمایەی پێ بدە) کابرا رازی نەبوو، ئەوەبوو ئەبوودەحداح هات و بە کابرای وت: حەوشەکەی خۆمت پێ دەدەم لەبری ئەوە ئەو دارخورمایەم پێ بدە، کابراش رازی بوو، ئەبوودەحداح چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئەو دارخورمایەم بەرامبەر بە حەوشەکەم کڕی و دارخورماکە بدە بەو کابرای داوای لێکردیت، پێغەمبەریش(ﷺ) چەند جارێک فەرمووی (كَمْ مِنْ عَذْقٍ دَوَّاحٍ لِأَبِي الدَّحْدَاحِ فِي الجَنَّةِ)، (ئای چەند دارخورمای بەرز لە بەهەشتدا دانراون بۆ ئەبوودەحداح)، ئەبوودەحداح کە ئەوەی بیست چوویەوە بۆ لای ژنەکەی و پێی وت: ئوممودەحداح لە حەوشەکە وەرە دەرەوە، من ئەوم فرۆشتووە بەرامبەر بە دارخورمایەک لە بەهەشتدا، ژنەکەشی وتی: نرخێکی بە قازانجە.[2] دیارە دوای وەفاتی ئەبوودەحداحیش لە کاتی ئەسپەردەکردنیدا هەمدی پێغەمبەر(ﷺ) جەختی لەو بەڵێنە کردۆتەوە.

---

[1] سنن أبي داود – كتاب الصلاة – باب اعتزال النساء في المساجد عن الرجال، الرقم ٤٦٢.

[2] صحيح ابن حبان – كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم(ﷺ) أجمعين – ذكر عمرو بن العاص السهمي(ﷺ) – ذكر السبب الذي من أجله قال(ﷺ) هذا القول، الرقم ٧١٥٩.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی (مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللهَ قَرْضًا حَسَنًا) ئەبوودەحداح وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوای گەورە داوای قەرزمان لێ دەکات؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش وتی: دەستتم بدەرێ، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پێ دا، ئەویش وتی: دەی ئەوە من حەوشەکەمم بە قەرز بە پەروەردگارم دا، حەوشەکەشی شەش سەد دارخورمای تێدابوو.[١]

ئەبووبەکری صدیق لەگەڵ دەستبەکاربوونی وەک خەلیفەی موسڵمانان، بڕیاری دا سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید بەڕێ بکات و هیچ سەربازێکی ناو سوپاکەش لە مەدینە گل نەداتەوە،[٢] سوپایەک کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاڵای دابوویە دەستیان و بڕیاری دابوو بەڕێبکەون، بەرنامەی ئەبووبەکر لە هەنگاوەکانیدا، شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو نەوەک بیرکردنەوەی جیاوازی خۆی، وەک خۆی دەیوت (من شوێنکەوتەم نەک ئەوەی موبتەدیع بم)[٣].

زۆرێک لە موسڵمانان بە عومەری کوڕی خەططابیشەوە پێیان وابوو جارێ سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید بەڕێ نەکرێت، بیانووشیان بەدەستەوەبوو و پێیان وابوو ئەو سوپایە پێویستە بۆ مەیدانێکی گرنگتر بەکاربهێنرێت کە ئەویش پاراستنی مەدینە و بەرگرتنە بە هەڵگەڕاوەکان، دەیانوت پێغەمبەر(ﷺ) لە حاڵی سەلامەتی و بێ کێشەییدا بڕیاری ناردنی ئەو سوپایەی داوە و بارودۆخەکە وەک ئێستا نەبووە، بە واتایەکی تر، ئاسایشی ناوخۆ لەپێشترە لە ئاسایشی دەرەکی و ئەگەر پایتەخت لەدەست بچێت، چ بەهایەک دەمێنێتەوە بۆ سوپایەک کە نەیتوانیوە پایتەختەکەی خۆی بپارێزێت، بەڵام ئەبووبەکر کە لە هەموان زیاتر لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) مابوویەوەو شارەزا بوو بە بڕیار و ڕێنماییەکانی، ئامادە نەبوو دەستبەرداری

[١] سنن سعيد بن منصور - كتاب التفسير - باب تفسير سورة البقرة - قوله تعالى من ذا الذي يقرض الله قرضا حسنا فيضاعفه له أضعافا كثيرة، الرقم ٤١٧.

[٢] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٣٣٤.

[٣] ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٣، ص ١٣٦.

بنەمای شوێنکەوتەیی بێ و وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی خەڵکەکەی دایەوە (سوێند بەخوا سوپایەک هەڵناوەشێنمەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) پێکیهێناوە، تەنانەت ئەگەر حاڵ بگاتە ئەوەی باڵندە و ئاژەڵە دڕندەکانی دەوروبەری مەدینە بمانفڕێنن، ئەگەر سەگەکان قەپ بکەن بە قاچی دایکانی باوەڕداراندا و رایانکێشن، هەر دەبێ سوپاکەی ئوسامە بەڕێ بکەم).[1]

دوایین داواکاریی سوپاکە ئەوەبوو هیچ نەبێت با ئوسامەی کوڕی زەید لە سەرکردایەتی لاببات و کەسێکی بەتەمەنتر و شارەزاتر لە شوێنیدا دابنێت، ئەبووبەکر بەو داواکارییەش رازی نەبوو و وەڵامی بۆ عومەری کوڕی خەططابی نوێنەری سوپاکە ئەوەبوو (استعمله رسول الله وتأمرني أن أعزله؟!) (پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایناییێت و دەتەوێت من لایبەرم؟!).[2]

هاوەڵانیش کە زانییان مەسەلەکە پەیوەستە بە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) یەکدەست چوونە تەرەفی ئەبووبەکر و کەس قسەی نەما.

زەیدی کوڕی ئەرقەم باس لەوە دەکات کە ئەبووبەکری صدیق خزمەتکارێکی هەبوو، شەوێک خواردنێکی بۆ هێنا و ئەبووبەکریش زۆر برسی بوو و خواردی، خزمەتکارەکە پێی وت: هەموو شەوێک کە خواردنم بۆ دەهێنایت لێت دەپرسیم لەکوێ و چۆن هێناومە، کەچی ئەمشەو نەتپرسی؟ ئەویش وتی: برسێتی وایلێکردم، لەکوێ هێنات؟ ئەویش وتی: لە سەردەمی نەفامیدا دام بەلای خەڵکێکدا و روقییەم بۆ خوێندن و ئەوانیش بەڵێنیان پێدام، ئەمڕۆ کە دامەوە بەلایاندا بەڵێنەکەیان بردە سەر، ئەبووبەکر وتی: ئۆف بۆ تۆ، خۆ خەریک بوو لەناوم ببەیت، دەستی برد بۆ ناو قوڕگی و هەوڵیدا خۆی بڕشێنێتەوە، کەچی نەدەڕشایەوە، وتیان ئەوە تەنها بە ئاو دێتەوەدەرێ، ئەویش داوای ئاوی کرد، هێندە ئاوی خواردەوە

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٣٣٥.

[2] ابن الأثير: الكامل في التاريخ، ج٢، ص ١٩٥.

هەتا رشایەوە، پێی وترا: رەحمەتی خوات لێ بێت، هەموو ئائەمە لەپێناو پارووێەکدا؟ ئەویش وتی: ئەگەر بە دەرچوونی گیانیشم بهاتایەتە دەرەوە ئەمهێنایەوە چونکە من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (كل جسد نبت من سحت فالنار أولى به) منیش ترسام بەشێک لە جەستەم بەهۆی ئەم پاروووەوە گەشە بکات.[1]

ئەبووبەکری صدیق تەنانەت پابەندی قسەی هەر کەسێکی جێمتمانە دەبوو کە بەڵێنێکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بگێرایەوە، خێرا ئەبووبەکر بەڵێنەکەی بەجێدەگەیاند، نموونەش لەو بارەوە بەڵێنەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە جابیری کوڕی عەبدوڵا کە فەرمووی (لو قد جاء مال البحرين قد أعطيتك هكذا وهكذا وهكذا)، ئەوەبوو لە سەردەمی خۆیدا هیچ شتێک لە بەحرەینەوە نەهات، پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە بەحرەینەوە سامانێک هات، ئەبووبەکر هاواری کرد: کێ بەڵێنێک یان قەرزێکی لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەیە با بێت بۆ لامان، جابیریش چوو و وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵێنی ئەوە و ئەوەی پێدام، ئەبووبەکریش پێدا، جابیرکە ژماردی سەیری کرد پێنج سەدە، ئەبووبەکر وتی: دوو ئەوەندەی تر ببە.[2]

ئەبووبەکر بڕیارەکانی خۆی لەبەردەم فەرموودەیەکی پێغەمبەردا(ﷺ) دەگۆڕی، نەوەک بیانوو بهێنێتەوە بۆ راو بۆچوونی خۆی، تەنانەت دەستبەرداری حەزی خۆی دەبوو، کاتێک بڕیار وابوو جەنگی هەڵگەڕاوەکان بکرێت، ئەبووبەکری صدیق ویستی خودی خۆیشی بەشداری تێدا بکات، سوار ولاخەکەی بوو بە مەبەستی بەشداریی لە سوپاکەدا، خێرا عەلی کوڕی ئەبووطالیب رێی لێگرت و وتی: بۆ کوێ ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا؟ هەمان شتت پێ دەڵێم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە رۆژی ئوحوددا پێی فەرموویت (شم سيفك، ولا تفجعنا بنفسك)، بگەڕێرەوە نێو مەدینە، بەخوا ئەگەر

---

[1] ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الأمم والملوك، ج٤، ص ٦٢.

[2] البخاري: صحيح البخاري، ج٣، ص ٩٦.

تۆ لەدەست بدەین ئیتر جارێکی تر ئیسلام رێک ناخرێتەوە، ئەبووبەکریش دەستوبرد گەڕایەوە.[1]

ئەبووبەکری صدیق لە بەڕێکردنی کاروباری موسڵمانان‌دا یەکەمجار پشتی دەبەست بە دەقی قورئان، دواتر پەنای دەبردە بە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چ ئەوەی خۆی بیستبووی، یان ئەوەی موسڵمانان لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەیانگێڕایەوە، جارێک داپیرەیەک هات بۆ لای ئەبووبەکری صدیق و داوای میراتی دەکرد، ئەویش پێی وت: لە کتێبی خوادا شتێک لەوبارەوە شک نابەم، هیچیش نازانم لە سوننەتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەوبارەوە هاتبێت، بگەڕێرەوە با لەو خەڵکە بپرسم، ئەوەبوو پرسیاری لە خەڵکەکە کرد، موغیرەی کوڕی شوعبە وتی: من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووم کە شەش یەکی پێ دەدا، ئەبووبەکر وتی جگە لە خۆت شایەتی ترت هەیە بۆ ئەم فەرموودەیە؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری هەستا و هەمان شتی وت، ئەبووبەکریش چەشنی فەرموودەکە جووڵایەوە.[2]

وابەستەیی ئەبووبەکر تەنانەت لە سەردان و بەسەرکردنەوەکانیشیدا رەنگی دابوویەوە، حەزی دەکرد سەردانی ئەوانە بکات کە پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی دەکردن و خۆشی دەویستن، بۆیە لە ماوەی خیلافەتەکەیدا و لەنێو گەرمەی سەرقاڵبوونی بە پرسە گەورەکانی وەک پرسی هەڵگەڕاوەکان و فتووحاتدا سەردانی ئوممو‌ئەیمەنی بیرناچێتەوەو داوا لە عومەری کوڕی خەططاب دەکات پێکەوە سەردانی بکەن، هۆکارەکەشی یەک شتە (بچین سەردانی بکەین وەک چۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی دەکرد).[3]

عومەری کوڕی خەططاب لە زیلحولەیفە دوو رکات نوێژی کرد، واتە نوێژی کورت کردەوە، پێی وترا چۆن شتی وادەکەیت؟ ئەویش وتی: (من

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص ٤٤٦.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب الفرائض - باب ميراث الجدة، الرقم ٢٧٢٤.

[3] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أم أيمن(ﷺ)، الرقم ٢٤٥٤.

بەس بەو چەشنە دەکەم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیکرد).[1]

جارێک پرسیار کرا لە عومەری کوڕی خەططاب ئەگەر والیەکت بدات لە هاووڵاتییەک ئایا تۆڵەی لێ دەسێنیتەوە؟ ئەویش وتی: بەڵێ، سوێند بەوەی گیانی عومەری بەدەستە تۆڵەی لێ دەستێنمەوە، چۆن تۆڵەی لێ نەستێنمەوە لەکاتێکدا دەمدی پێغەمبەر(ﷺ) تۆڵەی لەخۆی دەستەندەوە؟![2]

شوێنکەوتەیی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن عومەری کوڕی خەططابەوە گەیشتبوویە ئاستێک ئەگەر لە مەسەلەیەکیشدا بە روونی نەیوتایە، دەوروبەرەکەی دەیانزانی بەتەمای چیە مادەم هەڵوێستی پێغەمبەریان(ﷺ) لە پرسێکی لەو چەشنەدا لا دیار بوایە، بۆیە ئیبن عومەر کاتێک لای عومەری باوکی بوو و ئەویش لە دوایین رۆژەکانی ژیانیدا بوو، ئەوەبوو لەلایەن کابراکی مەجووسییەوە لە نوێژدا بریندارکرابوو و بڕیار وابوو خەمی دوای خۆی بخوات و خەلیفەیەک دابنێت، پێیان وت: خەلیفەیەکمان بۆ دیاری بکە، ئەویش وتی: بە زیندوویی و مردوویيش کاروبارتان بگرمەدەست؟! خۆزگە سەربەسەر لێی دەدەرچووم، نە چاکە و نە خراپەیم لەسەر نەبوایە، ئەگەر کەسێک دوای خۆم دیاری بکەم ئەوە کەسی لە من باشتر وایکردووە (مەبەستی ئەبووبەکر بوو) ئەگەریش کەس بۆ دوای خۆم دیاری نەکەم ئەوە کەسی لە من باشتر وایکردووە (مەبەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، ئیبن عومەر دەڵێت: کە وای وت و باسی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد، ئیتر زانیم کەس بۆ دوای خۆی دیاری ناکات.[3]

جارێک ئەنەسی کوڕی مالیک لە سەردەمی والیەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە مەدینە چوو بۆ مزگەوت و لە دوای عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە نوێژی نەکرد، عومەر پێی وت: بۆچی واتکرد؟ ئەویش وتی: من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینیوە چۆن نوێژی دەکرد، هەرکات نوێژەکەت

---

[1] صحيح مسلم - كتاب صلاة المسافرين وقصرها - باب صلاة المسافرين وقصرها، الرقم ٦٩٢.

[2] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص ٦٦.

[3] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص ٧٢.

لەوەی ئەو بچێت ئەوە لە دواتەوە نوێژەکە ئەکەم، ئەگەرنا نوێژەکەی خۆم دەکەم و دەچمەوە بۆ ماڵەوە.[1]

دیارە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە وردی بەدوای ئەو بابەتەدا ڕۆیشتووەو شێوازی نوێژی پێغەمبەری خوای(ﷺ) وەرگرتووە، بۆیە دواتر ئەنەس وەسفی نوێژی عومەری دەکرد و دەویت: کەسم نەدیوە هێندەی ئەم پێشەوایەتان نوێژی لە نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) بچێت، جا عادەتی عومەر وابوو نوێژی درێژ نەدەکردەوە.[2]

**رادەربڕین بە ڕێزەوە**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی خۆی وا پەروەردە کردبوو کە هەردەم پێشنیار و بیرۆکە ببەخشن بە چواردەوریان، چ لەسەر ئاستی تاک و دەوروبەر، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگە و دەوڵەت، فێری دەکردن نە ترسیان هەبێت لە خستنەڕووی پێشنیارەکانیاندا، نە ڕژدیی و چرووکی بنوێنن، بۆیە لە چەندین بابەتی گرنگ و هەستیاردا دەبینین سەروەرمان بە هاوەڵانی و دەوروبەری دەفەرموو (أشيروا علي)، (ڕای خۆتانم پێ بڵێن)، بۆ نموونە:

لە غەزای بەدردا کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی بڕیار لەسەر دیلەکان بدات، هاوەڵانی کۆکردەوەو پێی فەرموون (أشيروا علي فيهم)، (ڕای خۆتانم لەبارەیانەوە پێ بڵێن).[3]

لە دەرچوونی حودەیبییەدا کاتێک سەروەرمان زانی قورەیش سوپایان کۆکردۆتەوەو بەتەمان ڕێی عومرەی لێ بگرن، بە هاوەڵانی فەرموو (أشيروا علي)، (ڕای خۆتانم پێ بڵێن، ئەوەبوو ئەبووبەکر پێی وابوو ئەمان دەستپێشخەریی بۆ جەنگ نەکەن، چونکە بۆ عومرە هاتون نەوەک بۆ جەنگ، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕاکەی پەسەند کرد.[4]

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٦٨٠.
[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٦٠٣.
[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٠٢٨٩.
[4] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب الموادعة والمهادنة - ذكر ما يستحب للإمام استعمال المهادنة

لە ڕووداوی ئیفکدا کە بوختان بۆ دایکە عائیشە کرا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد.[1]

تەنانەت هاوەڵان هێندە دەرگای پێشنیاریان بەڕوودا واڵا کرابوو، پێشنیاری خێزانییان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، بۆ نموونە:

جارێک عومەری کوڕی خەططاب پێشنیاری کرد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمان بە خێزانەکانی بکات حیجاب بەکاربهێنن، مەبەست ئەوەبوو لەودیو پەردەوە میوانداریی میوانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەن و ڕووبەڕوو تێکەڵ بە میوانەکان نەبن، بیانوویشی بۆ ئەو پێشنیارەی ئەوەبوو کە هەمەچەشنەی خەڵک سەردانی ماڵی خۆشەویستی دەکرد، ئەوەبوو خوای گەورە پشتڕاستی ئەو پێشنیارەی عومەری کردەوەو ئایەتی حیجاب دابەزی.[2]

خێزانەکانیشی بە پێچەوانەوە پێشنیاریان دەبوو لە بارودۆخی موسڵماناندا، بۆ نموونە ئوممو سەلەمە لە ڕێککەوتنی حودەیبییەدا کە کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵانی دا قوربانیەکەیان بکەن و سەریان بتاشن، کەس هەڵنەسا و جێبەجێی نەکرد، چونکە زۆر بێتاقەت بوون لە ڕێککەوتنەکە و بە شکستیان دەزانی، ئوممو سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بڕۆرە دەرەوەو لەگەڵ هیچ کەس هیچ مەفەرموو، قوربانیەکەت سەرببڕە و سەرتاشەکەت بانگ بکە و سەرت بتاشە، خۆشەویستیش پێشنیارەکەی ئوممو سەلەمەی وەرگرت و وایکرد، هاوەڵان کە ئەو حاڵەتەیان بینی، هەموو نەوینە سەربڕینی قوربانیەکانیان.[3]

---

بينه وبين أعداء الله، الرقم ٤٨٧٢.

[1] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة النور - باب إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا، الرقم ٤٧٥٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة البقرة - باب واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى، الرقم ٤٤٨٣.

[3] صحيح البخاري - كتاب الشروط - باب الشروط في الجهاد، الرقم ٢٧٣١.

حاڵەتی پێشنیارکردنیش تایبەت نەبوو بە هاوەڵە زۆر نزیک و دیار و گەورەکان، بەڵکو زۆرێک لە هاوەڵانی تریش کە لەبەرچاوان نەبوون و ڕۆڵی کارایان نەبوو، پێشنیاریان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەخستەڕوو و پێشنیارەکەشیان زۆرجار جێی خۆی دەگرت و پەسەند دەکرا، بۆ نموونە:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژانی هەینی بۆ وتاردان لەپەنا دارخورمایەکەوە دەوەستا و وتاری دەفەرموو، یەکێک لە ئافرەتە پشتیوانییەکان پێشنیارێکی خستەڕوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی مینبەرێکت بۆ دروست نەکەین؟ سەروەریشمان ڕازی بوو، ئەوەبوو مینبەرێکی بۆ دروست کرا.[1]

ئەوەی جێی سەرنجە، هاوەڵان کاتێک پێشنیارێکیان دەخستەڕوو، بە ئەوپەڕی ڕێزەوە پێشنیاریان دەکرد، وەک بڵێیت پەیامێکیان پێیە و دەیانەوێت سوودێک بگەیەنن، نەوەک خۆیان بنوێنن، دەربڕینی پێشنیارەکانیان لە کاتی پێویستیشدا لەوپەڕی ڕێزەوە دادەڕێژران، بۆ نموونە:

لە غەزای بەدردا کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) شوێنی دابەزینی موسڵمانانی دەستنیشان کرد، یەکێک لە هاوەڵەکان بە ناوی حوبابی کوڕی مونزیر پێشنیارێکی هەبوو، بەڵام ڕاستەوخۆ دەرینەبڕی، بەڵکو بەم چەشنە دەستی پێکرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم شوێنەی کە تیایدا دابەزیوین بە فەرمانی خوایە و بۆمان نیە ئەملاولای تێدا بکەین، یان ڕاو بۆچوون و پلانی جەنگە؟ خۆشەویستمان فەرمووی (بَلْ هُوَ الرَّأْيُ وَالحَرْبُ وَالْمَكِيدَةُ)، (بەڵکو ڕاو بۆچوون و پلانی جەنگە)، حوباب ئینجا پێشنیارەکەی خۆی خستەڕوو و وتی: دەی ئەم شوێنە گونجاو نیە، ئەو خەڵکە ببەرە خوارووی ئاوەکەوە، ئینجا هەرچی ئاوی تر هەیە پڕیان بکەینەوەو خۆشمان لە خوارووی کۆتا ئاوەوە دابەزین و حەوزێکی لەسەر دروست بکەین و پڕی بکەین لە ئاو، ئەوکات جەنگی دوژمن بکەین، بەو چەشنە ئێمە ئاومان لەبەردەست دەبێت و ئەوانیش بێ ئاو دەبن،

[1] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٥٨٤.

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ڕاکەی پێ جوان بوو و پێی فەرموو (لقد أشرت بالرأي)،[1] (بەڕاستی ئاماژەت بە ڕاو پێشنیارێکی دروست دا).

کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش کرد، هەمووی بەخشیەوە بەسەر قورەیشیەکان و هۆزەکانی تردا و بەشی پشتیوانانی نەدا، ئیتر قسەو بۆڵەیەک لەناو پشتیوانانی دروست بوو تا ئەوەی یەکێک وتی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی بەخشیوە بە هۆزەکەی خۆی، سەعدی کوڕی عوبادە بڕیاری دا مەسەلەکە بباتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، چوویە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دەستەی پشتیوانان گلەییەک لە ناخیاندا دروست بووە بەرامبەر بەو دابەشکردنەت و دەڵێن هەموویت بەخشیوە بە هۆز و قەومەکەی خۆت و پشتیوانان هیچ پشکێکیان نەبووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەی سەعد ئەی تۆ لەو نێوەندەدا ڕات چۆنە؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) منیش ئەندامێکی قەومەکەمم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ قەومەکەتم بۆ کۆبکەرەوە، سەعد چوو و پشتیوانانی کۆکردەوە، هەندێک لە کۆچەران هاتن و هەموویانی گێڕایەوە، کاتێک هەموو پشتیوانان کۆبوونەوە سەعد هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت کە هەموو کۆبوونەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) چو بۆ لایان و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی:

(يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ مَا قَالَةٌ بَلَغَتْنِي عَنْكُمْ وَجِدَةٌ وَجَدْتُمُوهَا فِي أَنْفُسِكُمْ، أَلَمْ آتِكُمْ ضُلَّالًا فَهَدَاكُمُ اللهُ، وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ اللهُ، وَأَعْدَاءً فَأَلَّفَ اللهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ)

(ئەی گرۆی پشتیوانان وتەیەکم بیستووەتەوە لە ئێوەوە کە لە ناختاندا دروست بووە، مەگەر من هاتم بۆ لاتان گومڕا نەبوون و خوا ڕێنموونی کردن؟ مەگەر هەژار نەبوون و خوا دەوڵەمەندی کردن؟ مەگەر دوژمن نەبوون و خوا نێوانی دڵەکانی یەکخستن؟) وتیان با ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) منەت و فەزڵ بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ئەی گرۆی پشتیوانان ئایا وەڵامم نادەنەوە؟) وتیان چۆن

[1] ابن هشام: السيرة النبوية، شركة الطباعة الفنية المتحدة، ج٢، ص ١٩٢.

وەڵامت بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا فەزڵ و منەت بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی؟ فەرمووی:

(أَمَا وَاللهِ لَوْ شِئْتُمْ لَقُلْتُمْ فَلَصَدَقْتُمْ وَلَصُدِّقْتُمْ أَتَيْتَنَا مُكَذَّبًا فَصَدَّقْنَاكَ ، وَمَخْذُولاً فَنَصَرْنَاكَ ، وَطَرِيدًا فَآوَيْنَاكَ ، وَعَائِلاً فَآسَيْنَاكَ ، أَوَجَدْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ فِي لُعَاعَةٍ مِنَ الدُّنْيَا تَأَلَّفْتُ بِهَا قَوْمًا لِيُسْلِمُوا وَوَكَلْتُكُمْ إِلَى إِسْلاَمِكُمْ ، أَفَلاَ تَرْضَوْنَ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالْبَعِيرِ ، وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللهِ فِي رِحَالِكُمْ ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الْأَنْصَارِ ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ شِعْبًا وَسَلَكَتِ الْأَنْصَارُ شِعْبًا لَسَلَكْتُ شِعْبَ الْأَنْصَارِ ، اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْأَنْصَارَ وَأَبْنَاءَ الْأَنْصَارِ وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ)

(نا سوێند بەخوا ئەگەر بتانەوێت دەڵێن و ڕاست دەڵێن و بە ڕاستیش دەزانرێن، بڵێن تۆ هاتیت بۆ لامان بەدرۆخرابوویتەوەو ئێمە بەڕاستمان زانیت، پشتت بەردرابوو و ئێمە سەرمان خستیت، دەرکرابویت و ئێمە پەنامان دایت، بێناز بوویت و ئێمە دڵنەواییمان کردی، ئەی گرۆی پشتیوانان خەمی ناختان بۆ بڕێ پاشماوەی کەمی دنیایە کە بۆ دڵڕاکێشانی خەڵکێ بەکارم هێناوە تا موسڵمان بن و ئێوەشم ڕاسپاردووە بۆ ئیسلامەکەتان؟ ئەی گرۆی پشتیوانان ئایا ڕازی نابن خەڵکی بە مەڕ و وشترەوە بچنەوەو ئێوەش لە کاروانەکەتاندا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خۆتان ببەنەوە؟ سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر هیجرەت نەبوایە ئەوە من یەکێک دەبووم لە پشتیوانان، ئەگەر هەموو خەڵکی شیوێک بگرن و پشتیوانان شیوێکی تر بگرنەبەر، ئەوە من بە دڵنیاییەوە شیوەکەی پشتیوانان دەگرمەبەر، خوایە ڕەحم بکە بە پشتیوانان و منداڵانی پشتیوانان و منداڵەکانی منداڵانی پشتیوانان)، ئیتر هەموو پشتیوانان دەستیان کرد بە گریان تا ئەوەی ڕیشیان تەڕ بوو و دەیانوت ڕازین پێغەمبەری خوا(ﷺ) پشک و بەختمان بێت.[1]

ئەگەر گلەیی و گومانی ناو ناخی هاوەڵە پشتیوانییەکان، بە پەنهانی بمایەتەوەو نەگەیشتایە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سەروەریشمان ئەو

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٩٠٩، حسنه شعيب الأرناؤوط.

ڕوونکردنـەوەو نیەتـە چاکـەی خـۆی بەرامبـەر بـەوان نەخسـتایەتەڕوو، چاوەڕوان دەکرا چ ساردبوونەوەو بەدبینییەک بە دەستی شەیتان لە ناخی هاوەڵـە پشـتیوانییەکاندا چەکـەرەی بکردایـە؟

زۆرجـار بەنـاوی ڕێـز و شـەرمەوە، دەرفـەت دەدەیـن ئـەوەی لەناخماندایـە شـاراوە بێت بۆ کەسـێک کە پێویسـتە ئەو پەیامەی پێ بگات، ئەگەر پەیامەکەی پێ گەیشـت، لـە چەند ئەگەرێـک زیاتر تێپـەڕ نـاکات:

دان دەنێت بە ڕاستی پەیامەکەدا و هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێت.

ڕوونکردنـەوەت پێ دەدات و قەناعەتت پێ دێنێت کە دەکرێت لـەم دیوەی تریشـەوە تەماشـای بابەتەکە بکەیت.

یاخـی دەبێت و ئامادەیی نابێت دانـی پێدا بنێت و ڕق هەڵدەگرێت، یاخـود بە پێچەوانـەوە تـۆ هەڵوێستێکی وا هەڵدەگریت.

لـە حاڵەتـی یەکـەم و دووەمـدا هـەردوولا سـوودمەند دەبـن، لـە حاڵەتـی سێیەمیشـدا خەتـا و تاوانەکـە بـۆ ئـەو کەسـە دەگەڕێتـەوە کـە دان بـە حەقـدا نانێـت، هۆکارەکەشـی ئـەو هەمـوودە دڵناسـکییەیە کـە لەنێومانـدا هەیـە و زۆرجـار بووەتـە سـەرچاوەیەکی گـەورەی غەیبەتکردن، چونکە ئەگـەر ئـەوەی لەناخـی هەرکامماندا هەیە، بە دڵێکی سـاف و سـنگێکی فراوانـەوە بـە یەکدی بڵێیـن، دەرچەیـەک ناهێڵینـەوە بـۆ غەیبـەت و پاشـملە باسـکردنی یەکدی.

# پەیوەندی نێوان هاوەڵان

گرنگە مەسەلەی پەیوەندی نێوان هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بزانین، چونکە ئەوانە بەبەرچاوی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ئەزموونێکیان پێشکەش دەکرد کە وەک پەیام بۆیان هاتبوو، هەر هەڵە و نەپێکانێکیان هەبوایە، خێرا بۆیان راست دەکرایەوە، چونکە ئەوان مەرامیان دەرچوونی باڵا بوو لەو ئەزموونەدا نەوەک تێپەڕاندنی، بۆیە بە وردی هەوڵیاندەدا بە دروستی پەیڕەوی دەق و پەیامەکان بکەن، الله لەبارەیانەوە دەفەرموێت (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ)، (بێگومان خوا ڕازیبوو لە ئیماندارەکان کاتێک – لە ژێر ئەو درەختەدا پێی دەڵێن: (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت ئەی موحەممەد -ﷺ- جا خوا بەو ڕاستیی و وەفایەی لە دڵیاندا بوو بۆ پەیامەکەت ئاگاداربوو).

لێرەدا تەنها چەند نموونەیەک لەو پەیوەندییانەی نێوانیان وەردەگرین کە مەبەستمانە ئێمەی موسڵمان لێیان سوودمەند بین.

**ئیمان پێش خوێن:**

ئەمە بنەمایەکی گرنگی پەیوەندی نێوان هاوەڵان بوو، ئەوان لەسەر بنەمای ئیمان کۆبووبوونەوەو یەکتریان خۆشدەویست، بە جوانی لە پەیامی خوا تێگەیشتبوون (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ) (بەڕاستی هەر بڕوادارن برای یەکن).

بۆیە دەبینیت هاوەڵان پشتی یەکتریان دەگرت دژ بە نزیکە بێباوەڕەکانی خۆیان، ئەوان تەنانەت بەرامبەر بە باوک و برای بێباوەڕی خۆیان دەوەستان کاتێک دەبوونە دوژمنی پەیامی خوا و شوێنکەوتوانی، لەمەشدا شەرمیان نەدەکرد و راشکاوانە رایاندەگەیاند.

جارێک عومەری کوڕی خەططاب بە سەعیدی کوڕی عاصی وت: وای دەبینم شتێک لە ناختدا هەیە و پێت وایە من باوکی تۆم -لە بەدردا- کوشتووە، خۆ ئەگەر کوشتبێتم پۆزشت بۆ ناهێنمەوە، بەڵام من ئەوم نەکوشتووە، بەڵکو عاصی کوڕی هیشامی خاڵۆی خۆمم کوشت، باوکی تۆ بە دەستی عەلی ئامۆزای کوژرا،[1] سەعید لە ئاست کوژرانی باوکیدا بەم چەشنە وەڵامی عومەری دایەوە (خۆ ئەگەر تۆیش بتکوشتایە، بەدڵنیاییەوە تۆ لەسەر حەق بوویت و باوکم ناحەق بوو).[2]

ئەم ڕووداوەو هاوشێوەکانی لە نێو ژیانی هاوەڵاندا بەرەنجامی ژیان و وابەستەبوونە بەو دەقانەی قورئانی پیرۆزەوە کە ئاڕاستەی موسڵمانان دەکات بۆ مەسەلەی وەلائو بەڕاء، لەوانەش:

(لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)، (هیچ کۆمەڵێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژەکەی تر ببێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن دژایەتی خواو پەیامبەرەکەی دەکەن! هەر چەندە ئەوانە باوکیان، یان کوڕو نەوەیان، یا براو عەشرەتیان بن، ئەوانە – کە لە دۆستایەتی دوژمنانی خوا خۆ دەپارێزن- کەسانێکن خوا ئیمان و باوەڕی لە نێو دڵیاندا چەسپاندووە و پشتگیری کردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە و لە پاشە ڕۆژیشدا ئەیانباتە نێو چەند باخاتێکی بەهەشتەوە کە جۆگە ئاوی زۆر لە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات بە هەتا هەتاییش تێیدا دەبن خوا لێیان خۆشنوودو ڕازیی بووە، ئەوانیش لە خوا ڕازیی بوون ئا ئەوانە گرووپەکەی خوان ئاگادارو هۆشیارین، کە هەر گرووپەکەی خوان بەرەوەکان لە دونیاو، لە قیامەتدا).

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٥، ص ١٤٤.

[2] ابن الأثير: أسد الغابة، ج٢، ص ٤٨١.

(لَا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ)، (نابێ بڕواداران جگە لە بڕواداران کەس بگرن بەدۆست و بەیارمەتیدەروو پشت و پەنای خۆیان هەرکەسێک لەفەرمانی خوا دەرچێ و کافران بکاتە دۆستی خۆی، ئەوە هیچ بەشێکی پەیوەندیی ئیمانیی بەخواوە نییە. مەگەر لێیان بترسن و بتانەوێ لەشەڕیان خۆ قوتار بکەن و خۆ بپارێزن، ئەوە لەوکاتەدا چاک وایە بە ڕەواڵەت دوژمنایەتیی و دژایەتی نەکرێن، خوای گەورە دەیەوێ ئێوە هەر لەزاتی خۆی بترسن و وشیاربن).

**خۆشەویستی و برایەتی**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بنەمای خۆشەویستی نێوان یەکدی ڕاهێنابوو، ئەم پەیامە لە قورئانەوە بە گوێی یەکەیەکەی هاوەڵاندا درابوو کە ئەوان برای یەکدین، پەیامی خوا کردوونی بە برا، (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا)، (بەتێکڕا گشتتان دەست بە ڕشتەی ئایینی خواو قورئانەکەیەوە بگرن و قەت لێی نەترازێن و کارێکیش مەکەن ببێتە هۆی پەرت بونتان و، دەرەنجامیش دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ، لێی ڕاوەستن و، تۆزتان بەحەوادا بچێت، نیعمەت و بەخششەکانی خوا وەبیر بێنن ئەودەمە کەئێوە –لە سەردەمی نەفامیدا– دژ بەیەکتر بوون، ئینجا خوای بەبەزەیی، هۆگریی و تەبایی خستە نێوان دڵەکانتانەوە ئەوجا ئێستا بەهۆی بەخشش و میهرەبانی خۆیەوە بوونە برا و کینەی چەندین ساڵە لەدڵتان دەرچوو).

هاوەڵان نموونەی یەکەم بوون لە پەیڕەوی ئەو برایەتیەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی بۆ ئاراستە کردووەو دەفەرموێت (مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى)،[1] (نموونەی بڕواداران بۆ یەکتر – لە بارەی خۆشەویستیی و میهرەبانییانەوە

[1] صحيح مسلم، كتاب البر والصلة والآداب – باب تراحم المؤمنين وتعاطفهم وتعاضدهم، الرقم ٢٥٨٦.

- وەکو یەک جەستەو لاشەن، دەبینی هەرکە ئەندامێکی لەشی دێتە ئێش، بەخێرایی ئەندامەکانی تری لاشەی (تا)و (شەونخونیی) دایدەگرێ و ئۆقرە بەخۆ ناگرن).

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت: جارێک لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دانیشتبووم کە کابرایەک هات و سەلامی لێکرد و دواتر ڕۆیشت، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، من لەبەرخوا ئەو کابرایەم زۆر خۆشدەوێت، فەرمووی (فَهَلْ أَعْلَمْتَهُ ذَاكَ)، ئەی ئەوەت پێ وتووە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی (فَأَعْلِمْ ذَاكَ أَخَاكَ)، (دەی ئەوە بە براکەت بڵێ)، منیش ڕۆیشتم و خۆم گەیاندە لای و سەلامم لێکرد و وتم: بەخوا لەبەرخوا زۆر خۆشم دەوێیت، ئەویش وتی: بەخوا منیش لەبەرخوا زۆرم خۆشدەوێیت، منیش پێم وت: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێ نەکردبام، ئەو خۆشەویستیەم بۆ دەرنەدەبڕیت. [1]

هەمان حاڵەت بۆ هاوەڵێکی دیکەش روویدا کە ئەویش ئەنەس بوو کاتێک لە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، خۆشەویستمان فەرمانی پێکرد بچێت بۆ لای ئەو کەسە و خۆشەویستی خۆی بۆ دەرببڕێت.[2]

بەڵکو خۆشەویستمان هاوەڵانی فێردەکرد کێبڕکێیان بێت لەسەر زیاتر خۆشویستنی یەکدی، بە چەشنێک هاوەڵێک هەوڵیدەدا ئەم زیاتر هاوەڵەکەی خۆش بوێت، ئەمەش رەنگدانەوەی ئەم فەرموودەیە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو و ئەوانیش بە ئێمەیان گەیاند (مَا تَحَابَّ رَجُلاَنِ فِي اللهِ تَعَالَى إِلاَّ كَانَ أَفْضَلُهُمَا أَشَدَّ حُبًّا لِصَاحِبِهِ)،[3] (هەرکات دوو کەس لەبەر

---

[1] صحيح ابن حبان، كتاب البر والإحسان - باب الصحبة والمجالسة - ذكر الاستحباب للمرء أن يعلم أخاه محبته إياه لله جل وعلا، الرقم ٥٦٩، قال الألباني حسن صحيح.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب البر والإحسان - باب الصحبة والمجالسة - ذكر الخبر المدحض قول من زعم أن هذا الخبر لا أصل له أصلا، الرقم ٥٧١، صححه الألباني.

[3] المستدرك على الصحيحين، كتاب البر والصلة - إذا أحب أحدكم أخاه فليعلمه إياه، الرقم ٧٤١٦ و صححه و وافقه الذهبي.

خوا یەکیان خۆش ویست، ئەوە چاکترینیان ئەوەیانە کە خۆشەویستی بۆ بەرامبەرەکەی زیاترە).

حاڵەتی خۆشەویستی نێوان هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەیشتە ئاستێک شەوان بە تاسەی یەکدییەوە رۆژیان دەکردەوە، وەک ئیبنولجەوزی باسی دەکات (عومەری کوڕی خەططاب جاری وا هەبوو لە درەنگانێکی شەودا بیری یەکێک لە براکانی دەکرد -مەبەستی برای دینیە- ئەیوت: ئای شەو چەندە درێژەت کێشا! هەرکە نوێژی بەیانی دەهات، دەچوو بۆ لای و دەستی دەکردە ملی).[1]

هاوەڵان وێرای ئەوەی خۆیان لەسەر بنەمای خۆشەویستی مامەڵەیان دەکرد، وەک چۆن دەستپەروەردەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون لە دروستکردنی خۆشەویستی لەسەر بنەمای ئیمان و نیشاندان و دەربڕینی ئەو خۆشەویستیەش بۆ یەکدی، بە هەمان شێوە خەڵکی چواردەوریان لەسەر ئەو حاڵەتە رادەهێنا، نموونەی ئەوەش بەسەرهاتەکەی ئەبوو سالمی جەیشانیە کە جارێک بە تایبەت چوو بۆ ماڵی ئەبووئومەییە، لەوێ نیەتی سەردانەکەی خۆی خستەڕوو و پێی وت: من لە ئەبووزەری غیفاریم بیست کە دەیوت لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (إِذَا أَحَبَّ أَحَدُكُمْ صَاحِبَهُ، فَلْيَأْتِهِ فِي مَنْزِلِهِ، فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ لِلهِ)، (ئەگەر یەکێکتان هاوەڵەکەی خۆی خۆشویست، ئەوە با بچێت بۆ ماڵەوە بۆ لای و هەواڵی ئەوەی پێ بدات لەبەرخوا خۆشی دەوێت)، جا منیش ئەوە ئێستا هاتوم بۆ ماڵەکەت هەتا ئەم خۆشەویستیەم دەربڕم بۆت.[2]

ئەبوو ئیدریسی خەولانیش بەسەرهاتێکی وردترمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: چوومە مزگەوتی حیمص و لە بازنەیەکدا دانیشتم کە سی و ئەوەندە هاوەڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) تێدابوو، فەرموودەیان دەگێڕایەوە، یەکێکیان

---

[1] التبصرة، الطبعة الأولى، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦م، ج٢، ص ٢٧٧.

[2] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٦٨٩.

دەستی دەکرد بە گێڕانەوەی فەرمووده و ئەوانی دی بێدەنگ دەبوون .. شەو کە چوومەوە ماڵەوە، شەوگارم لێ نەدەڕۆیشت، دەموت: لە بازنەیەکی ئاوادا دانیشتم کەچی هیچکامیانم نەناسی، بەیانی زوو چووم بۆ مزگەوت، دەبینم گەنجێکیان لای پایەیەکەوە دانیشتووە، لەلای دانیشتم و پێم وت: لەبەرخوا زۆر خۆشم دەوێیت، ئەویش وتی: توخوا تۆ لەبەر خوا منت خۆش دەوێت؟ وتم: ئەرێ بەخوا لەبەرخوا زۆرم خۆش دەوێیت، رایکێشامە پێشەوە هەتا ئەژنۆمان بەیەکەوە نووسا، بە تاسەوە هەمان پرسیاری لێکردمەوەو منیش هەمان وەڵامم دایەوە، ئینجا وتی: فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە؟ وتم: بەڵێ، وتی: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو (الْمُتَحَابُّونَ فِي اللهِ عَزَّ وَجَلَّ يُظِلُّهُمُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ بِظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ)، (ئەوانەی لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێت، لە رۆژی دواییدا خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی، رۆژێک کە هیچ سایە و سێبەرێک نیە سێبەری خۆی نەبێت)، لەو دەمەدا پیاوێک دای بە لاماندا، هەستام و چووم بۆ لای و وتم: ئەم کەسە فەرموودەیەکی وای بۆ گێڕامەوە، جەنابت شتی وات بیستووە؟ ئەویش وتی: ئەوەی بۆی گێڕاویتەتەوە حەقە، کە فەرموودەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: بەڵێ ئەوەم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستووە، لەوەش زیاترم بیستووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیگەیاندەوە لای الله کە فەرموویەتی (حَقَّتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ)، (خۆشەویستی من بەدیهاتووە بۆ ئەوانەی لەبەر من یەکتریان خۆش دەوێت) .. پێم وت: رەحمەتی خوات لێ بێت تۆ کێیت؟ وتی: من عوبادەی کوڕی صامتم، وتم: ئەی ئەو گەنجە کێیە؟ وتی: موعازی کوڕی جەبەل.[1]

**ئیسار**

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا کەسی موسڵمان وارادەهێنێت بیری لای خودگەرایی نەبێت و هەرچی دەستکەوتێک هەبێت تەنها بۆ خۆی

[1] شرح مشكل الآثار، الرقم ٤٤٧٧.

بوێت، بەڵکو بیری دەخاتەوە چواردەورەکەشی مافیان هەیە بەسەریەوە، ئەم حاڵەتە بە واجبی زەکات دەست پێدەکات هەتا دەگاتە ئیساری نێوان موسڵمانان.

خوای گەورە دەفەرموێت (لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون)، (هەرگیز ناگەنە هیچ پلەیەکی خێرو چاکە- تا لەو شتەی خۆتان خۆشتان دەوێ نەبەخشن لەرێی خوا).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی بەم چەشنە پەروەردە دەکرد (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)،[1] (ئیمانی هەرکامتان تەواو نیە تا ئەوەی چی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت).

خۆراهێنانی هاوەڵان لەسەر ئەم حاڵەتە گەیاندنیە ئاستێک کە خوای گەورە لە قورئاندا شایەتییان بۆ بدات (وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ)، (ئەو کەسانەی نیشتەجێی (دار الهجرة)و (دارالإيمان) ببوون، واتە: پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچەرییەکان، کۆچەرییەکانیان خۆش دەوێن و، بەشێک لە دارایی خۆیانیان دەدەنێ و دڵخۆشیان دەکەن و هیچ شتێکیان لە دڵدا نیە سەبارەت بەوەی بە کۆچەرییەکان درا، لە فەیئی بەنی نەزیر، لەگەڵ ئەوەیشدا کەسێک نەبوو پێیناخۆش و ئیساری کۆچەرییەکان دەکەن بەسەر خۆیاندا لە سەروەت و ساماندا، ئەگەرچی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێ و هەژاربن).

جارێک کابرایەک هات تا لە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) بمێنێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵەوە هیچی نەبوو، بۆیە بە هاوەڵانی فەرموو رەحمەت لەو کەسەی میوانداری ئەم کەسە دەکات، یەکێک لە پشتیوانان هەستاو وتی من، کابرای بردەو ماڵەوە، بە ژنەکەی وت رێزی میوانی پێغەمبەر(ﷺ) بگرە، ژنەکەی وتی تەنها خواردنی منداڵەکانمان هەیە، زەید

[1] صحيح البخاري - كتاب الإيمان - باب من الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه، الرقم ١٣.

وتی: دەی خواردنەکە ئامادە بکەو چراکە بکوژێنەرەوەو منداڵەکان بخەوێنە، ئەویش نانەکەی ئامادە کرد و منداڵەکانی خەواند و چوو دەستکاری چراکەی کرد بەو بیانووەی چاکی دەکات و کوژاندیەوە، بەوجۆرە وایان لە میوانەکە تێگەیاند کە ئەوانیش نان دەخۆن، بۆ بەیانی کە چوویەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، خۆشەویستمان فەرمووی: (قَدْ عَجِبَ اللهُ مِنْ صَنِيعِكُمَا بِضَيْفِكُمَا اللَّيْلَةَ).[1] (بەڕاستی خوا سەرسام بوو بەو کارەی ئەو دوانەتان لە ئاست میوانەکەی ئەمشەوتاندا ئەنجامتان دا).

نافیع دەڵێت: جارێک ئیبن عومەر نەخۆش کەوت، ئارەزووی ترێی کرد، (وەرز)یش سەرەتای پێگەیشتنی ترێ بوو، صەفییەی خێزانی درهەمێکی دا بە کەسێک و ئەویش چوو هێشوویەک ترێی هێنا، سواڵکەرێکیش کەوتە شوێن کابرا، کە ترێکەیان هێنا بۆ ئیبن عومەر، کابرای سواڵکەر لەولاوە داوای ترێکەی کرد، ئیبن عومەر وازی لە حەزی خۆی هێنا و وتی: بیدەن بەو، پێیان دا، ئینجا صەفییە درهەمێکی تری دا بە کابرا و چوو هێشوویەکی تری کڕی، کابرای سواڵکەر هەمدی کەوتەوە شوێنی کابرا هەتا گەیشتنە لای ئیبن عومەر و داوای ئەو هێشووەشی کرد، ئەویش وتی: بیدەن بەو، هێشووە ترێکەیان پێ دا، صەفییە هەواڵی نارد بۆ کابرای سواڵکەر و پێی وت: ئەمجارە بێیتەوە هەتا ماوی خێر لەدەستم نابینیت، ئینجا درهەمێکی تری نارد و هێشووە ترێیەکی تریان بۆ کڕی.[2]

لە خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا، جارێک خەلیفە چوارسەد دیناری دا بە مێردمنداڵێک و پێی وت: ئەوە ببە بۆ ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەڕاح و ماوەیەک لەلای بمێنەرەوە و بزانە چی بەم پارەیە دەکات، مێردمنداڵەکە بۆی برد و پێی وت: ئەمیری باوەڕداران پێت دەڵێت: ئەمە بۆ هەندێک پێویستیی خۆت بەکاربهێنە، ئەویش نزای خێری بۆ خەلیفە کرد،

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب إكرام الضيف وفضل إيثاره، الرقم ٢٠٥٤.

[2] السنن الكبرى للبيهقي، كتاب الزكاة، جماع أبواب صدقة التطوع، الرقم ٧٨٩٧.

کە پارەکەی وەرگرت، بە خزمەتکارەکەی خۆی وت: ئەم حەوتە ببە بۆ فڵانە کەس، ئەم پێنجەش بۆ فڵانەکەس، بەو چەشنە هەمووی بەخشیەوە، مێردمنداڵەکە گەڕایەوەو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، خەلیفە هەمان بڕی پێدا نارد بۆ موعازی کوڕی جەبەل و داوای لێکرد لای ئەویش بمێنێتەوە و بزانێت چی بە پارەکە دەکات، ئەویش چەشنی ئەبووعوبەیدە دەستی کرد بە بەخشینەوەی هەتا هیچی لێ نەهێشتەوە دوو دینار نەبێت، لەو کاتەدا ژنەکەی موعاز هاتە ئەمدیو و وتی: بەخوا ئێمەیش هەژارین، شتێک بۆ ئێمەش بهێڵەوە، موعازیش ئەو دوو دینارەی پێ دا، مێردمنداڵەکە گەڕایەوە بەسەرهاتەکەی بۆ عومەر گێڕایەوە، ئەویش زۆر دڵخۆش بوو بەو ئیسار و لەخۆبوردەییەی هاوەڵان و فەرمووی (ئەوانە برای یەکدین و دەڵێیت بەشێکن لە یەکتر).[1]

**خەمخۆری بۆ یەکدی:**

هاوەڵان سەرمەشقی ئەم ئوممەتە بوون بۆ خەمخۆری لە ئاست یەکدیدا، ئەوان بوون نموونەی برایەتیەکیان پێشکەش کرد کە لە مێژوودا سەرنجی چاو و دڵەکان بۆ لای خۆی رابکێشێت، دوو کەسی نەناس بە یەک تەنها لەسەر بنەمای ئیمان ببنە خۆشەویستترین کەسی یەک، یەکێکیان سەرمایەدار و ئەویش هیچ سەرمایەیەکی نەبێت، پێکەوە یەک گیرفانیان هەبێت و سەرمایەدارەکە نیوەی سەرمایەکەی خۆی بدات بەوی دی بێ ئەوەی دڵی گەرد بگرێت.

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هاوەڵە پشتیوانیەکان ماڵ و داهاتی خۆیان برابەش دەکرد لەگەڵ هاوەڵە کۆچەرییەکاندا، هاوەڵە پشتیوانیەکان بژاردەیەکیان خستە بەردەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتیان: دارخورماکانمان لەنێوان ئێمە و برا کۆچەرییەکانماندا دابەش بکە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕازی نەبوو، چونکە هاوەڵانی خۆی لەسەر

[1] تاريخ دمشق لابن عساكر، ج٥٨، ص ٤٣٦.

تەمبەڵی و مشەخۆریی فێر نەکردبوو، پشتیوانان لەمە تێگەیشتن و ئەمجار هەوڵیان دا هەلی کاریان بۆ بدۆزنەوە، بۆیە پێشنیاری دووەمیان کرد و وتیان: دەی لە ئیشوکاردا هاوکاریمان بکەن، ئێمەش لە بەرهەمدا بەشدارتان ئەکەین، ئینجا هاوەڵە کۆچەرییەکان بەم بڕاردەیان ڕازیی بوون.[1]

لەو کاتی برایەتیەدا، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە برای سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری، سەعد کەسێکی دەوڵەمەند بوو، بە عەبدوڕەحمانی وت: ماڵ و سامانەکەم لەگەڵ جەنابتا دەکەم بە دوو بەشەوەو نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆ من، ژنت بۆ دێنم، عەبدوڕەحمان هەڵوێستی برا پشتیوانییەکەی بەرز نرخاند و فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و خێزان و سامانتەوە، ڕێی بازاڕم نیشان بدەن، کە ڕێی نیشان درا، دەستی کرد بە ئیش و بە دەستبەتاڵیی دانەنیشت،[2] عەبدوڕەحمان هێندە دەوڵەمەند بوو هەتا بوو بە سەرمایەدارێکی گەورەی مەدینە، ئینجا بوو بە دەستبارێک بۆ خەڵکی ئەو شارە و یارمەتی دەدان و باری سەرشانی سووک دەکردن، وەک تەلحەی کوڕی دەڵێت: خەڵکی مەدینە سێ بەش بوون: بەشێکیان قەرزیان لە عەبدوڕەحمان وەردەگرت، بەشێکیان لەلایەن عەبدوڕەحمانەوە قەرزیان بۆ دەدرایەوە، خۆیشی یارمەتیی بەشێکیانی دەدا.[3]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا عەبدوڵای کوڕی حوذافە بەشداری هێرشێک بوو بۆ سەر ڕۆمەکان، بەڵام لە جەنگەکەدا بەدیل گیرا، ئینجا برا بۆ لای پاشاکەیان، وتیان ئەمە لە هاوەڵانی موحەممەدە، ئەویش وتی دەبێت بە مەسیحی و نیوەی سامانی خۆم بدەم بە تۆ؟ عەبدوڵا

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الحرث والمزارعة، باب إذا قال اكفني مؤونة النخل وغيره وتشركني في الثمر، الرقم ٢٣٢٥.

[2] صحيح البخاري، كتاب البيوع ، باب ما جاء في قول الله تعالى فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض، الرقم ٢٠٤٩.

[3] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ط الرسالة، ج١، ص ٨٨.

وتی ئەگەر چیت هەیە و چی موڵکی هەموو پاشایانی عەرەبە بیدەیت بە من، هێندەی چاوترووکانێ وازناهێنم لە ئایینەکەی موحەممەد، پاشاکە وتی دەی دەتکوژم، ئەویش وتی چی دەکەیت بیکە، ئەوەبوو فەرمانی کرد و لەخاچ درا، پاشان بە تیرهاوێژەکانی وت تیرەکە بدەن لە نزیکی جەستەی و مەیکوژن، زوو زوو پێی دەوت دەبیت بە مەسیحی؟ ئەویش ڕازی نەدەبوو، ئینجا لەسەر خاچەکە دایانگرت و مەنجەڵێکی گەورە ئاوی کوڵاویان هێنا، دوو دیلی موسڵمانانی بانگ کرد و هێنران، فەرمانی کردو یەکێکیان خرایە ناو مەنجەڵەکەوە، ئینجا بە عەبدوڵای وت: دەبیت بە مەسیحی؟ ئەویش وتی: نابم، هاوکات دەگریا، بە پاشا وترا ئەو گریا، بۆیە وایزانی ترساوە، وتی بۆچی دەگریت، عەبدوڵا وتی من یەک گیانم هەیە دەرچێ، خۆزگە هێندەی تاڵەکانی سەرم گیانم هەبوایەو هەموویان لەپێناو خوادا دەخرانە ناو ئاگر، پاشا وتی ئامادەیت سەرم ماچ بکەیت و ئازادت بکەم؟ عەبدوڵا وتی ئەگەر هەموو دیلەکان ئازاد بکەیت بەڵێ، پاشا وتی بەڵێ، ئەویش سەری ماچ کرد و دیلەکانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ لای عومەر و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد، خەلیفەش وتی ئەرکی سەرشانی هەر موسڵمانێکە سەری عەبدوڵا ماچ بکات و وا منیش خۆم دەست پێدەکەم، ئەوەبوو سەری عەبدوڵای ماچ کرد.[1]

**ڕێز و ئەدەب**

هاوەڵان لەنێوان خۆیاندا ڕێزی یەکدییان دەگرت، ئەوان فێرکرابوون:

ڕێزی گەورەتری خۆیان بگرن.

ڕێزی لەخۆیان کەمتەمەنتر بگرن، چونکە پێغەمبەرەکەیان دیبوو دەیدا بە لای منداڵاندا و سەلامی لێدەکردن.

ڕێزی کەسی زانا بگرن.

ڕێزی کەسانی بە فەزڵ و خاوەن پێشینە بگرن.

---

[1] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٤.

ڕێزی خاوەن پێداویستی تایبەت بگرن.

ئەم ڕێزگرتنەش هەم لە کردارییاندا ڕەنگی دابوویەوە، هەم لە گوفتاریشیاندا بەرجەستە بوو.

عومەری کوڕی خەططاب کە باسی ئەبووبەکری صدیقی دەکرد دەیوت: ئەبووبەکر گەورەمانە و گەورەی ئێمەشی ئازاد کرد، مەبەستی بیلالی کوڕی ڕەباح بوو کە کۆیلە بوو و ئەبووبەکر ئازادی کرد.[1]

ئیبنولحەنەفیە دەڵێت: بە باوکمم وت (عەلی کوڕی ئەبووطالیب) دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاکترین کەس کێ بوو؟ وتی: ئەبووبەکر، وتم: دواتر کێ؟ وتی: عومەر، ترسام بڵێم دواتر کێ و ئەویش بڵێت عوسمان، بۆیە وتم: ئینجا تۆ، ئەویش وتی: من تەنها یەکێکم لە موسڵمانان و هیچی تر.[2]

جارێک ئیبن عەبباس جڵەوی وڵاخەکەی زەیدی کوڕی سابتی گرت، زەید پێی وت: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەنار بگرەو شتی وا مەکە، ئەویش پێی وت: فەرمانمان پێکراوە بەرامبەر بە زانا و گەورەکانمان وابین، زەید پێی وت: ئادەی دەستم نیشان بدە، کە دەستی نیشاندا ، زەید دەستی ماچکرد، ئینجا وتی: فەرمانمان پێکراوە ئاوا بین لەگەڵ ئالوبەیتی پێغەمبەرماندا(ﷺ).[3]

جا کاتێک زەید وەفاتی کرد، ئەبووهوڕەیرە دەیوت: حیبری ئەم ئوممەتە مرد، بەڵکو خوای گەورە ئیبن عەبباس بکاتە شوێنگرەوەی.[4]

**ناکۆکی نێوانیان**

ناکۆکی نێوان هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هەبوو، بەڵام ناکۆکییەکە زۆر کەم بوو، هاوکات کۆی گرفت و سەرئێشەکان دەبرانەوە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش چارەسەری دەکردن، واتە هاوەڵان نیەتی

[1] صحيح البخاري – كتاب فضائل الصحابة – باب مناقب بلال بن رباح، الرقم ٣٧٥٤.
[2] ابن الجوزي: صفة الصفوة، دار الحديث، القاهرة، ٢٠٠٠م، ج١، ص ٩٥.
[3] الدينوري: عيون الأخبار، دار الكتب العلمية -بيروت، ١٤١٨هـ ج١، ص ٣٨١.
[4] الذهبي: تذكرة الحفاظ، الطبعة الأولى، دار الكتب العلمية بيروت-لبنان، ١٩٩٨م، ج١، ص ٢٨.

چارەسەری ناکۆکییەکانیان هەبوو نەوەک مەبەستیان بێت یەکدی لەناوببەن، کە هەستیشیان بە هەڵەکە دەکرد، تەوبەیان لێدەکرد.

ئەبووزەری غیفاری دەڵێت: جارێک لەگەڵ کەسێکدا دەمەقاڵەیەکم بوو، دایکی ئەو کەسە عەجەمی بوو، منیش لەگەرمەی دەمەقاڵێکەدا تانەم لە دایکی دا، کابرا چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و شکاتی لێکردم، ئەویش پێی فەرمووم: ئەرێ قسەت بە فلانەکەس وتووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی (أَفَنِلْتَ مِنْ أُمِّهِ)، (ئەی قسەت لەسەر دایکی کردووە؟) وتم: بەڵێ، فەرمووی(ﷺ)، (إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ)، (دەی تۆ کەسێکیت هێشتا شتێک لە خراپەی سەردەمی نەفامیت تێدا ماوە).[1]

یاخود جارێک دەمەقاڵێیەک لەنێوان خالیدی کوڕی وەلید و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفدا دروست بوو، خالید قسەیەکی بە عەبدوڕەحمان وت، ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی (لاَ تَسُبُّوا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي ؛ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَوْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ)،[2] (قسە مەڵێن بە هاوەڵانم، چونکە هەرکام لە ئێوە ئەگەر هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت، ئەو بەخشینەی ناگاتەوە بە بەخشینی موددێک[3] یان نیو موددی هاوەڵانم).

بورەیدە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووتالیبی نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید تا پێنج یەکی دەستکەوت دابەش بکات، کە بەیانی بوویەوە عەلی ئاو لەسەری دەچۆڕا، خالید بە بورەیدەی وت دەبینیت (عەلی) چی دەکات یان دەبینیت چی کردووە؟ بورەیدە دەڵێت: منیش رقم بوو لە عەلی، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵم پێدا عەلی چی کردووە، ئەویش فەرمووی ئەی بورەیدە ئایا تۆ رقتە لە عەلی؟ وتم بەڵێ، فەرمووی رقت لێی نەبێت.[4]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الأدب - باب ما ينهى من السباب واللعن، الرقم ٦٠٥٠.

[2] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب تحريم سب الصحابة(ﷺ)، الرقم ٢٥٤١.

[3] مود بە دوو واتا دێت: واتای مشتێک، هەروەها پێوانەیەکی خواردن و شلەمەنی بووە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا کە نزیکەی تەنەکەیەکی ئەمڕۆ دەکات.

[4] فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ١١٣٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٧٥، أسد

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بورەیدە دەڵێت: هێندە رقم لە عەلی بوو کەسی تر نەبوو هێندە رقم لێی بێت، تەنانەت پیاوێک هەبوو لە مەککە بەس لەبەرئەوە خۆشم دەویست کە رقی بوو لە عەلی، جا لە سوپایەکدا هاودەمی ئەو پیاوەم کرد بەس تەنها لەبەرئەوەی کە رقی بوو لە عەلی، ئەوەبوو بڕێ دەستکەوتمان دەستکەوت، ئەو کەسە هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کەسێک بنێرە تا پێنج یەکەکەی دابەش بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) عەلی نارد، لەسەر دابەشکردنی دەستکەوتەکان لەلایەن سەرکردەکەوە گلەییەک بەرامبەر بە عەلی درووست بوو، سەرکردەکە نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و منیش وتم من وەک نێردراو و پشت راست بنێرە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کە نامەکەم دەخوێندەوەو دەموت راستی نووسیوە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی گرتم و نامەکەشی گرتە دەستی و فەرمووی ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم بەڵێ، فەرمووی (فَلاَ تبْغِضْهُ ، وَإِنْ كُنْتَ تحِبُّهُ ، فَازْدَدْ لَهُ حُبًّا)، (دەی رقت لێی نەبێت، ئەگەریش خۆشت دەوێت زیاتر خۆشت بوێت)، بورەیدە دەڵێت: سوێند بەخوا دوای ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کەس نەبوو هێندەی عەلی لام خۆشەویست بێت.[1]

سەبارەت بە ناکۆکی نێوان هاوەڵان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوا لەم چەشنانە تێنەدەپەڕی.

یەکەم: بەشێکی پەیوەست بوو بە ئیجتیهادی جیاوازی نێوان هاوەڵانەوەو خەمخۆری هەرکامیان بۆ موسڵمانان، نموونەی ئەوەش دوو ئیجتیهادی جیاوازی بەرەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و بەرەی عائیشە لەسەر مەسەلەی بکوژانی عوسمانی کوڕی عەففان،[2] یان ئیجتیهادی جیاوازی بەرەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و بەرەی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان سەبارەت بە هەمان پرس.

---

الغابة، ج١، ص ٢٦٤.

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣٤٣٣، صححه شعيب الأرناؤوط.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٢٣٨ وما بعدها.

دووەم: ناکۆکی لەسەر بابەتێک کە هەڵەتێگەیشتن لەنێوانیان روویدەدا و بە روونکردنەوەی حاڵەتەکە خێرا هەردوولا دەگەڕانەوە بۆ بڕیاری حەق، بۆ نموونە:

عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) چۆڕاوگەیەکی لە ماڵەکەیدا هەبوو کە دەڕژا بەسەر کۆڵاندا، جارێک عومەری کوڕی خەططاب جلی تایبەتی رۆژی هەینی لەبەرکرد، عەبباسیش دوو مریشکی سەربڕیبوو، کاتێک عومەر بەوێدا تێپەڕی، خوێناوەکە بەر جلەکانی کەوت، ئەویش لەبەر بەرژەوەندی موسڵمانان بۆ ئەوەی لەو رێگەوە جلوبەرگیان پیس نەبێت، بڕیاریدا ئەو چۆڕاوگەیە لابەن، عومەر رۆیشت و خۆی گۆڕی و گەڕایەوە، عەبباس هات بۆ لای و پێی وت: سوێند بەخوا ئەوەی لاتبرد پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لەوێدا دایانابوو، عومەریش بە عەبباسی وت: دەی دەبێت بێیتە سەر پشتم و سەرکەویت و بیخەیتەوە هەمان ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تیایدا دایانابوو، عەبباسیش بەگوێی کرد.[1]

سێیەم: ناکۆکی لەسەر پرسێک کە دوو رای جیاوازی لەسەربوو و بە ئاسانی نەدەگەیشتنە بڕیارێک کە هەردوولا لەسەری کۆدەنگ بن، ئەم حاڵەتەش زۆر کەم بوو، نموونەی ئەوەش رووداوی دڵئێشانی فاطیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەبووبەکری صدیق پەیوەست بە میراتی پێغەمبەر(ﷺ)،[2] یان ئیجتیهادی جیاوازی ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەططاب سەبارەت بە کوژرانی مالیکی کوڕی نوەیرە و لادانی خالیدی کوڕی وەلید.

چوارەم: بەشێکی پەیوەست بوو بە بواری رۆژانەی ژیانەوەو وەک مرۆڤێکی ئاسایی ناکۆکییان بۆ دروست دەبوو کە ئەمەش کەم بوو و وەک حاڵەت مامەڵەی لەگەڵ دەکرا نەوەک بووبێتە دیاردە، نموونەی ئەمەش ناکۆکی نێوان عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و عەلی کوڕی ئەبووطالیب

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨١٥، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[2] صحيح البخاري - كتاب فرض الخمس - باب فرض الخمس، الرقم ٣٠٩٢.

لەسەر میرات و چوونیان بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب کە ئەوکات خەلیفەی موسڵمانان بوو.[1]

**راجیایی هاوەڵان**

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤ بوون، مرۆڤ بوونیش بڕێک تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەنێویشیاندا رای جیاواز و بیرکردنەوەی جیاواز، ئەمەش لە هاوەڵاندا بوونی هەبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەتا لە ژیاندا بوو فێری دەکردن سنووری رەوای رای جیاواز لە چیدایە، ئەوەشی لە سنوور دەردەچێت دەبێت خۆیانی لێ بپارێزن.

هەندێ جار بیروبۆچوونی جیاوازی هاوەڵان پەیوەست بوو بە مامەڵەی دینیەوە، نموونەی ئەوەش لە رووداوی نوێژی عەسری کاتی جەنگی بەنوقورەیزەدا دەبینین کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ)، (هیچ کەس نوێژی عەسر نەکات تا ئەو کاتەی خۆی دەگەیەنێتە ناو شوێنی بەنوقورەیزە)، هەندێک لە نیوەی رێدا نوێژەکەیان کرد و وتیان مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبووە پەلە بکەین نەوەک نوێژەکەمان بفەوتێت، هەندێکیشیان نوێژەکەیان نەکرد و وتیان شوێنکەوتنی فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ) لەپێشترە،[2] مەبەستی هەردووکیشیان بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا بوو، هەرکامیشیان بیانوویەکی پێ بوو بۆ بۆچوونەکەی.

هەندێ جاریش راجیاییەکە پەیوەست بوو بە پرسێکی سیاسی یان ئیجتیهادێکی پەیوەست بە بەڕێوەبردنی ژیانەوە، بۆ نموونە:

ئەبووبەکری صدیق لەگەڵ دەستبەکاربوونی وەک خەلیفەی موسڵمانان، بڕیاری دا سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید بەڕێ بکات و هیچ سەربازێکی ناو سوپاکەش لە مەدینە گل نەداتەوە، زۆرێک لە موسڵمانان بە عومەری

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة - باب ما يكره من التعمق والتنازع في العلم، الرقم ٧٣٠٥.

[2] صحيح البخاري - أبواب صلاة الخوف - باب حدثنا عبد الله بن محمد بن أسماء، الرقم ٩٤٦.

کوڕی خەططابیشـەوە پێیـان وابـوو پەلـە نەکرێـت لـە ناردنـی سـوپاکەی ئوسـامەی کـوڕی زەیـد، بیانووشـیان بەدەسـتەوەبوو و پێیـان وابـوو ئـەو سـوپایە پێویسـتە بۆ مەیدانێکی گرنگتـر بەکاربهێنرێت کـە ئەویش پاراسـتنی مەدینـە و بەرگرتنـە بـە هەڵگـەڕاوەکان، دەیانـوت پێغەمبـەر(ﷺ) لـە حاڵـی سـەلامەتی و بێ کێشـەییدا بڕیاری ناردنـی ئـەو سـوپایەی داوە و بارودۆخەکە وەک ئێسـتا نەبووە، بە واتایەکی تر، ئاسایشـی ناوخۆ لەپێشترە لە ئاسایشـی دەرەکـی و ئەگـەر پایتەخـت لەدەسـت بچێـت، چ بەهایـەک دەمێنێتـەوە بـۆ سـوپایەک کە نەیتوانیوە پایتەختەکەی خۆی بپارێزێت، بەڵام ئەبووبەکر کە لـە هەمـوان زیاتـر لـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) مابوویـەوەو شـارەزا بـوو بـە بڕیـار و ڕێنماییەکانـی، ئامـادە نەبـوو دەسـتبەرداری بنەمـای شـوێنکەوتەیی بێ و وەڵامێکی یەکلاکـەرەوەی خەڵکەکـەی دایـەوە (سـوێند بەخـوا سـوپایەک هەڵناوەشـێنمەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) پێکیهێنـاوە، تەنانـەت ئەگـەر حـاڵ بگاتـە ئـەوەی باڵنـدە و ئاژەڵـە دڕندەکانـی دەوروبـەری مەدینـە بمانفڕێنـن، ئەگـەر سـەگەکان قـەپ بکـەن بـە قاچی دایکانـی باوەڕداراندا و ڕایانکێشـن، هـەر دەبێ سـوپاکەی ئوسـامە بـەڕێ بکـەم).[1]

سـوپاکە بەڕێکـەوت و لـە مـاوەی کەمتـر یـان زیاتـر لـە دوو مانگـدا بـە سـەرکەوتوویی ئەرکـی خـۆی بەجێگەیانـد و چەنـد دەسـتکەوتێکی گـەورەی بەدەسـتهێنا، لەوانـە:

- هـەر لـە سـەرەتاوە کـە سـوپایەکی گـەورەی بـەو چەشـنە تێپـەڕ دەبـوو بـە ناوچەکانـدا، ترسـی لای هـۆزەکان دروسـت دەکرد بـۆ ئـەوەی نەچنـە بـەرەی هەڵگەڕاوەکانـەوە.[2]

- هەڵگـەڕاوەکان نەیاندەتوانـی بـە چـاوی کەمـەوە سـەیری موسـڵمانان بکـەن، دەیانـوت ئـەوان هێنـدە بێترسـن، خەریکـی ململانـێ دەرەکیەکانـن.

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٣٣٤- ٣٣٥.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٣٣٥.

- موسڵمانان بە ئەزموونیی لەسەر ئەوە راهاتن لە غیابی پێغەمبەری خواشدا(ﷺ) پرسی شوێنکەوتنی بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) پێش بیرکردنەوەی خۆیان بخەن.

- موسڵمانان لە قۆناغی خەمخواردن بۆ مەرگی پێغەمبەر(ﷺ) و سەرقاڵبوون بە ماتەمەوە، چوونە قۆناغی پێشڕەوی و لابردنی بەربەستەکان.

وێڕای ئمانەش راجیایی هاوەڵان لە مەسەلە زانستییەکاندا لە هەندێک بابەتدا هەبووەو وردەکاری ئەو راجیاییانەش تۆمار کراون، هاوەڵانیش شیاوی ئیجتیهاد کردن بون.

## پەیوەندی نێوان هاوەڵان و ناموسڵمانان

مەسەلەیەکی هەستیار لە بواری ژیانی هاوەڵاندا پەیوەستە بە پەیوەندی و مامەڵەیان لەگەڵ ناموسڵماناندا، چ بێباوەڕانی دەوری خۆیان، یان ئەهلی کیتاب وەک جوولەکەو مەسیحییەکان، چونکە بەردەوام پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوانیاندا هەبوو.

ئەوەی دەیزانین ئەوەیە کە خاڵی بنەڕەتی لە پەیوەندیدا لای هاوەڵان بریتی بوو لە مەسەلەی ئیمان، پرسێک کە زۆرجار بێباوەڕەکانی قورەیش وەک تانەیەک بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) بەکاریان دەهێنا گوایە باوک و برا و دایک و رۆڵە و کەسانی نزیک لەیەک دەکات و دەیانکاتە دوژمنی یەکدی.

بە شێوەیەکی گشتی مامەڵەی هاوەڵان لەگەڵ ناموسڵماناندا هەڵقوڵاوی رێنماییەکانی دینەکەیان بوو، واتە قورئان و پێغەمبەری خوا(ﷺ) چییان لێ داوابکردنایە وایاندەکرد، ئیسلامیش بۆ بارودۆخ و حاڵەتە جیاوازەکان رێنمایی تایبەتی هەبوو، بۆ نموونە:

رێنمایی ئیسلام بۆ مامەڵەی موسڵمانێک لەگەڵ دایک و باوکە ناموسڵمانەکەی جیاواز بوو لەگەڵ مامەڵەی هەمان کەس لەگەڵ نەناسێکدا.

مامەڵەی موسڵمانێک لەگەڵ هاوپەیمانێکی ناموسڵماندا جیاواز بوو لەگەڵ مامەڵە لەگەڵ ناموسڵمانێکدا کە هیچ پەیمانێک نیە لەنێوان ئەو و موسڵماناندا.

مامەڵەی موسڵمان لەگەڵ ناموسڵمانێکی بێوەی و کەنارگرتوودا جیاوازە لەگەڵ ناموسڵمانێکی شەڕەنگێز و نەیار بە ئیسلام کە هەڵوێستی پیلانگێڕی بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان نیشان دەدات.

مامەڵـەی موسـڵمان لەگـەڵ ناموسـڵمانێکی گەنـج و ناموسـڵمانێکی پیـر، پەرستشـکار، ئافـرەت، منداڵـدا جیـاوازە و یـەک بڕیاریـان لەسـەر نادرێت.

ئەمانـە و چەندیـن حاڵەتـی تـر کـە هـەرکام لەوانـە حوکمـی تایبەتـی خـۆی هەیـە و هاوەڵانیـش پابەنـدی ئـەو حوکمانـە بـون.

**دەستگرتن بە ئیسلامەوە:**

شـوێنکەوتوانی ئاییـنی خـوا بـە درێژایـی مێـژوو، لەپێنـاو دەسـتگرتنیان بـە ئاینەکەیانـەوە، ناڕەحەتـی و ئەشـکەنجەی هەمەچەشـنەیان هاتۆتـەڕێ، بـەڵام لـە هەمـوو ئەوانـە گرنگتـر لەلایـان، دەسـتبەرنەدان بـووە لـە پەیامـی خـوا، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـە ڕوونـی ڕێـڕەوی خواناسـانی پێشـینمان بـۆ بـاس دەکات و دەفەرمویـت: (كَانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يحُفَرُ لَهُ فِي الْأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهِ فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ. وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ لحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ أَوْ عَصَبٍ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ).[1] (کەسـانی پێـش ئێـوە وابـوون، کەسـی وایـان دەبـرا چاڵێکـی بـۆ هەڵدەکەنـرا و دەخرایـە ناویـەوە، ئینجـا مشـاریان دەهێنـا و لـە سـەریەوە بـۆ خـوارەوە دەیانکرد بـە دوو لەتـەوە، تووڵـی ئاسـن دەکـرا بـە نێـوان گۆشـت و ئێسـقانیدا، کەچـی ئـەوە نەدەبوویـە هـۆی وازهێنانـی لـە ئاینەکـەی).

هاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) لەپێنـاو دینەکەیاندا، ئامادە بـون هەموو قوربانییەک بـدەن، دەسـتبەرداری داهـات و سـامان و خـاک و شـار و کەسـوکاری خۆیـان بـن، ئەگـەر بێتـو هەریـەک لەوانـە ڕێگـر بـن لـە پابەندبـوون بـە دینەکەیـان.

کاتێـک ژیانـی هـاوەڵان دەخوێنیتـەوە، ئینجـا جـوان تێدەگەیـت لەپێنـاو پاراسـتنی دینەکەیانـدا چ قوربانیەکیـان داوە، لـە قۆناغـی مەککـەدا، دەیـان بەسـەرهاتی ئـازار و ناڕەحەتیـان کتێبەکانـی مێـژووی داگیرکـردووە، چ وەک تاکـە تاکـەی هـاوەڵان، چ وەک کـۆی هـاوەڵان بـە جارێـک کـە خـۆی دەبینیـەوە لـە گەمـارۆی شـیوی ئەبووطالیـب.

[1] صحيح البخاري، كتاب المناقب – باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦١٢.

بڕوانە نموونەی چەند هاوەڵێک کە لەسەر دینەکەیان ئازار دران، بەڵام ئامادە نەبوون دەستبەرداری بن:

خەبابی کوڕی ئەرەت کاتێک موسڵمان بوو، بێباوەڕان زۆریان لێدەکرد وازبهێنێت لە دینەکەی، کەچی ئەو ئامادەیی ئەوەی نەبوو، جار هەبوو جلی ئاسنینیان دەکردە بەری و بە گەرمای مەککەدا دەیانبرد و لەبەر خۆر دایاندەنا، ئیتر گەرمای خۆر و گەرمبوونی ئاسن یەکیان دەگرت بۆ برژاندنی جەستەی.[1]

ئەو ژنەی کە خەبابی کڕیبوو ئاسنی گەرم دەکرد و سەری خەبابی پێ داخ دەکرد.[2]

جارێک عومەری کوڕی خەططاب خەبابی دانیشاند و وتی: لەم کۆڕەدا تەنها یەک کەس هەیە لە تۆ زیاتر شیاوی ئەم شوێنە بێت، خەبباب وتی: کێیە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ خەلیفە وتی: بیلال، خەبباب وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بیلالیش لە من لەپێشتر نیە، بیلال لەناو بێباوەڕاندا کەسێکی هەبوو کە بەرگرییەکی لێ بکات، بەڵام من کەسم نەبوو، ڕۆژێک منیان برد و ئاگرێکیان بۆ کردمەوەو لەناویدا تلیان دام، دواتر کەسێکیان قاچی خستە سەر سنگم، ئیتر ئەو زەوییەی بەو ئاگرە گەرم بووبوو بە پشتی من سارد بوویەوە، ئینجا خەبباب پشتی خۆی هەڵکرد هەموو پێستی پشتی پەڵە و شوێن سووتاویی بوو.[3]

**لە قۆناغی مەککەدا:**

هاوەڵان لە قۆناغی مەککەدا مامەڵەی ڕۆژانەیان لەگەڵ بێباوەڕاندا هەبوو، ئەوان هیچ تانەیەکی شەخسییان لە هیچ کەس نەدەدا، مەبەستیان شکاندنی کەسێتییەکانی ناو شارەکە نەبوو، بەڵکو خوازیار بوون هەرکام

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.
[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٥.

لەوان باوەڕ بهێنن و بە نموونەی باڵای ناو شارەکە بمێننەوە، تەنها خاڵێک کە هاوەڵان لەو قۆناغەدا کاریان لەسەردەکرد بریتی بوو لە لێدانی بیروباوەڕی بتپەرستی و خوانەناسی بێباوەڕانی قورەیش، لەمەشدا هیچ خاترانەیەکیان نەبوو با تەنانەت ئەو کەسە باوک و دایک و برا و خاڵ و مام یان هەر نزیکێکی تر بێت، ئەمە لەکاتێکدا کە بێباوەڕان زۆر بە زبری مامەڵەیان لەگەڵ موسڵماناندا دەکرد، ئازار و ئەشکەنجەدان، تۆمەت بەخشینەوە، سزادان، دەنگ لێ دابڕین، وەستاندنی تێکەڵاوی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی، سزای ئابووری، ئەمانە و چەندەها جۆری تری مامەڵەی زبر و دژایەتییان بەرامبەر بە موسڵمانان نیشان دا.

زوبەیری کوڕی عەووام کە موسڵمان بووبوو، لەلایەن مامیەوە لەسەر دینداریيەکەی ئەشکەنجە دەدرا و پێی دەوت دەبێت وازبهێنیت، لەناو حەسیرێکدا هەڵیدەواسی و ئینجا لە بنەوە ئاگری بۆ دەکردەوەو مەرجی بۆ دادەنا واز لە ئیسلام بهێنێت، زوبەیریش ئامادە نەبوو بە گوێی مامی بکات.[1]

کاتێک عوسمانی کوڕی عەففان باوەڕی هێنا، حەکەمی مامی هات و عوسمانی گرت و بەستیەوە، پێی دەوت: واز لە ئایینی باوباپیرانت دێنیت بۆ ئایینی کەسێک کە دینێکی نوێی داهێناوە؟ بەخوا ناتکەمەوە هەتا واز لەو دینە نەهێنیت، ئەویش دەویت: بەخوا هەرگیز وازی لێ ناهێنم، حەکەم کە سووربوونی عوسمانی لەسەر باوەڕەکەی بینی، ئینجا بە ناچاری وازی لێ هێنا.[2]

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیش کاتێک باوەڕی هێنا، دایکی ناڕازی بوو، سەعد بەرامبەر بە دایکی چاکەی زۆر بوو، بەڵام رازی نەبوو ئەو داواکارییەی قبووڵ بکات کە وازهێنانە لە ئیسلام، دایکیشی سوێندی لێ خوارد هەتا وازنەهێنێت قسەی لەگەڵ نەکات و دەم بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە، ئینجا بە تانەوە بە سەعدی دەوت: بە لای خۆیەوە بانگەشەی

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة- ذكر مناقب حواري رسول الله(ﷺ)، الرقم ٥٥٩٣.
[2] ابن سعد: الطبقات الكبرى، ط العلمية، بيروت، ج٣، ص ٤٠.

ئەوە دەکەیت خوا ڕێنمایی کردویت لەگەڵ دایک و باوکتدا چاک بیت، منیش دایکی تۆم و فەرمانت پێ دەکەم وازبهێنیت، سێ ڕۆژ نانی نەخوارد هەتا لە لاوازیدا بوورایەوە، کوڕێکی بە ناوی عومارە بڕێک ئاوی پێدا هەتا هاتەوە هۆش خۆی، دایکی کەوتە نزاکردن لە سەعد، ئەوەبوو خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلى أَنْ تشرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنيَا مَعْرُوفًا)،[1] (ئێمە دەربارەی باوک و دایک بە مرۆڤمان ڕاگەیاندو ئامۆژگاریمان کرد کە: هەمیشە ڕەفتاری چاکەیان لەگەڵ بکەن بە تایبەتی لەگەڵ دایکییدا.. دایکی بە پێستی سک هەڵیگرتووە بە لاوازی لەسەر لاوازی، تا لە داوێنی بەربۆتەوەو هاتۆتە ئەم جیهانەوە شیر برینەوەشی دوو ساڵی خایاند، کەوایە (ئەی مرۆڤ!) بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم و سوپاسی باوک و دایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارەی لە پێناوی تۆدا چێشتوویانە گێڕانەوەشتان هەر بۆ لای منە، دوای زیندووبوونەوە، هەمیشە گوێڕایەڵیان بە لە سنووری ڕەزامەندیی خوادا، خۆ ئەگەر هەوڵیشیانداو پێیان داگرت لەسەر ئەوە کە شتێک بکەی بە شەریک و هاوبەشم، کە هیچ بەڵگەو زانیارییەکت پێی نیە ئەوسا گوێڕایەڵییان مەکە وە لە دنیادا لەگەڵ هەردووکیاندا بە شێوەیەکی چاک و پەسەند هاوەڵی بکە، هاوڕێ و هاوکارێکی چاک بە بۆیان).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کاتێک سەعد بینی دایکی ئاوا وەزعی شلۆق بووە، پێی وت: دایکی شیرینم، باش بزانە سوێند بەخوا ئەگەر هەزار گیانت هەبێت، یەکە یەکە هەموویان دەربچن وازناهێنم لە دینەکەم، ئیتر پێت خۆشە شتێک بخۆ، نایشخۆیت با بە ویستی خۆت بێت.[2]

**لە قۆناغی مەدینەدا:**

[1] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب في فضل سعد بن أبي وقاص، الرقم ١٧٤٨.

[2] ابن عساكر: تاريخ دمشق، ج٢٠، ص ٣٣١.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە چوویە مەدینە، لە پەڕاوێکدا نووسراوێکی تۆمار کرد بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ خەڵکی مەدینە کە ڕەزامەندی هەموو لایەنەکانی مەدینەی لەسەر بوو، هەریەک لە کۆچەران و پشتیوانان و جوولەکەکانیش ڕەزامەندییان لەسەر نیشاندا.

نامەکە تەنها بە گوفتار نەبوو، بەڵکو نووسرابوویەوە، بەشی پەیوەندی نێوان موسڵمانانی بە گشتی بە جیا باس کردبوو، هەروەها بەشی پەیوەندی نێوان جوولەکەکان و موسڵمانانیشی بە جیا باس کردبوو، هەروەها بەشی پەیوەندی هەموو دانیشتوانی مەدینەی لەگەڵ دەسەلات و هێزەکانی دەرەوەو قوڕەیش بە تایبەتی بە جیا باس کردبوو.[1]

ئەو لایەنە ناموسڵمانانەی بەشداری ئەو دەستووره بوون و دواتر مامەڵەی موسڵمانان لەگەڵیان لەسەر ئەو بنەمایە بوو، بریتی بوون لە:

جوولەکەکانی مەدینە: جوولەکەکانی مەدینە بریتی بوون لە (بەنوقەینوقاع، بەنونەضیر، بەنوقورەیظە)، جگە لەوەش لە دووری مەدینە لە خەیبەر و فەدەکیش جوولەکەکان نیشتەجێ بوون، ئەمانە بە شێوەیەکی گشتی سەرقاڵی بواری ئابووری بوون و پشکی شێریان لەو بوارەدا بۆ خۆیان بردبوو.

بێباوەڕانی مەدینە: ژمارەیەکی بەرچاو لە دانیشتوانی مەدینە هەتا سەروبەندی نووسینی دەستووری مەدینەش، هێشتا بە بێباوەڕیی مابوونەوە، یاخود بتپەرست بوون،[2] یان بڕوایان بە ئایینێک بوو جیا لە ئیسلام و مەسیحیەت و جوولەکایەتی.[3]

لێرەدا ئاماژە بە کۆمەڵێک دەقی ناو ئەو پەڕاوە دەکەین (بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەمە نووسراوێکە لە موحەممەدی پێغەمبەرەوە ..

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٢٢٤-٢٢٦.

[2] () – البخاري.

[3] ابن هشام: م،س، ص ٢٧٨.

هەرکەسێک لە جوولەکە شوێنمان بکەوێت، ئەوە سەرخستنی و پێشەنگیی دەیگرێتەوە، ستەمیان لێ ناکرێت و لە دژیان پشتیوانیی کەس ناکرێت .. جوولەکەکان خەرجییان لەگەڵ باوەڕداراندایە تا ئەوکاتەی جەنگاوەر بن، جوولەکەکانی بەنی عەوف، لەگەڵ باوەڕداراندا یەک ئوممەتن، جوولەکەکان ئایینی خۆیان دەبێت و موسڵمانانیش ئایینی خۆیان دەبێت، چ خۆیان و چ مەوالیەکانیان، مەگەر کەسێک ستەم یان تاوان بکات، ئەوە تەنها خۆی و خانەوادەکەی دەگرێتەوە .. جوولەکەکان خەرجیی خۆیان لەسەر خۆیان و موسڵمانانیش خەرجی خۆیان لەسەر خۆیانە، دەبێت یەکتری سەربخەن دژی هەر کەسێک لەگەڵ خەڵکی ناو ئەم پەڕاوەدا دەجەنگێت، لەنێوان موسڵمانان و جوولەکەکاندا ئامۆژگاریی یەکتریی هەیە، چاکە بەبێ خراپە، هیچ کەس بەهۆی هاوپەیمانەکەیەوە تاوانبار نابێت، دەبێت ستەملێکراو سەربخرێت، جوولەکەکان لەگەڵ باوەڕداراندا دەبەخشن تا ئەو کاتەی لە جەنگدا بن، ناو یەسریب – تێکدانی- حەرامە لەسەر خەڵکی ناو ئەم پەڕاوە .. جوولەکەکانی ئەوس، خۆیان و مەوالییەکانیان، وەک خەڵکی ناو ئەم پەڕاوە لەگەڵ کەسی چاکی چاکەکاری ناو ئەم پەڕاوەدا وەک یەک دەبن، چاکە بەبێ خراپە، هەرکەسەو تەنها بەسەر خۆیدا دەهێنێتەوە، خوای گەورە سەروو راستترین و چاکترینی ئەم پەڕاوەی قەبووڵە، ئەم نووسراوە رێگر نیە -لە سزادانی- هەر ستەمکار و تاوانبارێک، هەرکەس -لە مەدینە- بچێتە دەرەوە، پەنادراو و بێخەمە، هەرکەسیش لە مەدینە بمێنێتەوە پەنادراو و بێخەمە، مەگەر کەسێک ستەم یان تاوانێک بکات).[1]

دواتر لەلایەن پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵانیەوە پابەندبوون بەم دەقانەوە بەدیکرا، بۆ نموونە:

ئەبووعامیر کە باوکی حەنزەلە -یەکێک لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر – بوو، نە موسڵمان بوو، نە جوولەکە، پاش دانیشتنێک و مشتومڕ لەگەڵ

[1] ابن هشام: السيرة النبوية، ص ٢٣٢-٢٣٤.

پێغەمبەردا، ئامادەیی نەبوو بڕوای پێ بهێنێت، ئینجا بڕیاری دا شاری مەدینە جێبهێڵێت، ئەوەبوو بێ هیچ هەڵوێست وەرگرتن، یاخود ڕێگرییەک لە بەرامبەریدا، ڕوویکردە مەککە.[1]

عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولیش کەسێکی بێباوەڕ بوو،[2] هیچ هەڵوێستێکی لە دژ نەگیرایەبەر هەتا دواتر موسڵمان بوو، هەرچەندە سەرکردەی دووڕووەکانیش بوو، بەڵام بۆ تەنها جارێکیش سووکایەتی، بەندکردن، کوشتنی بەرەوڕوو نەکرایەوە، بەڵکو کاتێکیش مرد، پێغەمبەری خوا جلەکەی خۆی کرد بە کفن بۆی.[3]

**پەیوەندییە خزمایەتییەکان:**

پێغەمبەری خوای(ﷺ) هاوەڵانی فێرکردبوو پەیوەندییە خزمایەتییەکانیان لەگەڵ ناموسڵماناندا نەپچڕن مادەم زیان بە دینەکەیان نەگەیەنێت، بەڵکو موسڵمان لەو حاڵەتانەدا ئەگەر لە ڕووی ئیمانیەوە بەهێزبوو، دەبێت هێشتنەوەی پەیوەندییەکان بۆ بانگەوازکردنیان بەکاربهێنێت، ئەگەرنا دیوی مامەڵەی جوانی موسڵمانانەیان نیشان بدات.

جارێک ئەسمائی کچی ئەبووبەکر هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایکم هاتووە بۆ لام -ئەوکات دایکی بێباوەڕ بوو- ئایا ڕێی بدەم و ڕێزی بگرم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (نَعَمْ صِلِيهَا)،[4] (بەڵێ چاکەی لەگەڵ بنوێنە).

لە فەتحی مەککەدا ئومموهانیئی کچی ئەبووطالیب پەنای یەکێک لە خزمە بێباوەڕەکانی ناو مەککەی دا، یەکێک لە هاوەڵەکان ئەمەی لەسەر دڵ گران بوو و دەیوت ئەو بێباوەڕە دەکوژم، ئومموهانیئیش چوویە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی (قَدْ أَجَرْنَا

[1] ابن هشام: م،س، ص ٢٧٨.
[2] البخاري: م،س، ص ١١١٥.
[3] م،ن، ص ٤٣٧.
[4] صحيح البخاري - كتاب الجزية، الرقم ٣١٨٣.

مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ)،[1] (ئەی ئومموهانیء ئێمەش پەنای ئەو کەسە دەدەین کە تۆ پەنات داوە).

**پەیوەندییە شەخسییەکان:**

پەیوەندی شەخسی لەنێوان هاوەڵان و ناموسڵماناندا هەبوو، تەنانەت خودی پێغەمبەریش(ﷺ) پەیوەندی شەخصی لەگەڵ جوولەکەکاندا هەبوو، ئەوان دەهاتن و سەردانیان دەکرد، مامەڵە و قەرز لەنێوانیاندا هەبوو.

زەیدی کوڕی سەعنە کە ئەوکات جوولەکە بوو، ویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تاقی بکاتەوە، مامەڵەی برێک خورمای لەگەڵ کرد بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، هێشتا چەند رۆژێک مابوو بۆ دانەوەی قەرزەکە، زەید بە دەموچاوێکی گرژەوە چوو بەرەو لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێی وت: ئەی موحەممەد، ئەرێ مافەکەی خۆمم نادەیتەوە؟ من پێشتر تێکەڵی بنەماڵەی ئێوەم کردووەو نەمدیوە ئاوا دەستخەڕۆی کەس بکەن، عومەری کوڕی خەططاب کە ئەوەی بیست، چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسک و داباریین بەسەر کوڵمەکانیدا، بە خێسەیەکەوە تەماشای کرد و وتی: ئەی دوژمنی خوا، چۆن قسەی وا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێیت؟ سوێند بەوەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە حەق ناردووە ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە، بەم شمشێرەم دەمدا لە گەردنت، پێغەمبەریش(ﷺ) بە هێوری تەماشایەکی عومەری کرد و فەرمووی: (ئەی عومەر، ئێمە پێویستمان بە هەڵوێستی تری تۆ هەیە، دەبێت فەرمانم پێبکەیت چاک قەرزەکەم بدەمەوەو فەرمان بەویش بکەیت بە جوانی داوای قەرزەکەی بکاتەوە، ئەی عومەر، بیبە و مافەکەی بدەرەوە و بیست صاعیش زیاد لەوەی بدەرێ لەبەرامبەر ئەوەی وا ترساندت)، عومەریش فەرمانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەجێگەیاند، زەیدیش بەو هەڵوێستە سەرسام بوو و باوەڕی هێنا.[2]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الصلاة - باب الصلاة في الثوب الواحد ملتحفا به، الرقم ٣٥٧.

[2] صحيح ابن حبان، الرقم ٢٨٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٥٤٧ وقال صحيح الإسناد، قال الحافظ

عائیشـەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک چەند کەسێک لـە جوولەکەکان داوای مۆڵەتیان کرد بێن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوەبوو هاتنەژوورەوەو وتیان (السام علیک)، واتـە مردن بۆ تۆ، منیش کە ئەوەم بیست، وتم بەڵکو مـردن و نەفرەتیش بـۆ ئێوە، خێرا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمـووی (مَهْلاً یَا عَائِشَةُ، عَلَیْكِ بِالرِّفْقِ، وَإِيَّاكِ وَالعُنْفَ وَالفُحْشَ،[1] إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ[2]، (لەسـەرخۆ بـە ئـەی عائیشـە، نەرمونیان بە و خۆت بپارێزە لـە توندوتیژیی و قسـەوتن، خـوای گـەورە نەرمونیانـەو لـە هەمـوو کاروبارێکدا نەرمونیانیی پێ خۆشـە)، منیش وتـم: مەگـەر نەتبیسـت چییان وت، ئەویـش فەرمووی: منیش وتم: لـە خۆیشـتان.[3]

**رێ نەدان بە سنووریەزاندن:**

هـاوەڵان زۆر وریابـوون بەرامبـەر بـە هەوڵـی سـنووربەزاندنی ناموسـڵمانان لـە ئاسـت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و ئـەو پەیامـەی هێناویەتـی، لەگـەڵ یەکـەم هەنـگاودا ئامادەییـان هەبـوو رێگـری لـە سـنووربەزێنییان بکـەن بـا تەنانـەت ئەوانە کەسـانی نزیکی خۆیان بن، وەک چۆن لە رووداوی غەزای مورەیسـیعدا کاتێک عەبدوڵای کوڕی ئوبەی سـەرکردەی دووڕووەکان هەڕەشـەی گەڕانەوە نێـو مەدینـەی کـرد، دواتـر دەنگـۆی ئـەوە بڵاوبوویـەوە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیەوێـت عەبـدوڵا بکوژێـت، ئـەو کابـرا دووڕووە کوڕێکـی هەبـوو بـە نـاوی عەبدوڵا کە هاوەڵێکی سـەرڕاست بـوو، خـۆی چوویـە خزمەتی پێغەمبـەر(ﷺ) و پێـی وت: ئەگـەر بڕیـارت وایـە باوکـم بکوژرێـت ئـەوە بیسـپێرە بـە خـۆم بـا سـەرەکەیت بـۆ بهێنـم، خـۆ بەخـوا خـەزرەج دەزانـن لەنێویانـدا کەسـێک نیـە لـە مـن چاکەکارتـر بێـت بەرامبـەر بـە باوکـی، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە

ابن حجر في الإصابة: رجال الإسناد موثوقون.

[1] صحيح البخاري، كتاب الأدب، الرقم ٦٠٣٠.

[2] صحيح البخاري، كتاب استتابة المرتدين، الرقم ٧٢٩٦.

[3] صحيح البخاري، كتاب استتابة المرتدين، الرقم ٧٢٩٦.

وەڵامدا فەرمووی (بَلْ نَتَرَفَّقُ بِهِ وَنُحْسِنُ صُحْبَتَهُ مَا بَقِيَ مَعَنَا)،[1] (بەڵکو نەرمی لەگەڵ دەنوێنین و هەتا لەگەڵماندا بمێنێتەوە بە چاکی لەگەڵی دەجوولێینەوە).

مانگی شەووالی ساڵی دووەمی کۆچی، یەکەم پێشێلکردنی ڕێککەوتنی نێوان پێغەمبەری خوا و جوولەکەکان بوو لەلایەن بەنوقەینوقاعەوە، چونکە ئافرەتێکی موسڵمان لە بازاڕی ئەواندا فرۆشی دەکرد، ئەوانیش زۆریان لێ ئەکرد دەموچاوی نیشان بدات و ئەویش ڕازی نەبوو، دواجار کارێکیان کرد کە هەستایەوە جەستەی دەرکەوت، ئەوانیش کەوتنە پێکەنین و گاڵتەپێکردنی، ئافرەتەکەش هاواری کرد و یەکێک لە موسڵمانان ئەو کابرای کوشت کە وایکرد، ئەوانیش موسڵمانەکەیان کوشت، بەمە ناکۆکی و جەنگ کەوتە نێوان موسڵمانان و بەنوقەینوقاعەوە، پێغەمبەریش ماوەی پانزە شەو گەمارۆی دان، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی چوو بۆ لای پێغەمبەر و پێی وت: ئەی موحەممەد، چاکەت هەبێت بەرامبەر بە هاوپەیمانەکانم، چونکە بەنوقەینوقاع هاوپەیمانی خەزرەجییەکان بوون، دواجار پێغەمبەری خوا داواکارییەکەی پەسەند کرد.[2]

جوولەکەکان سەرەتا بە ناپاکی بچووک دەستیان پێکرد هەتا گەیشتنە ناپاکی گەورە، بەنوقەینوقاع بە شکاندنی شکۆی موسڵمانان و سووکایەتی کردن بە ئافرەتێکی موسڵمان دەستیانپێکرد و دەرکران،[3] بەنونەضیر هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەری خوایان دا[4] کە سەرۆکی دەوڵەتی مەدینە بوو، ئەمانیش سزا دران و دەرکران،[5] بەنوقورەیزەش لەگەرمەی هێرشی دوژمندا ناپاکییان نواند و لەگەڵ دوژمندا دەستیان تێکەڵ کرد بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی مەدینە، ئەمانیش سزا دران.

هەریەک لەمانە کە سزا دەدران ڕوویاندەکردە خەیبەر و لەوێ خۆیان

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ١٨٨.

[2] ابن هشام: م.س، ص ٣٧٠.

[3] ابن هشام: السيرة النبوية، ج٣، ص ٣١٤-٣١٥.

[4] سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٦، صححه الألباني.

[5] ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٤.

کۆدەکردەوەو لەگەڵ لایەنەکانی تردا دەستیان تێکەڵ دەکرد و سوپایان کۆدەکردەوە بۆ هێرش بردنە سەر مەدینە، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاری دا ئەو بنکە سەرەکیەشیان نەهێڵێت و کۆتایی بە مەترسییان بهێنێت و بە فەتحی خەیبەر[1] مەترسی جوولەکەی لە ناوچەکەدا نەهێشت، ئینجا بێ ڕوودانی هیچ کوشتارێک ڕێککەوتنی لەگەڵ جوولەکەکانی فەدەکیش ئەنجامدا و هەمان مەرجەکانی خەیبەری لەسەر ئەوانیش دانا،[2] لە هەموو ئەم هەنگاوانەدا هاوەڵان بە موو لە فەرمان و ڕێنمایی پێغەمبەر(ﷺ) لایاننەدەدا و جێبەجێکاری ئەو بڕیارانە بوون.

**لە حاڵەتی جەنگدا:**

حاڵەتی جەنگ جیاوازە لە ژیانی ئاسایی، چونکە تیایدا بەرەیەک هەنگاو دەنێت بۆ لەناوبردنی بەرامبەر، دەیەوێت بوونی بسڕێتەوە یان شکۆی بشکێنێت یان بیکاتە ژێردەستە یاخود لاوازی بکات، واتە ئامانجەکان بۆ بەرەی بەرامبەر نەرێنین، بۆیە نەرمی نواندن و دەستشلکردن لەو حاڵەتانەدا ژیری تێدا نیە، بۆیە دەبینین هاوەڵان لە حاڵەتی جەنگدا مامەڵەی نەرمییان بەرامبەر بە جەنگاوەرانی ناموسڵمان نیشان نەداوە با تەنانەت ئەوانە کەسانی نزیکی خۆیشیان بووبن.

جارێک عومەری کوڕی خەططاب بە سەعیدی کوڕی عاصی وت: وای دەبینم شتێک لە ناختدا هەیە و پێت وایە من باوکی تۆم -لە بەدردا- کوشتووە، خۆ ئەگەر کوشتبێتم پۆزشت بۆ ناهێنمەوە، بەڵام من ئەوم نەکوشتووە، بەڵکو عاصی کوڕی هیشامی خاڵۆی خۆمم کوشت، باوکی تۆ بە دەستی عەلی ئامۆزای کوژرا،[3] سەعید لە ئاست کوژرانی باوکیدا بەم چەشنە وەڵامی عومەری دایەوە (خۆ ئەگەر تۆیش بتکوشتایە، بەدڵنیاییەوە

---

[1] سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٨، حسن إسناده الألباني.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٣٠.

[3] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٥، ص ١٤٤.

تۆ لەسەر حەق بوویت و باوکم ناحەق بوو).[1]

ئەم رووداوەو هاوشێوەکانی لە نێو ژیانی هاوەڵاندا بەرەنجامی ژیان و وابەستەبوونە بەو دەقانەی قورئانی پیرۆزەوە کە ئاراستەی موسڵمانان دەکات بۆ مەسەلەی وەلائو بەراء، لەوانەش:

(لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)، (هیچ کۆمەڵێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو بە رۆژەکەی تر ببێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن دژایەتی خواو پەیامبەرەکەی دەکەن! هەر چەندە ئەوانە باوکیان، یان کوڕو نەوەیان، یا براو عەشرەتیان بن، ئەوانە – کە لە دۆستایەتی دوژمنانی خوا خۆ دەپارێزن- کەسانێکن خوا ئیمان و باوەڕی لە نێو دڵیاندا چەسپاندووە و پشتگیری کردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە و لە پاشە رۆژیشدا ئەیانباتە نێو چەند باخاتێکی بەهەشتەوە کە جۆگە ئاوی زۆر لە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات بە هەتا هەتاییش تێیدا دەبن خوا لێیان خۆشنوودو ڕازیی بووە، ئەوانیش لە خوا ڕازیی بوون ئا ئەوانە گرووپەکەی خوان ئاگادارو هۆشیاربن، کە هەر گرووپەکەی خوان بەرەوەکان لە دونیاو، لە قیامەتدا).

(لَا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ)، (نابێ بڕواداران جگە لە بڕواداران کەس بگرن بەدۆست و بەیارمەتیدەر و پشت و پەنای خۆیان هەرکەسێک لەفەرمانی خوا دەرچێ و کافران بکاتە دۆستی خۆی، ئەوە هیچ بەشێکی پەیوەندیی ئیمانیی بەخواوە نییە. مەگەر لێیان بترسن و، بتانەوێ لەشەڕیان خۆ قوتار بکەن و خۆ بپارێزن، ئەوە لەوکاتەدا چاک

[1] ابن الأثير: أسد الغابة، ج٢، ص ٤٨١.

وایە بە ڕەواڵەت دوژمنایەتیی و دژایەتی نەکرێن، خوای گەورە دەیەوێ ئێوە هەر لەزاتی خۆی بترسن و وشیاربن . چاکیش بزانن کە چارەنووس و گەڕانەوەی هەمووشتان لەقیامەتدا تەنها بۆلای خوایە).

**پێکەوە ژیان:**

وێڕای ئەوەی جوولەکەکان بە چەند قۆناغێک و بەشبەش ڕێککەوتنەکەیان پێشێل کرد، بەڵام ئەو دەقە دەستوورییە بۆ ئەو جوولەکانە بە کارایی مایەوە کە پابەندی دەقەکە دەبوون، بۆیە هەتا کاتی وەفاتی پێغەمبەریش، ژمارەیەک جوولەکە لەناو مەدینەدا دەژیان و لەسەر ئایینی خۆیشیان بوون، بۆ نموونە:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: مێردمنداڵێکی جوولەکە هەبوو کە خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد، ئەوەبوو نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوایش چوو بۆ سەردانی، لەلای سەری مێردمنداڵەکەوە دانیشت.[1]

ئیبن عەبباس باس لەوە دەکات کە پێغەمبەری خوا بڕێ خواردنی لە کابرایەکی جوولەکە کڕی و درعەکەی خۆی بە ڕەهن لەلا دانا، خواردنەکەش بریتی بوو لە بیست مشت جۆ.[2]

پاش شکستی جوولەکەکان لە خەیبەر و ڕێککەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)، موسڵمانان پێیان لە خەیبەر نەبڕی و تێکەڵیی جوولەکەکانیان دەکرد، یەکێک لە هاوەڵە پشتیوانییەکان کە سەردانی خەیبەری کردبوو، لەوێ کوژرا، پشتیوانییەکان بە جوولەکەکانیان وت: ئێوە هاوەڵەکەی ئێمەتان کوشتووە، ئەوانیش وتیان: ئێمە نەمانکوشتووەو ناشزانین کێ کوشتوویەتی، ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پشتیوانان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الجنائز - باب إذا أسلم الصبي فمات هل يصلى عليه، الرقم ١٣٥٦.

[2] جامع الترمذي - أبواب البيوع عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في الرخصة في الشراء إلى أجل، الرقم ١٢١٤ وقال هذا حديث حسن صحيح

چووین بۆ خەیبەر و هێندەمان بینی یەکێکمان لەوێ کوژرابوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (بەڵگە دێنن لەسەر ئەو کەسەی کوشتوویەتی؟) پشتیوانان وتیان: هیچ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نیە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (دەی ئەوان سوێند بخۆن) واتە جوولەکەکان سوێند بخۆن نەیانکوشتووە، بەوە وازیان لێ دەهێنرێت، پشتیوانان وتیان: ئێمە رازیی نین بە سوێندی جوولەکەکان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دژی جوولەکەکان بڕیاری نەدا و لە داهاتی موسڵمانان خوێن بایی کوژراوەکەی دا بە پشتیوانان.[1]

ئەشعەثی کوڕی قەیس دەڵێت: لەگەڵ کابرایەکی جوولەکەدا کێشەیەکی زەوی لەنێوانماندا هەبوو، ئەوەبوو چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە منی فەرموو: هیچ بەڵگەیەکت پێیە؟ وتم: نا، ئینجا بە کابرای جوولەکەی فەرموو: سوێند بخۆ.[2]

ورد لەم دوو بەسەرهاتە رابمێنە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرچەندە دەیزانی جوولەکەکان بڕوایان پێی نیە و دەستیش ناگرنەوە لە درۆکردن، ئەوان درۆیان بەدەم خواوە دەکرد، ئێستا چەند لایان ئاساییە درۆ بە دەم مرۆڤێکەوە بکەن، هەروەها پشتیوانانیش بوونە سەرخەری دینەکەی و لەپێناو ئیسلامدا ماڵ و گیانی خۆیان بەخت دەکرد، کەچی دادپەروەرانە بنەمای بەڵگە یان سوێندخواردنی بەرامبەر هاوەڵە پشتیوانییەکانی و جوولەکەکان بەکارهێنا، لەکاتێکدا بڕیارەکان لە بەرژەوەندیی جوولەکەکاندا بوو، خۆ دەیتوانی بە تۆمەتی ناپاکیە یەکدوای یەکەکانی جوولەکە، بڕیاریان لە دژ بدات و بڵێت: ئێوە ئەمە ئیشی یەکەمجارتان نییە، ویستتان خۆم بکوژن، پەیمانتان شکاند .. بەڵام ئامادەیی نیشان دەدات، لە داهاتی موسڵمانان خوێن بایی کوژراوێک بدات کە پاش جەنگ و لەنێو خاکی جوولەکەکاندا کوژراوە، تانە

[1] صحيح البخاري، كتاب الديات، الرقم ٦٨٩٨.
[2] صحيح البخاري، كتاب الخصومات، الرقم ٢٤١٦.

و تەشەرێکیش چیە، ئاڕاستەی جوولەکەکان نەکات.

ئەم حاڵەتی پێکەوەژیانە لەگەڵ ناموسڵمانانداندا لە سەردەمی خیلافەتی راشیدینیشدا بەدیدەکرێت بە چەشنێک عومەری کوڕی خەططاب لە داهاتی بەیتولمالی بۆ کەسانی ناموسڵمانی پەککەوتە خەرج دەکرد.

# زانست و هاوەڵان

سیفەتێکی جوانی هاوەڵان ئەوەبوو کە دوای ئەو سەردەمی نەفامییەی تێیانپەڕاندبوو، زۆر بە تاسەوە بەدوای زانستی ڕاستەقینەدا وێڵ بوون، هەوڵیان بۆ دەدا، ڕێزی زانایان دەگرت و ئەو بەشە زانستەش کە لەلایان بوو دەیانبەخشی، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری کردبوون چاکترینیان ئەوانەن فێری قورئان دەبن و کەسانی دیکەش فێر دەکەن، سەروەرمان دەیفەرموو (خَيرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)،[1] هێندە بە گەرمیی هانی دەدان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو زانستەی کە لایانە، ڕایدەسپاردن ئەگەر کەمێکیشیان لابێت، یان بیانەوێت کەمێکیش ببەخشن، دەست نەگرنەوە، بۆیە پێی دەفەرموون (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً)،[2] (ئەوەی لە منەوە وەرتانگرتووە بیگەیەنن با تەنانەت ئایەتێکیش بێت).

هاوەڵان بەجوانی لە گرنگیی زانست و مەیدانی زانستخوازیی تێگەیشتبوون، بۆیە کە گوێ لە هەرکامیان دەگریت، پەیامێکی هاندەرانەی هەیە لەسەر زانست و زانستخوازیی، بۆ نموونە:

سەلمانی فارسیی دەڵێت: (هەتا دوو کەس مابن، یەکێکیان ئەوی تریان فێری زانست بکات، ئەوە خەڵکی چاکەیان تێدا ماوە).[3]

ئەبوودەرداء دەیوت: ساتێک سەرقاڵبوون بە زانست و کۆڕی زانستخوازییەوە زۆر باشترە لە شەوێکی سەراپا شەونوێژ).[4]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب خيركم من تعلم القرآن وعلمه، الرقم ٥٠٢٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب ما ذكر عن بني إسرائيل، الرقم ٣٤٦١.

[3] مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب في ذهاب العلم، الرقم ٢٤٨.

[4] الخطيب البغدادي: الفقيه و المتفقه الطبعة الثانية، دار ابن الجوزي، (السعودية-١٤٢١هـ)، ج١، ص ١٠٢.

عەبدوڵای کوڕی مەسعوود دەیوت: (دوو شەیدا هەن تێر نابن، هەڵگری زانست و کەسی دنیاویست، ئەو دوانە یەکسانیش نین، هەڵگری زانستەکە ڕەزامەندی خوای زیاد دەکات، دنیاویستەکەیش سەرکەشیی زیاد دەکات).[1]

**سەرچاوەی زانست:**

سەرچاوەی زانستی هاوەڵان بریتی بوو لە قورئان و سوننەت، ئەوان زۆر بە تاسەوە وێڵی زانیاری و گەوهەرە بەرچاو و پەنهانەکانی نێو ئەو دوو سەرچاوەیە بوون کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێنمایی کردبوون ئەگەر دەستیان پێوەبگرن گومڕا نابن (تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا : كِتَابَ اللهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ)،[2] (دوو شتم لەنێوتاندا بەجێهێشتووە کە هەتا دەست بەو دوانەوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن و ڕێتان لێ ناشێوێت: کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی).

**مەبەست لە وەرگرتنی زانست:**

مەبەستی هاوەڵان لە وەرگرتنی زانستدا بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بوو، نەوەک پەیداکردنی ناوبانگ یاخود بەکارهێنانی وەک سەرچاوەیەکی داهات، یان بۆ ملەجیرەی بەرچاوی خەڵک و بەزاندنی بەرامبەر.

ئیبن مەسعوود دەیوت: (نەکەن لەبەر ئەم سێ شتە زانست وەربگرن: بۆ ئەوەی مشتومڕی گەمژەکانی پێ بکەن، لەگەڵ زانایاندا چەلەحانێی پێ بکەن، بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵک بە لای خۆتاندا ڕابکێشن، بەڵکو بە وتەکانتان مەبەستتان بەدەستهێنانی ئەوە بێت کە لای خوایە، چونکە ئەوە دەمێنێتەوەو جگە لەوەش نامێنێتەوەو دوای ئەبڕێتەوە).[3]

لە دەقێکی تردا دەڵێت: (هەرکەس زانست لەبەر چوار شت وەربگرێت دەچێتە دۆزەخەوە، بۆ ئەوەی لای زانایان خۆی پێ فش بکاتەوە، یان

[1] الآجري: أخلاق العلماء، ص ٦٨.

[2] موطأ الإمام مالك - كتاب القدر - النهي عن القول بالقدر، الرقم ٦٧٨.

[3] مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب العمل بالعلم وحسن النية فيه، الرقم ٢٦١.

لەگەڵ گەمژەکان مشتومڕی پێ بکات، یاخود سەرنجی خەڵک بە لای خۆیدا رابکێشێت، یان بەهۆیەوە لای سەرکردەکان شتێکی دەستبکەوێت).[1]

**وەرگرتنی زانست:**

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) نموونەی باڵا بوون لە وەرگرتنی زانستدا، هەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) مابوو هەموو توانای خۆیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی زۆرترین رێنمایی لێوەربگرن، تەنانەت کات و ئیشی خۆیان لەگەڵ ئەو خەمەدا دەگونجاند.

بڕوانە هەڵوێستی عومەری کوڕی خەططاب و یەکێک لە هاوەڵە پشتیوانیەکان سەبارەت بە وەرگرتنی زانست و زانیاری لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، عومەر دەڵێت: (وَكَانَ لِي جَارٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَيَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا، فَيَأْتِينِي بِخَبَرِ الْوَحْيِ وَغَيْرِهِ، وَآتِيهِ بِمِثْلِ ذَلِكَ)،[2] (دراوسێیەکی ئەنصاریم هەبوو، ئێمە چوون بۆ لای پێغەمبەری خوامان(ﷺ) کردبوو بە سەرە، رۆژێک ئەو دادەبەزی و رۆژێک من، ئەو هەواڵی وەحی و هەر زانیارییەکی تری بۆ دەهێنامەوە، منیش بە هەمان شێوە).

دوای وەفاتی خۆشەویستیشمان هەوڵیاندەدا چی زانیاری ناو شاری مەدینە و ناو دڵی هاوەڵان هەیە وەریبگرن، ئەگەریش بەشێک لەو زانستە لەوێ دەستنەکەوتایە، ئامادەبوون شارەو شاری بۆ بکەن.

ئیبن عەبباس ئەو هاوەڵە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای زانایی و شارەزایی بۆ کرد، بە حیبری ئوممەت ناسراوە، یەکێکە لەو هاوەڵانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) تەمەنی کەم بوو، بۆیە کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد، بیری کردەوە لە ڕووی زانستیەوە هەنگاوێکی گرنگ بنێت، ئەویش کۆکردنەوەی ئەو زانستەیە کە لای هاوەڵانی دی هەیە، خۆی

---

[1] مسند الدارمي – مقدمة المؤلف – باب التوبيخ لمن يطلب العلم لغير الله، الرقم ٣٧٩.

[2] صحيح مسلم – كتاب الطلاق – باب في الإيلاء واعتزال النساء وتخييرهن، الرقم ١٤٧٩.

بەسەرهاتی ئەم ویستەی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد، بە یەکێک لە کەسە پشتیوانیەکانم وت: هۆ فلانەکەس، وەرە با بچین و دەست بکەین بە پرسیارکردن لە هاوەڵان، چونکە ئەوان ئەمڕۆ ژمارەیان زۆرە و لە ژیاندا ماون، ئەویش پێی وتم: چەند جێی سەرسوڕمانە ئەی ئیبن عەبباس، یانی پێت وایە هەتا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مابن ئەو خەڵکە ئیشیان ئەکەوێتە لای تۆ؟ بۆیە نەهات بەدەم داواکەمەوە، منیش وازم نەهێنا و چوم بەدەم خولیاکەمەوە، جاری وا هەبوو دەمبیست هاوەڵێک فەرموودەیەکی لایە، دەچوومە بەردەم ماڵەکەی دەمبینی کاتی پشوویەتی، لەبەردەم ماڵەکەیدا پاڵم دەدایەوەو دەوەستام هەتا دەیزانی لەوێم، هاوەڵەکە پێی دەوتم: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا بۆچی هاتویت؟ با بتناردایە بە شوێنمدا من دەهاتم بۆ لات، منیش دەموت: نەخێر، لەسەر منە بێمە خزمەتت، ئینجا داوای ئەو فەرموودەم لێدەکرد و لێم وەردەگرت، ڕۆژان تێپەڕی و هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەمبوونەوە و خەڵکی ئیشیان کەوتە من، کابرا پێی وتم: ئەی ئیبن عەبباس، تۆ لە من ژیرتر بوویت.[1]

جارێک عائیشەی دایکی باوەڕداران عورووەی کوڕی زوبەیری لەلابوو کە خوشکەزای بوو، بیستبووی عەبدوڵای کوڕی عەمر بەوێدا تێدەپەڕێت و بە نیازی حەج ڕووەو مەککە دەچێت، عائیشە بە عورووەی وت: خوشکەزاکەم، بیستوومە عەبدوڵا بە نیازی حەجەو بەلاماندا تێدەپەڕێت، خۆتی پێ بگەیەنە و زانستی لێ وەربگرە، چونکە ئەو زانستێکی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەرگرت.[2]

هاوەڵان بۆ وەرگرتنی زانست باکیان بە دووری ڕێ نەبوو، وێڕای ئەوەی هەندێک جار مەودایەکی زۆریان دەبڕی تەنها بۆ دڵنیابوونەوە لە ڕاستێتی

---

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب العلم - الأصل في طلب الحدیث وتوقیر المحدث، الرقم ٣٦٣ وصححه الحاکم و وافقه الذهبي و قال علی شرط البخاري.

[2] صحیح مسلم - کتاب العلم - باب رفع العلم وقبضه وظهور الجهل والفتن في آخر الزمان، الرقم ٢٦٧٣.

دەقێکی زانستی کە وەریانگرتووە، چونکە ئەوان فێرکرابوون سەرپێی زانیاری وەرنەگرن و بە وردی بەدوای حەقیقەتدا بگەڕێن.

جارێک جابیری کوڕی عەبدوڵا بیستبووی کەسێک فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، کەسەکەش ڕێی دوور بوو و لە وڵاتی شام بوو، جابیر خێرا چوو و وشترێکی کڕیی و کوڵی مانگە ڕێیەکی پێچایەوەو خۆی گەیاندە ماڵی کەسەکە، تەماشای کرد ئەو کەسە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە بە ناوی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، جابیر دەڵێت: بە دەرگاوانەکەیم وت: پێی بڵێ جابیر لەبەردەرگایە، ئەویش وتی: جابیری کوڕی عەبدوڵا؟ منیش وتم: بەڵێ، خێرا هەڵەوداوان هات بەرەوڕووم و دەستمان کردە ملی یەک، پێم وت: بیستوومە سەبارەت بە تۆڵەکردنەوە فەرموودەیەکت لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستووە، ترسام تۆ بمریت، یان من بمرم و ئەو فەرموودەت لێ نەبیستم، بۆیە خۆم گەیاندە لات، ئەویش فەرموودەکەی بۆ گێڕایەوە.[1]

ئەمە تەنها حاڵەتی ناو هاوەڵان نەبوو کە بەو چەشنە هەڵەوداوان بەدوای زانستدا بگەڕێن، بەڵکو چەندەها نموونەی دیکە هەن، لەوانەش: عەبدوڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە کە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستی فوزالەی کوڕی عوبەید لە میصرە و فەرموودەی پێغەمبەری خوای لایە، لە مەدینەوە کەوتەڕێ و خۆی گەیاندە لای، فوزاڵە ویستی خزمەتی بکات، هاوەڵەکە پێی وت: نەهاتوم بۆ سەردانیکردنت، بەڵکو بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتوم بۆ لات هیوام وایە شتێکی لەبارەوە بزانیت.[2]

**ئەدەب لە وەرگرتنی زانستدا:**

جوانیەکی هاوەڵان لە وەرگرتنی زانستدا نیشاندانی لووتکەی ڕێز و ئەدەب بوو بەرامبەر بەوەی زانستیان لێ وەردەگرت، هەر ئەمەش لە هاوەڵان

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند المكيين(ﷺ) – حديث عبد الله بن أنيس، الرقم ١٦٢٨٨.

[2] مسند أحمد بن حنبل – مسند الأنصار(ﷺ) – مسند فضالة بن عبيد الأنصاري، الرقم ٢٤٦٠٢.

چاوەڕوانکراوە، چونکە ئەوانە دەستپەروەردەی سەرداری جیهانن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەو ڕێز و ئەدەبە ڕێگر نەبوو لە وەرگرتنی زانستدا وەک چۆن دایکە عائیشە دەڵێت: چاکترین ئافرەتان ئافرەتە پشتیوانییەکان بوون کە شەرم و حەیایان ڕێگر نەبوو لەوەی لە دیندا شارەزایی وەربگرن.[1]

عەبدوڵای کوڕی عەبباس دەڵێت: ماوەی یەک ساڵ دەمویست سەبارەت بە ئایەتێک پرسیار لە عومەری کوڕی خەططاب بکەم کەچی ڕووم نەبوو لێی بپرسم.. دواتر کە لێم پرسی و وەڵامی دامەوە پێم وت: ماوەی یەک ساڵە دەمویست ئەم پرسیارەت لێ بکەم و لەبەر شکۆی جەنابت نەمدەوێرا، ئەویش پێی وت: شتی وا مەکە، هەرکات زانیت زانستێکم لایە لێم بپرسە، ئەگەر زانیاریم لەبارەیەوە هەبوو پێت دەڵێم.[2]

هەروەها ئیبن عەبباس دەیوت: جاری وا هەبوو دەمبیست هاوەڵێک فەرموودەیەکی لایە، دەچوومە بەردەم ماڵەکەی دەمبینی کاتی پشوویەتی، لەبەردەم ماڵەکەیدا پاڵم دەدایەوەو دەوەستام هەتا دەیزانی لەوێم، هاوەڵەکە پێی دەوتم: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا بۆچی هاتویت؟ با بتناردایە بە شوێنمدا من دەهاتم بۆ لات، منیش دەموت: نەخێر، لەسەر منە بێمە خزمەتت.[3]

**پاراستنی زانست:**

یەکێک لە خەمەکانی هاوەڵان بریتی بوو لە پاراستنی ئەو زانستەی کە وەریاندەگرت نەبادا بیریان بچێتەوە، هەیانبوو داوای نزای لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکرد، هەیانبوو زۆر دەیوتەوە بۆ ئەوەی بیری نەچێتەوە، هەشیانبوو دەینووسییەوە.

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الحيض - باب استحباب استعمال المغتسلة من الحيض فرصة من مسك في موضع الدم، الرقم ٣٣٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة المتحرم - باب تبتغي مرضاة أزواجك قد فرض الله لكم تحلة أيمانكم، الرقم ٤٩١٣.

[3] المستدرك على الصحيحين - كتاب العلم - الأصل في طلب الحديث وتوقير المحدث، الرقم ٣٦٣ وصححه الحاكم و وافقه الذهبي و قال على شرط البخاري.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: (ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین و فەرموودەمان لێیەوە دەبیست، کە دواتر هەڵدەساین، لەنێوان خۆماندا فەرموودەکەمان دەوتەوە بۆ ئەوەی لەبەری بکەین).[1]

ئیبن عەبباسیش کە فەرموودەی بۆ خەڵک دەگێڕایەوە، رێنمایی دەکردن (ئەگەر فەرموودەیەکتان لە منەوە بیست، لەنێوان خۆتاندا دووبارەی بکەنەوە).[2]

ئەبووهورەیرە سەبارەت بە عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت: ئەو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەنووسییەوە، بەڵام من نەمدەنووسییەوە.[3]

**پسپۆڕی:**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) توانای هاوەڵەکانی دەستنیشان دەکرد و دەیزانی هەرکامیان لە بوارێکدا لەوانی دیکە لێهاتووترە، ئەمەشی بۆ دەخستنەڕوو بۆ ئەوەی بەرچاوڕوونییەک بێت بۆیان، بۆ نموونە دەیفەرموو:

(وَأَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ ، وَأَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ)، (ئوبەی کوڕی کەعب لە هەموویان باشتر قورئان دەخوێنێتەوە، زەیدی کوڕی سابت لە هەموویان شارەزاترە بە فەرزەکان، موعازی کوڕی جەبەل لە هەموویان شارەزاترە بە حەڵاڵ و حەرام).

بەشێک لە هاوەڵانیش خۆیان حەزیان دەکرد لە بوارێکی دیاریکراودا پسپۆڕی وەربگرن، هەیانبوو حەزی بەوە بوو زۆرترین فەرموودە وەربگرێت، لەوانەش ئەبووهورەیرە، هەیانبوو حەزی بەوە بوو گرنگی زیاتر بەو زانیارییانە بدات کە ئاماژە بە فیتنە دەدەن، وەک حوزەیفەی کوڕی یەمان.

---

[1] الخطيب البغدادي: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع، مكتبة المعارف – الرياض، ج١، ص ٢٣٦.
[2] الخطيب البغدادي: الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع، مكتبة المعارف – الرياض، ج١، ص ٢٣٧.
[3] صحيح البخاري – كتاب العلم – باب كتابة العلم، الرقم ١١٣.

ئەبووهورەیرە دەیوت: (برا کۆچەریەکانم سەرقاڵی کاری ناوبازاڕ بوون و برا پشتیوانیەکانم سەرقاڵی ئیشیماڵەوە بوون، بەڵام من کەسێکی هەژاری ناو ئەهلی صوففە بووم کە دایم هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بووم، کاتێک ئەوان ئامادە نەبوون، من لەوێ بووم، کاتێک ئەوان بیریان دەرۆیشت من بیرم لای پێغەمبەر(ﷺ) کۆکردبوویەوە، رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (هەرکەس جلەکەی رابخات تا هەموو قسەکەم تەواو بکەم و دواتر کۆی بکاتەوە، ئەوە هەموو ئەوە وەردەگرێت کە دەیڵێم) منیش عەبایەکی سەرشانم هەبوو، بڵاوم کردەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) هەموو قسەکانی کرد، ئینجا نام بە سنگمەوە، ئیتر لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) هیچیم بیرنەچووەتەوە).[1]

حوزەیفەی کوڕی یەمانیش دەیوت: (خەڵکی هەمیشە سەبارەت بە خێر و چاکە پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، بەڵام من سەبارەت بە فیتنە پرسیارم لێدەکرد لە ترسی ئەوەی نەبادا فیتنەم تووش بێت).[2]

ئیبن مەسعوودیش دەیوت: (سوێند بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە جگە لەو، لە قورئاندا هیچ سوورەتێک نیە نەزانم کەی دابەزیوە، هەر ئایەتێکیش دابەزیوە دەزانم لەسەرچی دابەزیوە، ئەگەر کەسێک لە خۆم شارەزاتر بە قورئان شک ببەم دەچم بۆ لای لە هەرکوێ بێت مادەم بکرێت بە وشتر خۆمی پێ بگەیەنم).[3]

**ئەمانەتپارێزی:**

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە گواستنەوەی زانستدا زۆر وریا بوون، بە تەواوەتی خۆیان دەپاراست لەوەی زانیارییەک وەک خۆی نەگەیەنن، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) رێنمایی کردبوون ئەوەی وەریدەگرن وەک خۆی بیگەیەنن، (نَضرَّ اللهُ امْرأَ سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَ ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ)،[4] (خوا

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٩٥و صححه.

[2] صحيح البخاري، الرقم ٣٤٣٠.

[3] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل عبد الله بن مسعود وأمه(ﷺ)، الرقم ٢٤٦٣.

[4] جامع الترمذي - أبواب العلم عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في الحث على تبليغ السماع، الرقم

ئەو کەسە جوان و ڕێزدار بکات کە شتێکی لە ئێمە بیست بەو چەشنەی بیستوویەتی هەروا بیگەیەنێت، چونکە لەوانەیە ئەو کەسەی پێی دەگات جوانتر لێی تێبگات لەوەی بیستوویەتی)، لەمەشدا هاوەڵان جوانترین نموونەیان پێشکەش کرد و ئەوەتا کۆی ئیسلامێک کە ئێمە ئەمڕۆ لەبەردەستماندایە لە هاوەڵانەوە گەیشتۆتە دەستمان، تەنانەت زۆرجار هاوەڵانێک لە ترسی ئەوەی نەبادا هەڵەیەک بکەن لە گواستنەوەی زانیارییەکدا، خۆیان پاراستووە لەوەی قسە بۆ خەڵک بکەن و هەندێک زانیارییان پێ بگەیەنن، بۆ نموونە:

ئەبی خەلدە دەڵێت: مەیموونی کوردی لای مالیکی کوڕی دینار بوو، مالیک پێی وت: ئەوە چیە مامۆستای فەرموودە لە باوکیەوە فەرموودەمان بۆ ناگێڕێتەوە، خۆ باوکی تۆ گەیشتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و فەرموودەی لە بارەوە گێڕاوەتەوە، مەیموونیش وتی: باوکم فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆ نەدەگێڕاینەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا کەم و زیادی تێدا بکات، باوکم دەیوت بیستوومە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار)،[1]

**کارکردن بە زانست:**

خوای گەورە لە قورئاندا ڕێنمایی ئوممەتی کردووە کە هەڵەیە کەسێک شتێک بە خەڵکی بڵێت و خۆی جێبەجێی نەکات، واتە زانست دەبێت کرداریشی لەگەڵدا بێت (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ (٢) كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ)، (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆچی شتێ دەڵێن و ڕەفتاری پێ ناکەن؟،خوا لەلای سەختە، کە شتێ بڵێن و کاری پێنەکەن؟).

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ڕێنمایی هاوەڵانی دەکرد زانست وەربگرن و دواتر کاری پێ بکەن، وەک چۆن ئامۆژگاری حوزەیفەی کوڕی یەمانی کرد (يَا حُذَيْفَةُ ، تَعَلَّمْ كِتَابَ اللهِ ، وَاعْمَلْ بِمَا فِيهِ)، (ئەی حوزەیفە، قورئان فێر ببە و کار بکە بەوەی تیایدایە)، سێ جار بەسەر یەکەوە ئەمەی پێ فەرموو.[2]

٢٦٥٧ و قال حسن صحيح.

[1] المعجم الاوسط للطبراني، الرقم ٦٣٢٢، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٤٧٦.

[2] السنن الكبرى للنسائي - كتاب فضائل القرآن - الأمر بتعلم القرآن والعمل به، الرقم ٢٩٧٩.

بۆیە هاوەڵان کاریان بەو زانستە دەکرد کە وەریاندەگرت نەوەک چەشنی کەسانێک لەمڕۆدا تێربوون لە وەرگرتنی دەقەکان، بەڵام هێشتا دڵ و دەروونیان تینووە بە تێگەیشتنی دروست لەو دەقانە و جەستەشیان تەمبەڵە لە ئاست بەجێگەیاندنیاندا.

ئیبن مەسعوود دەڵێت: (هەرکەس لە ئێمە -هاوەڵان- ئەگەر دە ئایەت فێر ببوایە تێینەدەپەڕاند هەتا جوان لە واتاکانیان تێدەگەیشت و کاری پێ دەکرد).[1]

عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەیوت: (ئەی هەڵگرانی زانست، کار بە زانستەکە بکەن، چونکە زانا کەسێکە کار بە زانستەکەی بکات و کردار و زانستی وەک یەک بن، خەڵکانێک دێن کە زانستیان لە قوڕگیان تێناپەڕێت و کرداریان پێچەوانەی زانستیانە، حاڵی پەنهانییان پێچەوانەی حاڵی ئاشکراو بەرچاویانە، لەنێو کۆڕی زانستدا دادەنیشن و پۆز بەسەر یەکترەوە لێدەدەن، وای لێدێت ئەمیان تووڕە دەبێت لەوی تریان و جێیدەهێڵێت، ئەوانە لەو دانیشتنانەدا کردەوەیان بەرزنابێتەوە بۆ لای پەروەردگار).[2]

ئەبوودەردائیش دەیوت: (زۆرترین شتێک کە لێی دەترسم ئەوەیە لە رۆژی دواییدا پێم بوترێت: شت فێر بوویت، کەچی کارت نەکرد بەوەی فێری بوویت).[3]

**بەخشینەوەی زانست:**

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وێڕای ئەوەی زانستیان وەردەگرت و کاریان پێ دەکرد، هاوکات ئەوەی پێیان بوو بە شێوازی رەوا و گونجاو دەیانبەخشییەوەو رژدییان نەبوو، ئەو بەخشندەییەی ئەوان بوو وردەکارییەکانی پەیامی خوای بەم ئوممەتە گەیاند.

---

[1] الطبري: جامع البيان عن تأويل آي القرآن، الطبعة الأولى، دار هجر، ٢٠٠١م، ج١، ص ٧٤.

[2] مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب التوبيخ لمن يطلب العلم لغير الله، الرقم ٣٩٤.

[3] مصنف عبد الرزاق - كتاب الجامع - باب العلم، الرقم ٢٠٤٦٧.

سەعیدی کوڕی موسەیب کە یەکێکە لە تابعین، دەڵێت: جارێک بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصم وت -کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)-: جاری وا هەیە دەمەوێت سەبارەت بە فەرموودەیەک پرسیارت لێ بکەم، کەچی شەرمت لێ ئەکەم، ئەویش پێی وتم: برازاگیان وا نەکەیت، ئەگەر زانیت زانستێکم لایە، لێم داوا بکە و لەبارەیەوە پرسیارم لێ بکە.[1]

موجاهید کە یەکێکە لە زانا پایەبەرزەکانی بواری تەفسیر و لە تابعینە، دەڵێت: (سێ جار هەموو قورئانم لای ئیبن عەبباس خوێندووە هەر لە دەستپێکیەوە تا کۆتایی، لەسەر هەر ئایەتێک دەمووەستاند و لەبارەیەوە پرسیارم لێدەکرد).[2]

**هەموو زانیارییەك بە هەموان ناوترێت:**

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی گەیاندنی زانست لای هاوەڵان ئەوە بووە کە بەپێی تێگەیشتن و ئاستی وەرگرتنی خەڵک زانیارییان بەخشیوەتەوە، واتە کەسێکی شارەزا و خاوەن بەهرەیان لە کەسێکی نەخوێندەوار و نەشارەزا جیاکردۆتەوەو بۆ هەرکامیان جۆرێک زانیارییان گەیاندووە.

ئیبن مەسعوود دەیوت: (ئەگەر قسەیەک بۆ خەڵک بکەیت کە لە ئاست عەقڵیاندا نەبێت، ئەوە دەبێتە هۆی فیتنە بۆ هەندێکیان).[3]

عەلی کوڕی ئەبووطالیبیش دەیوت: (بەوجۆرە خەڵکی بدوێنن کە تێدەگەن، مەگەر پێتان خۆشە خوا و پێغەمبەرەکەی بەدرۆ بزانرێن؟!)[4]

ئەبووهورەیرەش دەیوت: (دوو جام زانستم لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەبەرکردووە، جامێکیانم بڵاوکردۆتەوە، ئەوی تریان ئەگەر باسی بکەم گەردنم دەبڕدرێت).[5]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند العشرة المبشرين بالجنة وغيرهم - مسند أبي إسحاق سعد بن أبي وقاص، الرقم ١٥٠٨.

[2] الطبري: جامع البيان عن تأويل آي القرآن، الطبعة الأولى، دار هجر، ٢٠٠١م، ج١، ص ٨٥

[3] صحيح مسلم - مقدمة - باب النهي عن الحديث بكل ما سمع، الرقم ٥.

[4] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب من خص بالعلم قوما دون قوم كراهية أن لا يفهموا، الرقم ١٢٧.

[5] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب حفظ العلم، الرقم ١٢٠.

**لە هەموو بابەتێك نەدواون:**

هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئەگەرچـی زۆر لایـان گرنـگ بـوو ئـەو زانسـتەی پێیانـە بیگەیەنـن، بـەڵام زۆر خۆیـان دەپاراسـت لـە قسـەکردن سـەبارەت بە شتێک کە بچووکترین گومانیان لێی هەبوایە، یاخود فەتوادان لـە هـەر پـرس و بابەتێکدا.

عوبەیدی کوڕی جورەیج دەڵێت: رۆژێک لە مەککە لە کۆڕی عەبدوڵای کوڕی عومـەردا دانیشـتم، چەنـدە پرسـیار لـە ئیبـن عومـەر دەکرا، زۆرتریـن وەڵامەکانـی ئـەوە بـوو دەیـوت: هیچـی لەبـارەوە نازانـم.[1]

خەڵکانێـک سـەبارەت بـە مەسـەلەیەکی هاوسـەرگیری پرسیاریان لـە ئیبـن مەسـعوود کـرد و داوای فەتوایـان لێکـرد، ئەویـش پێـی وتـن: بچـن بـۆ لای کەسـێکی تـر جگـە لـە من، ئەوانیـش وازیـان لـێ نەهێنـا، مـاوەی یـەک مانـگ بەردەوام دەهاتـن بۆ لای، دواجـار بـەوە رازییـان کـرد وەڵامیـان بداتـەوە پێیـان وت تـۆ لـە گـەورە هاوەڵانیت، لـە تـۆ نەپرسـین لـە کـێ بپرسـین، جگـە لـە تـۆ کەسـی ترمـان دەسـتناکەوێت، ئینجـا بـە ناچـاری پێـی وتـن: رای خـۆم لـەو بـارەوە دەڵێـم، ئەگـەر راسـت بـوو ئـەوە لـە خـوای تەنهـای بـێ هاوەڵەوەیـە، ئەگەریش هەڵـە بوو ئـەوە لـە خـۆم و لـە شـەیتانەوەیە و خـواو پێغەمبەرەکـەی لێـی بـەدوورن.[2]

---

[1] مسند الدارمي – مقدمة المؤلف – باب من هاب الفتيا وكره التنطع والتبدع، الرقم ١٥٧.

[2] سنن النسائي – كتاب النكاح – باب إباحة التزوج بغير صداق، الرقم ٣٣٦٠.

# ژیانی ئابووری هاوەڵان

سەبارەت بە ژیانی ئابووری هاوەڵان پێویست دەکات توێژینەوەی ورد و فراوان ئەنجام بدرێت، چونکە وەک پێشتر ئاماژەمان پێداوە، ئەوانە دەستپەروەردەی کەسێک بون کە خوای گەورە رازی بووە سەرمەشقی هەموومان بێت، ئێمە تەنها لێرەدا چەند سەرەقەڵەمێک لەسەر بابەتەکە دەخەینەڕوو، چونکە نووسینەکەمان بۆ مەنهەجە و مەبەستمانە زۆر بە کورتی زانیارییەکی سەرەتایی لە بوارەکەدا بخەینەبەردەستی خوێنەرانی ئازیز هەتا دەروازەیەک بێت بۆ بەدواداچوونی زیاتر.

هاندان بۆ ئیشکردن:

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر بنەمای ئیشکردن گۆش کرابوون، واتە هەرکەسەو لەسەر پێی خۆی بوەستێت و سەرقاڵی پیشەیەک بێت و نەبێت بە بار بەسەر کۆمەڵگەوە، بەم چەشنە هەم دەستی بێکاری لەناویاندا نەدەما، هەم سەرپێخستنی وڵات لەسەر دەستیان دەهاتەدی، بۆیە لەنێو ژیانی هاوەڵاندا هەمەچەشنەی کار و پیشەکانی ناو کۆمەڵگە بەدیدەکەین، وەک بازرگانی و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ئاسنگەری و چنین و ..هتد.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی بە هاوەڵان کرد و ئەم فەرمانەش بۆ موسڵمانانی دواتر مایەوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٩) فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠)، (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێک ڕۆژی هەینی بانگدرا بۆ نوێژ جا ئێوە بە پەلە بچن بە دەم زیکری خواوەو،

واز لـە هەمـوو کڕین و فرۆشتنێک بێنن ئـەو خۆ ئامادەکردنەتـان بـۆی چاکترە بۆتان، ئەگەر بزانن و دەرکی راستیی بکەن،جا کە نوێژەکە تەواوبوو، بڵاو ببنەوە بەڕووی زەویدا وە داوای ڕزق و رۆزیی و بەهـرەی خـوا بکـەن و هەوڵـی ڕۆزی بدەن و هەمـوو هۆیەکی ڕۆزی بدەنـە بـەر، بێگومـان خوایش یارمەتـی دەرتانـە و یادی خـوا زۆر بکـەن بـەو ئومێدە بەختیارو سـەرفراز بن).

پیشـەی پێغەمبەران ئەوە بووە کە لەپاڵ بانگەوازەکەیاندا، ئیشیان کردووەو بژێوی ژیانـی خۆیـان و خاوخێزانیـان دەرهێنـاوە، وەک لـە فەرمـوودەدا هاتـووە کە سـەرجەمی پێغەمبەران شـوانێتییان کردووە، (مَا بَعَثَ اللهُ نَبِيًّا إِلَّا رَعَى الْغَنَمَ . فَقَالَ أَصْحَابُهُ : وَأَنْتَ ، فَقَالَ : نَعَمْ ، كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لِأَهْلِ مَكَّةَ)[1] (خـوای گـەورە هـەر پێغەمبەرێکـی نـاردووە، -ئـەو پێغەمبـەرە- شـوانێتی مـەڕو ماڵاتـی کـردووە) هـاوەڵان وتیـان تۆیش؟ فەرمـووی (بەڵێ، من لـە بەرامبـەر چەند قیراتێ مـەڕو ماڵاتم دەلەوەڕاند بۆ خەڵکی مەککە).

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وەک هاندانێک بۆ ئیشکردن بـە هاوەڵانـی دەفەرمـوو (مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ ، خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ)،[2] (ئادەمیـزاد هیـچ خواردنێـک ناخـوات باشـتر بێـت لـە خواردنێـک کـە بەرهەمـی دەسـتی خـۆی بێـت، واتـە بـە ڕەنجەشـانی خـۆی پەیدای کردبێت، پێغەمبـەر داوودیش لـە بەرهەمـی دەسـتی خـۆی دەخـوارد).

جارێک یەکێک لـە هـاوەڵان بە خێرایی دای بە لای پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ)، هاوەڵانـی دەوری خۆشەویسـت کـە بینییـان کابـرا بـەو خێراییـە بـەدەم ئیشـەکەیەوە دەڕوات، سەرسـامی ئـەو گـورج و گۆڵـی و گەرموگوڕییـەی بوون، ئینجـا ڕووی دەمیـان لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کرد و وتیان: ئای، چۆن ئەبوو ئەگـەر ئـەم گورجوگۆڵییـەی لەپێنـاو خـوادا بوایـە! پێغەمبـەری خوایـش(ﷺ) خێـرا تێگەیشـتنەکەی بـۆ ڕاسـت کردنـەوەو فەرمـووی:

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الإجارة - باب رعي الغنم على قراريط، الرقم ٢٢٦٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب كسب الرجل وعمله بيده، الرقم ٢٠٧٢.

(إِنْ كَانَ خَرَجَ يسْعَى عَلَى وَلَدِهِ صِغَارًا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ يسْعَى عَلَى أَبَوَيْنِ شَيْخَيْنِ كَبِيرَيْنِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَإِنْ كَانَ يسْعَى عَلَى نَفْسِهِ يُعِفُّهَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ رِيَاءً وَمُفَاخَرَةً فَهُوَ فِي سَبِيلِ الشَّيْطَانِ)،[1]

(ئەگەر ئەم دەرچوونەی بۆ ئەوە بێت شتێک پەیدا بکات بۆ منداڵە بچووکەکەی، ئەوە دەرچوونەکەی لەپێناو خوادایە، ئەگەریش دەرچوونەکەی بۆ ئەوەبێت شتێک پەیدا بکات بۆ دایک و باوکێکی بە تەمەنی، دیسان ئەو دەرچوونەی لەپێناو خوادایە، ئەگەریش دەرچوونەکەی بۆ ئەوەبێت شتێک پەیدا بکات هەتا خۆی بە خاوێنی بهێڵێتەوەو تووشی حەرام نەبێت، هەمدیس ئەو دەرچوونەی لەپێناو خوادایە، ئەگەریش دەرچوونەکەی بۆ رووپامایی و کەش و فش بێت ئەوە لەپێناو شەیتاندایە).

پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی فێر دەکرد، شەرم نەکەن لە هەر ئیشێکی ڕەوا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بەری ڕەنجی خۆیان بخۆن و داوا لە خەڵک نەکەن، بۆیە ڕێنمایی دەکردن و دەیفەرموو (لَأَنْ يحْتَطِبَ أَحَدُكُمْ حُزْمَةً عَلَى ظَهْرِهِ ، خَيرٌ مِنْ أَنْ يسْأَلَ أَحَدًا ، فَيُعْطِيَهُ أَوْ يمْنَعَهُ)،[2] (ئەگەر یەکێکتان بنەوێت لە گوریسێک و کۆڵێک دار بدات بە کۆڵیا، زۆر بۆی باشترە لەوەی داوا لە هیچ کەسێک بکات، ئیتر ئەو کەسە یان شتێکی پێ دەدات، یان دەست بە روویەوە دەنێت).

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هاوەڵە پشتیوانیەکان ماڵ و داهاتی خۆیان برابەش دەکرد لەگەڵ هاوەڵە کۆچەرییەکاندا، هاوەڵە پشتیوانیەکان بژاردەیەکیان خستە بەردەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتیان: دارخورماکانمان لەنێوان ئێمە و برا کۆچەرییەکانماندا دابەش بکە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕازی نەبوو، چونکە هاوەڵانی خۆی لەسەر تەمبەڵی و مشەخۆریی فێر نەکردبوو، پشتیوانان لەمە تێگەیشتن و ئەمجار

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٨٢، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ١٤٢٨.

[2] صحيح البخاري، كتاب البيوع، باب كسب الرجل و عمله بيده، الرقم ٢٠٧٤.

هەوڵیان دا هەلی کاریان بۆ بدۆزنەوە، بۆیە پێشنیاری دووەمیان کرد و وتیان: دەی لە ئیشوکاردا هاوکاریمان بکەن، ئێمەش لە بەرهەمدا بەشدارتان ئەکەین، ئینجا هاوەڵە کۆچەرییەکان بەم بڕاردەیان ڕازیی بوون.[1]

هاوەڵە ئافرەتەکانیش وێڕای سەرقاڵییان بە ئەرک و بەرپرسیارێتیی خێزانییەوە، لە کاروباری دەرەوەش هاوکاری هاوسەرەکانیان دەبوون، یاخود سەرمایەیەکیان بۆ خۆیان پێکەوە دەنا، جوانترین نموونەش دوو هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوون، خەدیجەی هاوسەری یەکەمی کە ئافرەتێکی سەرمایەدار و بازرگان بوو، زەینەبی هاوسەریشی لە ماڵەوە ئیشی دەستی دەکرد و دواتر لە بازاڕ دەیفرۆشتەوە و داهاتەکەشی لە ڕێی خوادا دەبەخشی.[2]

عومەری کوڕی خەططاب دەیوت (إِنِّي لأرَى الرجل فَيُعْجِبنِي فَأَقُول هَل لَهُ حِرْفَة فَإِن قَالُوا لَا سقط من عَيْني)،[3] (جاری وا هەیە کەسێک دەبینم پێی سەرسام دەبم، دواتر دەپرسم ئەرێ هیچ پیشەیەکی هەیە؟ دەڵێن: نا، ئیتر کابرا لەبەرچاوم بچووک ئەبێتەوە).

**بەخشین لە سامان**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی فێر دەکرد چەندە هەوڵی دەستخستنی سامان دەدەن، هێندەش خۆ بپارێزن لە حەز و تامەزرۆیی کۆکردنەوەی پارە و هەتا دەتوانن تیایدا بەخشندە بن، چونکە دەردی خۆشەویستی پارە ناوەستێت هەتا مرۆڤ نەگەیەنێتە چروکی، چرووکیش یەکێکە لە خراپترینی دەردەکان کە ئادەمیزاد تووشی دەبێت.

خوای گەورە لە بارەی بەخشینەوە دەفەرموێت (مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ

[1] صحيح البخاري، كتاب الحرث والمزارعة، باب إذا قال اكفني مؤونة النخل وغيره وتشركني في الثمر، الرقم ٢٣٢٥.

[2] صحيح مسلم ، كتاب فضائل الصحابة ، باب من فضائل زينب، الرقم ٢٤٥٢.

[3] ابن الجوزي: غريب الحديث، ج١، ص ٢٠٥.

وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ)، (نمونەی ئەو کەسانەی کە دارایی خۆیان لە ڕێگەی خوادا دەبەخشن، هەر وەکو دانە تۆمێکە کەحەوت گوڵ دەردەکا و هەر گوڵەی سەد دانەی تێدا بێ، کەوابوو تەنها دانە تۆمێک (٧٠٠) دەنکی پێوە دەبێ، بۆ هەرکەسیش خوا خۆی بیەوێ چەند بەرامبەر پاداش دەدا چونکە خوا بەخششی یەکجار فراوانە، زۆر ئاگاو زانایە).

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) دەفەرموێت (مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ)،[1] (هیچکات خێرو بەخشین، لە ماڵ و سامان کەم ناکاتەوە).

پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بە هاوەڵانی دەفەرموو (الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، فَالْيَدُ الْعُلْيَا هِيَ الْمُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى هِيَ السَّائِلَةُ)،[2] (دەستی بەرز و باڵا زۆر باشترە لە دەستی نزم، جا دەستی بەرز ئەو دەستەیە کە دەبەخشێت، دەستی نزمیش ئەو دەستەیە کە داوا دەکات).

ئەبووزەری غیفاری دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووم، چاوی کەوت بە کێوی ئوحود، فەرمووی (مَا أُحِبُّ أَنَّهُ تَحَوَّلَ لِي ذَهَبًا، يَمْكُثُ عِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ دِينَارًا أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ)، (پێم خۆش نیە ئەو کێوە بۆم ببێت بە زێڕ و سێ شەو بەسەرمدا تێبپەڕێت و یەک دینارم لا بمێنێتەوە، مەگەر دینارێک کە بۆ دانەوەی قەرز لێی بهێڵمەوە)، پاشان فەرمووی (إِنَّ الأَكْثَرِينَ هُمُ الأَقَلُّونَ، إِلاَّ مَنْ قَالَ بِالْمَالِ هَكَذَا وَهَكَذَا، وَقَلِيلٌ مَا هُمْ)،[3] (ئەوانەی لە دنیادا ماڵ و سامانی زۆریان هەیە، لە ڕۆژی دواییدا پلە و مەنزڵیان زۆر کەمترە، مەگەر ئەوانەی هێندە بەخشندە بن بە ڕاست و چەپدا ببەخشن، ئەو جۆرە کەسانەش زۆر کەمن)

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەگێڕێتەوە جارێک مەڕێکیان سەربڕی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (چی لێ ماوەتەوە؟) عائیشەش وتی: تەنها

---

[1] صحيح مسلم، كتاب البر والصلة، الرقم ٢٥٨٨.

[2] صحيح البخاري، كتاب الزكاة، باب لا صدقة إلا عن ظهر غنى، الرقم ١٤٢٩.

[3] صحيح البخاري، كتاب الاستقراض، الرقم ٢٣٨٨.

شانەکەی ماوەتەوە، چونکە هەموو گۆشتەکەی تریان بەخشیبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (بَقِيَ كُلُّهَا غَيْرُ كَتِفِهَا)، (هەمووی ماوەتەوە تەنها شانەکەی نەبێت)،[1] مەبەستی ئەوەبوو کە هەموو ئەوەی بەخشیویانە، پاداشتەکەی لای خوایە و نەفەوتاوە.

جارێک عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف نیوەی سامانی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە نیوەی سامانەکەمەو هێناومە بۆت و نیوەکەی تریم بۆ ماڵ و منالّم هێشتوەتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بارک الله لک فیما أعطیت و ما أبقیت)، (خوا بەرەکەت بخاتە ئەوەی بەخشیوتەو ئەوەشی هێشتووتەتەوە)، دووڕووەکان بە لاچاو و تانەوە سەیریان دەکرد و دەیانوت بەس لەبەر رووپامایی و حەزی ناوبانگ بەخشیویەتی، ئینجا یەکێک لە موسڵمانە هەژارەکان هات کە ناوی حەبحاب بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئەمڕۆ بە دوو بەش خورما کرێکاریم کردووە، بەشێکیم (مشتێک) داناوە بۆ ماڵ و منداڵم و ئەم مشتەشم هێناوە، دووڕووەکانیش بە لاچاو سەیریان دەکرد و تانەیان لێدەدا و وتیان خوا و پێغەمبەرەکەی پێویستیان نیە بە مشتەکەی ئەبی عەقیل، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند(الذین یلمزون المطوعین من المؤمنین في الصدقات والذین لا یجدون الا جهدهم فیسخرون منهم سخر الله منهم ولهم عذاب الیم)،[2] ئەوەش وەڵامێک بوو بۆ دووڕووەکان.[3]

**ئیسار لای هاوەڵان**

خوای گەورە دەفەرموێت:

(لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَينْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يحِبُّونَ

[1] سنن الترمذی، أبواب صفة القیامة والرقائق والورع عن رسول الله، الرقم ٢٤٧٠.

[2] التوبة: ٧٩.

[3] معرفة الصحابة لأبي نعیم الأصبهاني، الرقم ٢٠٧٨.

﴿مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩)﴾.

(ئەو فەیئو دەستکەوتەیە بۆ ئەو هەژارە دوورە وڵات و کۆچکردووانەیە لە خانوو و سامانی خۆیان دەرکران لەلایەن مەککەییەکانەوە، داوای چاکەو ڕەزامەندیی لە خوا دەکەن و یارمەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدەن بۆیە کۆچیان کرد. ئا ئەوانەن ڕاستگۆکان لە باوەڕو جیهادیاندا، ئەو کەسانەش کە نیشتەجێی (دار الهجرة)و (دارالإیمان) ببوون، واتە: پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچەرییەکان، کۆچەرییەکانیان خۆش دەوێن و بەشێک لە دارایی خۆیانیان دەدەنێ و دڵخۆشیان دەکەن و هیچ شتێکیان لە دڵدا نیە سەبارەت بەوەی بە کۆچەرییەکان درا و ئیساری کۆچەرییەکان دەکەن بەسەر خۆیاندا لە سەروەت و ساماندا، ئەگەرچی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێ و هەژاربن، هەرکەسێ لە سیفەتی ڕژدی دەروونی بپارێزرێ، ئەوانەن برەوەکان).

لە کاتی برایەتی نێوان کۆچەران و پشتیوانانیدا، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە برای سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری، سەعد کەسێکی دەوڵەمەند بوو، بە عەبدوڕەحمانی وت: ماڵ و سامانەکەم لەگەڵ جەنابتا دەکەم بە دوو بەشەوەو نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆ من، ژنت بۆ دێنم، عەبدوڕەحمان هەڵوێستی برا پشتیوانییەکەی بەرز نرخاند و فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و خێزان و سامانتەوە، ڕێی بازاڕم نیشان بدەن، کە ڕێی نیشان درا، دەستی کرد بە ئیش و بە دەستبەتاڵی دانەنیشت،[1] عەبدوڕەحمان هێندە دەوڵەمەند بوو هەتا بوو بە سەرمایەدارێکی گەورەی مەدینە، ئینجا بوو بە دەستبارێک بۆ خەڵکی ئەو شارە و یارمەتی دەدان و باری سەرشانی سووک دەکردن، وەک تەلحەی کوڕی دەڵێت: خەڵکی مەدینە سێ بەش بوون: بەشێکیان

---

[1] صحيح البخاري، كتاب البيوع ، باب ما جاء في قول الله تعالى فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض، الرقم ٢٠٤٩.

قەرزیان لە عەبدوڕەحمان وەردەگرت، بەشێکیان لەلایەن عەبدوڕەحمانەوە قەرزیان بۆ دەدرایەوە، خۆیشی یارمەتیی بەشێکیانی دەدا.[1]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: کۆچەرییەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ قەومێکمان نەدیوە وەک ئەمانەی هاتوین بۆ لایان (واتە پشتیوانان) هێندە جوان دڵنەوایی خەڵک بکەن و بەو زۆرییە ببەخشن، ئەوان پێویستی ئێمەیان پڕکردۆتەوەو بەشداریان کردوین لە ماڵ و حاڵیشدا، وامان لێهاتووە وادەزانین هەرچی پاداشت هەیە بردوویانە بۆ خۆیان و بەشی ئێمەیان نەهێشتۆتەوە، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی (لَا، مَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِمْ وَدَعَوْتُمُ اللهَ [عَزَّ وَجَلَّ] لَهُمْ).[2] (نەخێر، ئێوەش پاداشتتان بۆ هەیە مادەم دەستخۆشی و سوپاستان هەبێت بۆیان و بە دۆعای خێر لە خوا بپاڕێنەوە بۆیان).

جارێک عومەری کوڕی خەططاب لە سەردەمی خیلافەتەکەیدا ویستی چەند هاوەڵێک لە رووی ماددیەوە تاقی بکاتەوە، دواتر لووتکەی ئیساری لە هەرکامیاندا بەدیکرد، بەسەرهاتەکەش بەم چەشنە بوو:

چوارسەد دیناری خستە ناو توورەکەیەکەوەو بە خزمەتکارەکەی وت: بیبە بۆ ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح و ماوەیەک لەلای بمێنەرەوە بزانە چی بە پارەکە دەکات، ئەویش چوو بۆ لای و وتی: ئەمیری باوەڕداران ئەمەی بۆ ناردویت هەتا هەندێک پێویستی خۆتی پێ دابین بکەیت، ئەویش نزای خێری بۆ کرد و خزمەتکارەکەی بەردەستی خۆی بانگ کرد و کەوتە بەخشینەوەی، دەیوت: ئەم حەوت دینارە ببە بۆ فڵانەکەس، ئەوەیان ببە بۆ فڵانەکەس، بەو چەشنە هەمووی بەخشیەوەو هیچی بۆ خۆی نەهێشتەوە، خزمەتکارەکەی عومەر گەڕایەوەو بابەتەکەی بۆ باسکرد، ئینجا عومەر توورەکەیەکی بۆ موعازی کوڕی جەبەلیش ئامادە کردبوو و بە هەمان

---

[1] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ط الرسالة، ج١، ص ٨٨.

[2] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٢٧٥، مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الأدب - في الثناء الحسن، الرقم ٢٧٠٤١.

خزمەتکاردا بۆی نارد و رایسپارد چاودێری ئەویش بکات، موعازیش چەشنی ئەبووعوبەیدە هەمووی بەخشیەوەو هیچی لێ هەڵنەگرت بۆ خۆی، تەنها دوو دینار مابوویەوە، ژنەکەی موعاز هاتەدەرەوەو وتی: ئەی ئێمە، بەخوا ئێمەیش هەژارین، موعازیش ئەو دوو دینارەی پێدا، کاتێک خزمەتکارەکە گەڕایەوەو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، عومەر دڵخۆش بوو و وتی: ئەوانە بران و پێکەوە برایەتی دەکەن.[1]

**هاوسەنگی نێوان ئیش و کار و پەرستشەکان:**

خوای گەورە دەفەرموێت:

(فِي بيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ (٣٦) رِجَالٌ لَا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ (٣٧) لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَنْ يشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ)،

(لە ناو چەند ماڵ و مزگەوتێکدا خوا مۆڵەتی داوە کە دەستی ڕێزیان لە بان بێ، ئەو مزگەوتانەش دەبێ تەنها لەسەر ناوی ئەو بینا بکرێن، تا ببنە مەنارەی هیدایەت و تیشکی ڕۆحیی وە دەبێ تەنها ناوی ئەویان تیا ببرێت بە بەیانیی و ئێوارانداا، نوێژو ستایش و تەسبیحاتی پاکی ئەو دەکەن،پیاوانێک بازرگانیی و کڕین و فرۆش، لەیادی خواو لە بەرپاکردنی نوێژو بەخشینی زەکات غافڵیان ناکا، واتە: لەلایەکەوە هەردەم خەریکی پەیداکردنی ژیان و ژیوارن و، لەلایەکی تریشەوە یادی خوا دەکەن و، هەرکات بانگ گوترا، ئەوان بەپەلە دەڕۆن بەدەم نوێژەکانیانەوە، وە هەرکاتێکیش زەکاتیان کەوتە سەر، بەخێرایی جێبەجێی دەکەن لە ڕۆژێک دەترسن کە دڵ و چاو تێیدا گش ئەگەڕێن و وەر دەچەرخێن، واتە: لە ڕۆژێ ئەترسن ئاخۆ لە چ لایەکەوە فریشتەی سزا بیانگرن و، نامەیان چۆن بدرێتێ؟،بەردەوام ئابەو شێوەیە سەرگەرمی خواپەرستین، تا خوا لەبەرامبەر کردەوەکانیانەوە

[1] ابن عساكر: تاريخ دمشق، ج٥٨، ص ٤٣٦.

بەچاکترین شێوە پاداشیان بداتەوە وە لە فەزڵی خۆی بۆیان زیادکا، واتە: لەو نیعمەتانەی کە ئەمان نایزانن و تەنها خوا خۆی دەیزانێ بەهرەمەندیان بکا وە خوا بە هەرکەسێک خۆی بییەوێ و حەز بکا، رۆزی بێ ژمارەی دەداتێ).

هەروەها دەفەرموێت (وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا)، (لە خوا بترسە.. هەوڵ بدە لەو ماڵ و دارایيەی کە خوا پێی بەخشیویت ئەو دونیای خۆت ڕۆژی دوایی پێ بە دەست بێنە بەش و بارەی حەلاڵی خۆیشت لەم دونیایە لەبیر مەکە «واتە: بەشی خۆت لە حەلال و زەلاڵ رابوێرە»).

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: کابرایەک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: فلانەکەس دارخورمایەکی هەیە و منیش دیوارەکەم رێکی ئەوێیە، بەڵکو پێی بڵێیت ئەو دارخورمایە بدات بە من، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە کابرا کرد دارخورماکەی پێ بدات، کەچی کابرا رازی نەبوو، ئینجا ئەبوودەحداح هات و بە کابرای وت: ئەو یەک دارخورمایەم پێ بفرۆشە بەرامبەر بە باخەخورماکەی من، کابرایش رازی بوو، ئینجا ئەبوودەحداح هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: من ئەو دارخورمایەم بەرامبەر بە باخەخورماکەی خۆم کڕیوەو ئێستاش دارخورماکە دەدەمە دەست جەنابت و بیدە بەو کابرایەی داوای کرد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) موژدەی پێ دا کە لە بەهەشتدا بە دارخورما پاداشت دەدرێتەوە، ئەبوودەحداح خێرا چوویەوە بۆ ماڵەوەو بە ژنەکەی وت: هەستە باخەکە جێبهێڵە، من ئەم باخەم فرۆشتووە بە دارخورمایەک لە بەهەشتدا، ژنەکەیش بێ هیچ بۆڵە و نارەزاییەک وتی: قازانجێکی چاکە.[1]

ئەم ژیانە، هەرچەندە کەمە، بەڵام لەخشتەبەرە، ئەودنیاش هەرچەندە

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب البیوع - النهي عن بیع الحب حتی یشتد وعن بیع العنب حتی یسود وعن بیع التمر حتی یحمر ویصفر، الرقم ۲۲۰۷ و صححه ووافقه الذهبي.

هەمیشەییە، بەڵام لەبەرچاوان نیە، کەسی ژیر و فامیدەی دەوێت، لە مامەڵەی نێوان دوو ژیاندا، لە هەردووکیان پشکی خۆی بپچڕێت.

**جۆرەکانی کار و چالاکی ئابووری هاوەڵان:**

**بازرگانی:**

بە گشتی ژمارەیەک لە هاوەڵانی مەککە بە هۆی هەڵکەوتەی ئابووری شاری مەککەوە، شارەزاییەکی باشیان هەبوو لە کاری بازرگانیدا، کە چوونە مەدینە، سەیریان کرد بازرگانی شارەکە بەدەستی جولەکەکانە، خێرا نەوینە بواری بازرگانی و هەوڵیاندا جڵەوی ئەو بوارەش بگێڕنەوە بۆ موسڵمانان، ئەمەش بە ئیشکردن نەوەک زۆر و دەست بەسەرداگرتن.

نموونەی ئەوانەش عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو کە کاتێک هاتە مەدینە، هیچی لەگەڵ خۆی نەهێنا، چونکە بێباوەڕانی قوڕەیش دەستیان گرتبوو بەسەر سەرمایەی موسڵماناندا، بە دەستی بەتاڵەوە چوویە بازاڕ و دەستیپێکرد،[١] بەرەبەرە دەستی دایە کاری بازرگانی، سەرمایەکەی بە چەشنێک زیادی کرد کە لە ماوەیەکی کەمدا سەرمایەکەی گەیشتە هەشت هەزار دینار، دواتر گەیاندنیە هەشتا هەزار دینار، پاش ماوەیەک گەیشتە هەشتا هەزار دینار، وای لێهات دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ جیهادی ڕێی خودا سەدان ئەسپی دەبەخشی، لە دواییەکانی تەمەنیدا گەیشتە ئەوەی هەزار و پێنج سەد وڵاخی بۆ جیهادی ڕێی خوا تەرخان کرد.[٢]

ئەبولمینهال دەڵێت: پرسیارم کرد لە هەریەک لە بەرائی کوڕی عازب و زەیدی کوڕی ئەرقەم سەبارەت بە گۆڕینەوە، ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بازرگان بووین..[٣]

[١] صحيح البخاري، كتاب البيوع ، باب ما جاء في قول الله تعالى فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض، الرقم ٢٠٤٩.

[٢] ابن الجوزي: صفة الصفوة، ج١، ص ١٣٣.

[٣] صحيح البخاري – كتاب البيوع – باب التجارة في البر، الرقم ٢٠٦١.

هەمیشـەییە، بـەڵام لەبەرچـاوان نیـە، کەسـی ژیـر و فامیـدەی دەوێـت، لـە مامەڵـەی نێـوان دوو ژیانـدا، لـە هەردووکیـان پشـکی خـۆی بپچڕێـت.

**جۆرەکانی کار و چالاکی ئابووری هاوەڵان:**

**بازرگانی:**

بـە گشـتی ژمارەیـەک لـە هاوەڵانـی مەککـە بـە هـۆی هەڵکەوتـەی ئابـووری شـاری مەککـەوە، شـارەزاییەکی باشـیان هەبـوو لـە کاری بازرگانیـدا، کـە چوونـە مەدینـە، سـەیریان کـرد بازرگانـی شـارەکە بەدەسـتی جوولەکەکانـە، خێرا نەوینـە بـواری بازرگانی و هەوڵیاندا جڵـەوی ئـەو بـوارەش بگێڕنـەوە بۆ موسـڵمانان، ئەمـەش بـە ئیشـکردن نـەوەک زۆر و دەسـت بەسـەرداگرتن.

نموونـەی ئەوانـەش عەبدوڕەحمانـی کـوڕی عـەوف بـوو کـە کاتێـک هاتـە مەدینـە، هیچـی لەگـەڵ خـۆی نەهێنـا، چونکـە بێباوەڕانـی قوڕەیـش دەسـتیان گرتبـوو بەسـەر سـەرمایەی موسـڵماناندا، بـە دەسـتی بەتاڵـەوە چوویـە بـازاڕ و دەسـتیپێکرد،[1] بەرەبـەرە دەسـتی دایـە کاری بازرگانـی، سـەرمایەکەی بـە چەشـنێک زیـادی کـرد کـە لـە ماوەیەکی کەمدا سـەرمایەکەی گەیشـتە هەشـت هـەزار دینـار، دواتـر گەیاندنیـە هەشـتا هـەزار دینـار، پـاش ماوەیـەک گەیشـتە هەشـتا هـەزار دینـار، وای لێهـات دوای وەفاتـی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ جیهادی ڕێـی خـودا سـەدان ئەسـپی دەبەخشـی، لـە دواییەکانی تەمەنیدا گەیشـتە ئـەوەی هـەزار و پێنـج سـەد وڵاخـی بـۆ جیهـادی ڕێـی خـوا تەرخـان کـرد.[2]

ئەبولمینهـال دەڵێـت: پرسـیارم کـرد لـە هەریـەک لـە بەڕائـی کـوڕی عـازب و زەیـدی کـوڕی ئەرقـەم سـەبارەت بـە گۆڕینـەوە، ئەوانیـش لـە وەڵامـدا وتیـان: ئێمـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) بـازرگان بوویـن..[3]

[1] صحيح البخاري، كتاب البيوع ، باب ما جاء في قول الله تعالى فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض، الرقم ٢٠٤٩.

[2] ابن الجوزي: صفة الصفوة، ج١، ص ١٣٣.

[3] صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب التجارة في البر، الرقم ٢٠٦١.

**کشتوکاڵ:**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا ، فَيَأْكُلَ مِنْهُ طَيرٌ ، أَوْ إِنسَانٌ ، أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلاَّ كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)،[1] (هەر موسڵمانێک دارێک بنێژێت، یان بەرهەمێک بچێنێت، ئیتر باڵندەیەک یان ئادەمیزادێک یان ئاژەڵێک لەو دار و بەرهەمە بخوات، ئەوا بەوهۆیەوە صەدەقەی بۆ دەنووسرێت ).

ئەمە وایدەکرد هاوەڵان گرنگیەکی زۆر بدەن بە کشتوکاڵ، لەوەشدا بیریان لای پاداشتی قیامەتیش هەبێت، نموونەکەی ئەبوودەحداحیش جوانترین نموونەیە کە لە یەکێک لە باخەکانیدا خاوەنی شەش سەد دارخورما بوو و هەمووی لە رێی خوادا بەخشی.[2]

بە شێوەیەکی گشتی پشتیوانان لە مەدینەدا سەرقاڵی کشتوکاڵ بوون، لەکاتێکدا جوولەکەکانی شارەکە جڵەوی بوارە بازرگانییەکەیان گرتبوویەدەست تا ئەو کاتەی کۆچەران هاتنە شارەکە و توانییان جڵەوی ئەو بوارەش بگرنەوەدەست.

جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: پوورم تەڵاق درا، ئیتر سەرقاڵ بوو بە کشتوکاڵی خورماوە، پیاوێک سەرکۆنەی کرد لەسەرئەوەی بچێتە دەرەوەو سەرقاڵ بێت بەو ئیشانەوە، ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش رێی پێدا و رێنموونیشی کرد خێر و بەخشش بکات لە دەستکەوتی کارەکەیدا.[3]

**ئاژەڵداری:**

بەشێک لە هاوەڵان سەرقاڵی ئاژەڵداری بوون، چ لە هاوەڵە کۆچەرییەکان و چ لە پشتیوانان، جاری وا هەبوو هێندە ئەرکیان زۆر بوو کە دەبوو ئافرەتەکانیش هاوکاریان بن، بۆ نموونە ئەسمائی کچی ئەبووبەکر لە

[1] صحيح البخاري - كتاب الحرث والمزارعة - باب فضل الزرع والغرس إذا أكل منه، الرقم ٢٣٢٠.

[2] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧٦٤.

[3] صحيح مسلم - كتاب الطلاق - باب جواز خروج المعتدة البائن والمتوفى عنها زوجها في النهار لحاجتها، الرقم ١٤٨٣.

ئاڵفدانی ئاژەڵ و ئاوڕاکێشان و چنینەوەی بەربوومدا هاوکاری زوبەیری هاوسەری بوو.[1]

زۆری ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی لە دەقەکاندا هاتون ئاماژەن بە ئاستی گرنگیدان بە بواری ئاژەڵداری، بەڵکو ئەو بەرهەمە ئاژەڵییانەش کە هەبون دووبارە ئاماژەن بەو حاڵەتە، تەنانەت خودی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەدینەشدا گرنگی بەم بوارە داوە، وەک لە فەرموودەکەی عائیشەدا هاتووە کە خۆشەویستمان لە ماڵەوە خۆی ئاژەڵی دەدۆشی. [2]

**پیشەسازی:**

ئەم بوارەش پیشەسازییە جۆربەجۆرە باوەکانی ئەو سەردەمە دەگرتەوە، چ پیشەسازییە جەنگییەکانی وەک دروستکردنی شمشێر و تیر و رم، چ دروستکردنی ئەو پێداویستیانەی کە پێویست بوون، وەک کاری دارتاشی و ئاسنگەری، چ بوارەکانی جلوبەرگ یاخود خۆشکردنی پێستە کە هاوەڵانێک هەبون لە یەکێک لەو بوارانەدا کاریان کردووەو لێرەدا ریزبەندی ناوەکانیان ناهێنین.

**بەرگدروو و کاری دەستی**

ژمارەیەک لە هاوەڵان سەرقاڵ بوون بە بواری بەرگدروو و کاری دەستیەوە، ئەمەش تەنها لە پیاوەکاندا بەرتەسک نەبووبوویەوە، بەڵکو بەشێک لە ئافرەتانیش ئەو کارەیان دەکرد، لەوانەش زەینەبی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) ئیشی دەستی دەکرد و لەو رێگەوە داهاتێکی دەستدەکەوت، ئەوەی دەستی دەکەوت دەیبەخشی و دەیکرد بە خێر،[3] هەروەها رائیتەی خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود سەرقاڵی کاری دەستی بوو، دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئافرەتێکم ئیشی دەستی دەکەم و خەرجی خۆم و پیاوەکەم و منداڵەکەشم لەسەر ئەوەیە.[4]

[1] صحيح البخاري – كتاب النكاح – باب الغيرة، الرقم ٥٢٢٤.
[2] صحيح ابن حبان، باب التواضع والكبر والعجب، الرقم ٥٦٧٥، قال شعيب الأرناؤوط إسناده قوي على شرط مسلم.
[3] صحيح مسلم – كتاب فضائل الصحابة – باب من فضائل زينب أم المؤمنين(ﭭ)، الرقم ٢٤٥٢.
[4] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٢٦٤.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: کابرایەکی بەرگدروو هەبوو خواردنێکی ئامادە کرد و پێغەمبەری خوای(ﷺ) بانگهێشت کرد، منیش لەگەڵی چووم.[1]

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) و راستکردنەوەی هاوەڵان لە بواری ئابووریدا**

کۆمەڵگەی مەدینە بە هاتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەتا کاتی وەفاتی بەردەوام رووەو لووتکە هەنگاوی دەنا، لەو نێوەندەشدا لە بوارە ئابوورییەکەدا وابوو.

ئیبن عەبباس دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە مەدینە، خەڵکی ئەو شارە لە رووی کێشانەوە پیسترین خەڵک بوون، واتە تەرازووبازییان زۆر بوو، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ)، ئیتر دوای ئەوە زۆر بە دروستی کێشانەیان دەکرد.[2]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) دای بە لای خواردنێکدا کە دانرابوو، خۆی دەستی بردە ناوی و دەستی گەیشتە بەر تەڕییەک، فەرمووی (کابرای خاوەن خواردن، ئەمە چیە؟) کابرایش وتی: بارانی بەرکەوتووە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی (أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ النَّاسُ ؟ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي)،[3] (دەی با بتخستایەتە سەرەوەی خواردنەکەوە هەتا خەڵکی ببینن، هەرکەس گزی بکات لە من نیە).

---

[1] صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب ذكر الخياط، الرقم ٢٠٩٢.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب التجارات - باب التوقي في الكيل والوزن، الرقم ٢٢٠٥.

[3] صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب قول النبي(ﷺ) من غشنا فليس منا، الرقم ١٠٢.

# ئافرەتە هاوەڵەکان

ئیسلام هەر لە سەرەتای هاتنیەوە هەوڵیدا جیاکاری رەگەزی نێر و مێ لەسەر بنەمای بەرزی و پەستی هیچکامیان نەهێڵێت، بەڵکو چەند بنەمایەکی روونی بۆ دانان کە تیایدا بەرزی و شکۆ بەپێی تەقوا و نزیکی لە خوا بوو، بۆیە خێزانی فیرعەون لای خوا لە فیرعەون لەپێشتر بوو لەبەر ئیمانەکەی، ئەبوولەهەبیش رێز و گەورەیی هێندەی ئومموئەیمەنێکی حەبەشی بەتەمەنی رەشپێیست نەبوو چونکە ئەبوولەهەب بێباوەڕ و ئومموئەیمەنیش خواناسێکی راستگۆ بوو.

(وَضرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ) (هەروەها خوا نموونەیەک بە ژنەکەی فیرعەون (ئاسیە)ی کچی (مزاحم) دێنێتەوە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەو ژنە ئیمانداره هەرچەندە نزیکی فیرعەون بوو، بەڵام فیرعەون هیچ سوودو کەڵکێکی لە باوەڕەکەی وەر نەگرت و، ئەمیش چونکە ناچاربوو کوفری فیرعەون زیانی بە ئیمانەکەی نەگەیاند.کاتێ وتی: پەروەردگارەکەم! لای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دروست بکە وە لە دەست فیرعەون و کردەوەکانی ڕزگارم بکە وە لە دەست ئەو هۆزە ستەمکارانەش رزگارم بکە.)

(فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى)( ئینجا پەروردگاریان وەڵامی دانەوە کە: بەڕاستیی من کاروکردەی هەرکام لەئێوە -نێرو مێتان- زایەو بێ پاداش ناکەم)

ئافرەتـە هاوەڵـەکان تەنهـا ئافرەتـە عەرەبـەکان نەبـوون، هـەروەک چـۆن هەمـوو ئافرەتانـی عەرەبی نـاو مەککە و مەدینەش هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبـوون، بۆیـە ئافرەتانـی کۆچـەری و پشـتیوانی و فـارس و بەنوئیسـرائیلی و حەبەشیش توانییـان بـە پلـەی هاوەڵێتی پێغەمبـەر(ﷺ) بگەن لەکاتێکدا ئامۆژنی خـودی خۆشەویسـتمان بەهـۆی بێباوەڕبوونیـەوە لێـی بێبـەش بـوو و ئایـەتـی خـواش لەسـەری دابـەزی و سـەرکۆنە و هەڕەشـەی ئاڕاسـتە کـرد، تەمەنیش سـنووری هاوەڵێتـی دەستنیشـان نەدەکـرد، بۆیـە هـەم ئافرەتانـی بـە تەمـەن و هـەم گەنجیش هاوەڵـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـوون.

کۆمەڵگەیـەک کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە ڕێـی وەحیـەوە پێکـەوەی نابـوو، کەشـێکی لەبـار و گونجـاوی بـۆ چالاکـی و ڕۆڵبینینـی ئافـرەت ڕەخسـاندبوو، چونکە لەنـاو ئـەو کۆمەڵگـەدا سروشـتی بیرکردنـەوەی کەسـێتی و ناوچـەیـی کەسـەکان ڕۆڵـی نەدەبینـی، بەڵکو بەجێگەیاندنی وەحـی و گۆڕینـی سروشـتی کەسـێتی و ناوچەیـی بەپێـی پەیامـی خـوا تیایـدا بـاو و زاڵ بـوو، نموونەکـەی عومـەری کـوڕی خەططابیـش بـە جوانـی ئەمەمـان بـۆ دەخاتـەڕوو کـە بـاس لـەوە دەکات ئـەوان لـە مەککـەدا زاڵ بـوون بەسـەر ئافرەتانـدا و لـەوێ ئافـرەت دەمکوت دەکـرا، بـەڵام کـە هاتنـە مەدینـە -قۆناغـی دابەزینی ئەحکام- ئافرەتانی مەدینـە خـاوەن قسـە بـوون و ئافرەتانـی ئەوانیش ئـەو خەسـڵەتەیان وەرگـرت، مەسـەلەکەش تەنهـا پەیوەسـت بـوو بـە ملکەچبوونـی پیـاوان و ئافرەتانیـش بـۆ وەحـی.

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بایەخـی بوونـی ئافرەتـی لـە کۆمەڵگـەدا خسـتەڕوو، لەدایکبوونـی ئافرەتانـی بـە خەڵاتـی خـوا دانـا، پێناخۆشـبوونی لەدایکبوونـی مێینەشـی بە سـیفەتی نەفامی لەقەڵەمدا، پاداشـتی خوای بۆ خەڵک خسـتەبەرچاو ئەگـەر بێتـو کەسـێک کـچ بەخێـو بکات، مافی بدات، زوڵمـی لـێ نـەکات.

مافی ئازادی هەڵبژاردنی هاوسـەری ژیانی بۆ ئافرەتـان زامـن کـرد، ئیدی

ئافرەت وەک جاران بە زۆر بەشوو نەدەدرا، بەڵکو مۆڵەتی لێوەردەگیرا و هەرکات خۆی رازی بوایە ئینجا ئەو هاوسەرگیریە رەوایەتی پێ دەدرا.

ڕێزگرتنی ئافرەتان و چاکەنواندن لەئاستیاندا کرا بە بەشێک لە بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا و ئاکاری جوانی موسڵمانانە، هاوکات ئافرەت وەک منداڵێکی بەردەست مامەڵەی لەگەڵ نەکرا، بەڵکو ئەرک و بەرپرسیارێتی گرنگی ناو خانەوادەی پێ درا (وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا ، وَمَسْؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا).[1]

**باوەڕهێنان بە ئیسلام و پێچەسپاویی لەسەری**

لەگەڵ دابەزینی وەحی و هاتنی کۆتا پەیامی خوادا، ئافرەتان دەستپێشخەر بوون لە موسڵمانبووندا، سەردەستەی ئەوانیش کە یەکەم کەسی سەرزەوی بوو باوەڕی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێنا، خەدیجەی کچی خوەیلید بوو کە خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

خەدیجەی دایکی باوەڕداران نموونەی باڵای بانگەوازی ئیسلامی بوو کاتێک لە یەکەم چرکەساتی شڵەژانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دڵنەوایی دا و لە ماوەی دواتری ژیانیشیدا ماڵ و توانا و ژیانی خستە خزمەتی بانگەوازەکەی، کۆتا ساڵی وەفاتیشی لە سەختترین قۆناغی گەمارۆی شیوی ئەبووطالیبدا تەواو کرد و بەو مەینەتیەوە سەری نایەوە، ئەم گەورەییە بوو گەیاندیە ئاستێک لە ڕێی جوبرەیلەوە سەلام و موژدەی خانوویەکی لە بەهەشتدا پێ بگەیەنرێت، هەروەها نموونەی روقییەی کچی پێغەمبەری خوا و ئومموسەلەمە و ئەسمائی کچی ئەبووبەکر و چەندینی دیکەش لە قۆناغی مەککەدا دەبینین، وەک چۆن لە مەدینەشدا زیاتر و بەرفراوانتر نموونەکان تۆمارکراون.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەیوت: رەحمەتی خوا لە ئافرەتە کۆچەرییە یەکەمینەکان، کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) (با گۆشەی سەرپۆش و لەچکەکانیان بدەن بەسەر سینگیشیاندا تا گەردن و

[1] صحيح البخاري - كتاب الجمعة - باب الجمعة في القرى والمدن، الرقم ٨٩٣

سینگ و بەرۆکیان دەرنەکەوێ)، خێرا پارچەیەک لە جلەکەی بەریان دڕاند بۆ داپۆشینی سەروملیان (یان دەموچاویان).[1]

دوابەدوای ئەوەش ئافرەتانی دیکەش موسڵمان دەبوون و لەسەر باوەڕەکەشیان نارەحەتییان دەهاتەڕێ و بەرگەی هەموو ئازارێکیان دەگرت، یەکەم شەهادەتی ڕێی خواش لە ئیسلامدا بە نسیبی ئافرەتێک بوو بە ناوی سومەییە.

سومەییە ئافرەتێکی پیری بە تەمەنی لاواز بوو،[2] کاتێک موسڵمان بوو، ئەبووجەهل لەسەر موسڵمانبوونەکەی زۆر ئازاری دەدا، جلی ئاسنینی دەکردە بەری و لەبەر گەرمای مەککەدا سزای دەدا.

کاتێک سومەییە و یاسری هاوسەری و عەمماری کوڕی لەسەر ئیسلامەتییان سزا دەدران، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (صبرا یا ال یاسر، موعدکم الجنة)،[3] (خۆڕاگر بن ئەی خێزانی یاسر، وادەتان بەهەشتە).

جارێک ئەبووجەهل کە سزای سومەییەی دەدا، هات و بە خەنجەرێک دای لە سکی و شەهیدی کرد،[4] داخی ئەو موصیبەتە لەنێو دەروونی پێغەمبەردا(ﷺ) مایەوە هەتا لە جەنگی بەدردا کە ئەبووجەهل کوژرا، بە عەمماری فەرموو (خوا بکوژەکەی دایکتی کوشت).[5]

**پەرستشی ئافرەتە هاوەڵەکان**

ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر(ﷺ) گرنگیەکی زۆریان دەدا بە پەرستشەکان، ئەوان بە دوای هەر ڕێگەیەکدا دەگەڕان کە بیانگەیەنێتە ڕەزامەندی خوا، ڕێنمایی ڕێگەکەشیان لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەردەگرت و بە جوانی جێبەجێیان

[1] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة النور - باب وليضربن بخمرهن على جيوبهن، الرقم ٤٧٥٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧١٢.

[3] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٦٣٦، قال الألباني في فقه السيرة (١١١/١) حديث حسن صحيح.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧،ص ٧١٢.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨ ص ٢٦٤.

دەکرد، ڕێگایەکی فراوانی گەیشتن بەو ڕەزامەندییەش گرنگی دانیان بوو بە پەرستشی خوای گەورە و بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی و خۆگرتنەوە لە حەرمکراوەکانی.

ئەوان لە نوێژە فەرزەکاندا ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبوون، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕێنمایی بە هاوەڵان دەدا ڕێگری نەکەن لە ئامادەبوونی ئافرەتان (لَا تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ إِذَا اسْتَأْذَنَّكُمْ إِلَيْهَا)،[1] (ڕێگری مەکەن لە ژنەکانتان بۆ هاتنە مزگەوت ئەگەر هاتو داوای مۆڵەتی لەو چەشنەیان لێکردن).

تەنانەت ئامادەی نوێژە سوننەتەکانیش دەبوون، بۆ نموونە:

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر باسی حاڵەتێکی پەرستشی ناو مزگەوت دەکات و دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) خۆرگیرانێک ڕوویدا.. چوومە مزگەوت و لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) نوێژم دابەست، نوێژەکەی زۆر درێژکردەوە، وام لێهات دەمویست دابنیشم، دواتر دەمبینی ئافرەتی لاواز هەبوو، دەموت ئەو لەمن لاوازترەو دانانیشێت، بۆیە دانەدەنیشتم.[2]

خێزانەکەی عومەری کوڕی خەططاب لە مزگەوت نوێژەکانی دەکرد و زۆری پێ دەچوو، عومەریش پێی وت خۆ تۆ دەزانیت من حەز ناکەم بچیت، ئەویش وتی: هەتا ڕێگریم لێ نەکەیت هەر دەڕۆم، عومەریش لەبەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگریی لێنەدەکرد، بۆیە هەتا ئەو ڕۆژەش کە عومەر لەناو نوێژدا بریندار کرا و بەهۆیەوە شەهید بوو، خێزانەکەی بەردەوام بۆ نوێژ دەچوو بۆ مزگەوت و ئەو ڕۆژەش هەر لەوێ بوو.[3]

هاوکات بەشداری نوێژەکانی جەژنیان دەکرد، تەنانەت ڕێنمایی کرابوون

---

[1] صحيح مسلم – كتاب الصلاة – باب خروج النساء إلى المساجد إذا لم يترتب عليه فتنة، الرقم ٤٤٢.

[2] صحيح مسلم – كتاب صلاة الاستسقاء – باب ما عرض على النبي(ﷺ) في صلاة الكسوف من أمر الجنة والنار، الرقم ٩٠٦.

[3] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٤٦١٠.

ئەوانەشیان لە ماوەی سووڕی مانگانەدان ئامادەی کۆڕی نوێژی جەژنەکان بن با نوێژیش نەکەن.

ئوممو عەتیە دەڵێت: فەرمانمان پێ دەکرا بۆ نوێژی جەژن دەربچین، تەنانەت ئەوانەشمان لە حەیزدا بوون دەردەچوون و لە پشتی خەڵکەکەوە دەوەستان و وەک خەڵکەکە الله اکبریان دەوتەوەو هەمان نزای ئەو جەماوەرەیان دەکرد و هیوایان وابوو بەرەکەتی ئەو رۆژەیان بەربکەوێت.[1]

وێڕای ئەمەش ئافرەتە هاوەڵەکان بەشداری ئیعتیکافی ناو مزگەوتیان دەکرد، عائیشەی دایکی باوەڕداران ئاماژە بەوە دەدات کە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکانی ئیعتیکافیان دەکرد.[2]

هەروەها لە مەراسیمی حەج و عومرەشدا بەشدارییان دەکرد، وەک بەشداری خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجدا و بەشداری فاطیمەی کچی سەرورمان لە حەجی ماڵئاواییدا و چەندین نموونەی دیکەش کە لە کتێبەکانی مێژوودا دەیان دەقی دروست لەو بارەوە هاتون.

ئەبووطەلحە کە ویستی حەج بکات، بڕیاری دا کوڕەکەشی لەگەڵ خۆی ببات، ئوممو سولەیمی هاوسەری داوای لێکرد لەگەڵ خۆی ئەویش بەرێت، ئەویش پێی وت: هیچی پێ نیە هەتا حەجی پێ بکات، ئافرەتەکە وتی: دەی بە جوانەوشترەکەت بمبە، ئەویش وتی: ئەوە من و کوڕەکەت پێی دەڕۆین، وتی: دەی بە فلانە وشترەت کە هەتە، ئەویش وتی: ئەوە لە ڕێی خوادا دانراوەو ناتوانم بیبەم، ئافرەتەکە وتی: دەی فلانە بەشە خورمات بفرۆشە، وتی: ئەوەیان بژێوی ژیانی من و تۆیە، کە چوون بۆ حەج و هاتنەوە، دیاربوو ئەو ئافرەتە خەمی حەجەکەی لەدڵدا مابوو، هاوسەرەکەی نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت: سەلامم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لێی بپرسە چ شتێک هاوتای حەجێکە لەگەڵ ئەودا؟ پیاوەکەی ڕۆیشت

[1] صحيح البخاري – كتاب العيدين – باب التكبير أيام منى وإذا غدا إلى عرفة، الرقم ٩٧١.
[2] صحيح البخاري – أبواب الاعتكاف – باب الاعتكاف في العشر الأواخر، الرقم ٢٠٢٦.

و بەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش لە سەرسوڕمانیەوە بەرامبەر سووربوونی ئەو ئافرەتە لەسەر حەج پێکەنی و فەرمووی (أَقْرِئْهَا مِنِّي السَّلَامَ وَرَحْمَةَ اللهِ ، وَأَخْبِرْهَا أَنَّهَا تَعْدِلُ حَجَّةً مَعِي عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ)[1] (لە منەوە سەلام و رەحمەتی خوای پێ بگەیەنەو هەواڵی پێ بدە کە عومرەیەک لە رەمەزاندا هاوتای حەجێکە لەگەڵ مندا).

بە دەقێکی تردا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ئافرەتە ئومموسولەیم بووە کە تیایدا هاتووە ئومموسولەیم چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای خۆی لەلا کرد کە نەیبردووە بۆ حەج، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی (يَا أُمَّ سُلَيْمٍ ، عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً)[2] (ئەی ئومموسولەیم، عومرەیەک لە رەمەزاندا هاوتای حەجێکە).

گێڕانەوەیەکی دیکەش هاتووە رووداوێکی هاوشێوەیە سەبارەت بە ئوممومطەلیق، رووداوەکەش بەو چەشنەیە کە ئەبووطەلیق دوو وشتری هەبوو کە یەکێکیانی بۆ حەج دانابوو و ئەوی دیکەشی بۆ جیهادی رێی خوا تایبەت کردبوو، کاتێک وەرزی حەج هات، ئوممومطەلیقی هاوسەری ویستی بەشداری حەج بێت، داوای لێکرد خۆی بە یەکێکیان و ئەمیش بەوی دیکەیان بەشدار بن بۆ حەج، ئەبووطەلیق پێی وت: مەگەر نازانیت من ئەو وشترەیانم تایبەت کردووە بە جیهادی رێی خوا؟ هاوسەرەکەی وتی: دەی خۆ حەجیش لە رێی خوادایە، رەحمەتی خوات لێ بێت ئەوەم لەگەڵ بکە، بەڵام ئەبووطەلیق رازی نەبوو، ئوممومطەلیق وتی: دەی ئەوەی خۆت بە نیازیت پێی برۆیت ئەوەیانم بدەرێ با پێی بچم بۆ حەج، ئەبووطەلیق وتی: ناتوانم لەو پاداشتەدا تۆ پێش خۆم بخەم و خۆمی لێ بێبەش بکەم، وتی: دەی لەو خەرجییەی هەتە بەشم بدە با پێی بچم، ئەویش وتی: هیچی

[1] صحيح ابن خزيمة - كتاب المناسك - جماع ذكر أبواب العمرة وشرائعها وسننها وفضائلها - باب فضل العمرة في رمضان، الرقم ٣٠٧٧.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب الحج - باب فضل الحج والعمرة - ذكر البيان بأن العمرة في رمضان تقوم مقام حجة لمعتمرها، الرقم ٣٦٩٩.

زیادەم نیە جگە لەوەی بەشی خەرجی من و تۆ و خێزانەکەمانە و دەبێت بۆ خەرجی ئێوەی جێبهێڵم، ئەگەرنا لەوە زیاترم هەبوایە بە دڵنیاییەوە پێم دەدایت، خێزانی پێی وت: ئەگەر ئەوەم بدەیتێ دڵنیابە خوای گەورە دەیهێنێتەوە شوێنی بۆت، بەڵام هەر رازی نەبوو، ئینجا پێی وت: دەی ئەگەر گەیشتیت بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە سەلامی منی پێ بگەیەنە و ئەوەی پێم وتیت بۆی باس بکە، ئەبووطەلیقیش وایکرد، ئەویش فەرمووی (**صَدَقَتْ أُمُّ طَلِيقٍ ، لَوْ أَعْطَيْتَهَا جَمَلَكَ كَانَ فِي سَبِيلِ اللهِ ، وَلَوْ أَعْطَيْتَهَا نَاقَتَكَ كَانَ فِي سَبِيلِ اللهِ ، وَإِنْ أَعْطَيْتَهَا مِنْ نَفَقَتِكَ أَخْلَفَهَا اللهُ لَكَ**) (ئومموطەلیق راست دەکات، ئەگەر وشترەکەت پێ بدایە ئەوە لە رێی خوادا بوو، ئەگەر وشترە -ناقە-کەشت پێ بدایە هەر لە رێی خوادا بوو، ئەگەریش لە خەرجییەکەت پێت بدایە ئەوە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە دەیخستەوە شوێنی بۆت) ئەبووطەلیق وتی: دەی هاوسەرم پرسیاری ئەوەی هەیە چ شتێک هاوتای حەجێکە؟ فەرمووی (عمرة في رمضان) (عومرەیەک لە رەمەزاندا).[1]

هەمان حاڵەت بۆ ئوممووسینانیش روویدا کە داوای لە پیاوەکەی کرد بیبات بۆ حەج و بۆی نەگونجا، دواتر لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) رێنمایی وەرگرت عومرەیەک لە رەمەزاندا هاوتای حەجێکە.[2]

ئافرەتان بەشداری مانەوەی شەوانی قەدر بوون، چونکە خۆشەویستمان لەسەر ئەوە رایهێنابوون، عائیشە دەڵێت: کە دە شەوی کۆتایی رەمەزان دەهات پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی بۆ کۆدەکردەوەو شەوەکەی زیندوو دەکردەوەو خاوخێزانیشی بێداردەکردەوە.[3]

---

[1] المعجم الكبير للطبراني - مسند من يعرف بالكنى - من يكنى أبا طليق - أبو طليق الأشجعي، الرقم ٨١٦؛ المطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية - كتاب الحج - باب الحمل على الراحلة في الحج يحسب من سبيل الله، الرقم ١١٤٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧ ، ص ١٩٥ وقال سنده جيد.

[2] صحيح البخاري - باب جزاء الصيد ونحوه - باب حج النساء، الرقم ١٨٦٣؛ صحيح مسلم - كتاب الحج - باب فضل العمرة في رمضان، الرقم ١٢٥٦.

[3] صحيح البخاري - كتاب فضل ليلة القدر - باب العمل في العشر الأواخر من رمضان، الرقم ٢٠٢٤.

هاوەڵـە ئافرەتـەکان گرنگیەکـی زۆریـان دەدا بـە قورئـان خوێنـدن و لێوردبوونـەوەی، وەک عەببادی کوڕی حەمزە دەڵێت: چووم بۆ لای ئەسماء دەبینـم ئـەم ئایەتـە دەخوێنێتـەوە (فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ)،( ئینجا خوا منەتـی خستە سـەرمان بـە مەرحەمەتـی خۆی و لـە سزای ئاگری هـاڵاودار پاراسـتوونی .) لەسـەر ئـەو ئایەتـە وەسـتا و نزای دەکرد و لەخوا دەپاڕایـەوە لـە دۆزەخ بیپارێزێـت، منیـش هەسـتام و چوومـە بـازاڕ و ئیشـی ناوبـازاڕم تـەواو کرد و دواتـر گەڕامـەوە، دەبینـم هێشـتا سـەرقاڵە بـە خوێندنـەوەی ئـەو ئایەتـەوەو نزاکردن و پاڕانـەوەی لـە خـوا و پەناگرتنـی پێـی لـە سزای دۆزەخ.[1]

**ناڕەحەتییان لە پێناو خوادا:**

ئـەو ناڕەحەتیـەی موسـڵمانان لەلایـەن بێباوەڕانـەوە دەیانچەشـت، یـان ئـەو سـەختیەی بەهـۆی بارودۆخـی سـەختی موسـڵمانانەوە تووشـی هـاوەڵان دەبـوو، تەنها پیاوەکانی نەدەگرتـەوە، بەڵکو ئافرەتانیش پشـکی گـەورەی ئازار و ناڕەحەتـی ڕێـی بانگەوازیـان تـووش دەبـوو.

سـومەییەی یەکـەم شـەهیدی نـاو ئیسـلام ئـەو ئافرەتـە بـوو کـە لەپێنـاو بیروباوەڕەکەیـدا بەرگـەی هەمـوو ناڕەحەتیەکانـی گـرت هەتـا شـەهید کـرا.

دوو کچەکـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) (ڕوقییـە و ئوممولکلسـوم) هەردووکیـان لەبـەر بانگەوازەکـەی باوکیـان تـەڵاق دران، زەینەبیـش دواتـر کـە ویسـتی هیجـرەت بـکات، بـە چەشـنێک ئـازار درا کـە سـکەکەی لەبارچـوو، فاطیمـەی کچیشـی سـکاڵای سـەختی ژیانـی خـۆی بـردە لای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ).

خێزانەکانـی پێغەمبەریـش(ﷺ) بێبـەش نەبـوون لـەو ناڕەحەتییانـە، بـە دوو مانـگ لەنـاو ماڵیاندا ئاگر نەدەکرایـەوە، جـاری وا هەبـوو بارودۆخـی داراییـان دەگەیشـتە ئاسـتێک بـە هەموویانـەوە توانـای میوانـداری تاکـە کەسـێکیان نەبـوو، لەکاتێکدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هـەژار نەبـوو، بـەڵام بـەو داهاتـەی کـە

---

[1] مصنف ابن أبي شيبة - من أبواب صلاة التطوع - في الرجل يصلي فيمر بآية رحمة أو آية عذاب، الرقم ٦٠٩٢.

هەبیوو خزمەتی موسڵمانانی دەکرد و سەختیەکانی بۆ خۆی و خێزان و خانەوادەکەی خۆی دەهێشتەوە.

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: لەو کاتەوەی پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مەدینە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، خاوخێزانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز سێ شەو بەسەر یەکەوە تێر نان نەبوون.[1]

کاتێ کۆچەرانی حەبەشە هاتنەوە بۆ مەدینە، ئەسمائی کچی عومەیس لەو کۆچەرانەی حەبەشە بوو بە سەردان چوو بۆ لای حەفصەی ژنی پێغەمبەر(ﷺ)، عومەر چوویە ژوورەوە بۆ لای حەفصە و ئەسمائی لەوێ بینی، بە حەفصەی وت ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتی: ئەسمائی کچی عومەیسە، عومەر وتی ئەمە حەبەشیەکەیە، ئەمە لەوانەی کەشتیەکەیە؟ (واتە ئەو کۆچەرانەی بە کەشتی لە حەبەشەوە هاتبوون بۆ مەدینە)، دایکی باوەڕداران وتی بەڵێ، عومەر وتی: بە کۆچکردن پێشتان کەوتین، جا ئێمە لەئێوە لەپێشتر و شیاوترین بە پێغەمبەری خوا، ئەسمائیش تووڕە بوو و وتی نەبەخوا، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون و نانی برسیتانی دەدا و ئامۆژگاری نەزانتانی دەکرد، بەڵام ئێمە لە خاکێکی- یان وڵاتێکی- دوور و ناخۆش بووین لە حەبەشە، ئەوەش لەبەر خوا و لەبەر پێغەمبەرەکەی، سوێند بەخوا نان ناخۆم و ئاو ناخۆمەوە تا ئەوەی وتت باسی نەکەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئێمە ئازارمان بەردەکەوت و دەترساین، دەچم و بۆی باس دەکەم و پرسیاری لێدەکەم و درۆ و فێڵیش ناکەم و کەم و زیادی بۆ ناکەم، ئەسماء چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەی تۆ چیت پێ وت؟ وتی ئاواو ئاوام پێ وت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ليس بأحق بي منكم، وله ولأصحابه هجرة واحدة، ولكم أنتم - أهل السفينة – هجرتان) (ئەو لە ئێوە شیاوتر نیە بە من، ئەو و هاوەڵانی یەک کۆچیان بۆ هەیە و ئێوەش-یارانی کەشتی- دوو کۆچتان بۆ هەیە).[2]

---

[1] متفق عليه.

[2] متفق عليه.

**ڕۆڵیان لە کۆمەڵگەدا:**

ئافرەتـان لـە کۆمەڵگـەی مەدینـەدا لەنێـو ماڵەکانیانـدا کـۆت نەدەکـران و دەوڵەتـی ئیسـلامی بێبـاک نەبـوو لـە ڕۆڵـی ئافـرەت لـە کۆمەڵگـەدا، بۆیـە دەبینیـن لـە بـوارە جیاوازەکانـی ژیـان و کۆمەڵگـەدا ئافرەتـە هاوەڵـەکان ڕۆڵـی بەرچاویـان هەبـوو.

**ڕۆڵی زانستیی:**

خەمـی گـەورەی ئافرەتـە موسـڵمانەکان سـنووردابوونی ڕێگەکانـی چـوون بـەرەو بەهەشـتیان بـوو، بۆیـە لـە بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خـوادا هەوڵـی کێبڕکێیـان دەدا لـە ئاسـت پیاوانـدا، بـۆ ئەمـەش نوێنەریـان چوویـە خزمەتـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و ئاکامـی چوونەکەشـیان ئەوەبـوو کـە ڕۆژێکیـان بـۆ خۆیـان بەدەستخسـت هەتـا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـە تایبـەت وانەیـان پـێ بڵێتـەوەو وەڵامـی پرسـیارەکانیان بداتـەوە.

بگرە جوانیەکی ئافرەتـە هاوەڵـە پشتیوانیەکان ئەوەبـوو کە زۆر سـووربوون لەسـەر شـارەزابوون لە دینەکەیان، بۆیە هەرکات پرسـیارێکیان لا دروست بوایە، خێرا خۆیـان دەگەیانـدە بـەردەرگای ماڵـی پێغەمبەر(ﷺ) و وەڵامیـان وەردەگرت، هێنـدە بـەدوای وردەکاریدا دەڕۆیشـتن کـە جـاری واهەبـوو ئیدی پێغەمبـەر(ﷺ) شـەرمی دەکرد ڕوونکردنـەوەی زیاتر بدات، ئەمە لە بێشـەرمی ئەوانـەوە نەبوو، بەڵکو لـە خەمخۆری زۆریـان بـوو بۆ شـارەزابوون لـە دینەکەیان.

جارێک ئافرەتێک هـات بۆ لای پێغەمبـەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا، پیـاوان گـوێ لـە فەرمایشـتەکانت دەگـرن، دەی ڕۆژێکیـش بـۆ ئێمـە دابنـێ بـا بێینـە خزمەتـت و ئـەوەی خـوا فێـری کردویـت فێـری ئێمەشـی بکەیـت، ئەویـش وادە و شـوێنێکی دیاریکـراوی بـۆ دانـان، ئافرەتەکانیـش لـەوە بـەدوا کۆدەبوونـەوەو پێغەمبـەر(ﷺ) زانسـتی فێـر دەکـردن.[1]

[1] صحيح البخاري - كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة - باب تعليم النبي أمته من الرجال والنساء، الرقم ٧٣١٠.

یەکێک لە کچەکانی حاریسەی کوڕی نوعمان دەڵێت: سوورەتی قافم لە دەمی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەبەرکرد کاتێک هەموو هەینیەک دەیخوێندەوە.[1]

عائیشەی دایکی باوەڕداران نموونەیەکی جوانی مەیدانی زانستە کە بەشێکی بەرچاوی ڕێنمایی ئیسلام لە ڕێی ئەوەوە بەدەست ئوممەت گەیشتووە، یانی ئەگەر عائیشە لە فەرهەنگی ئیسلامیدا دەربهێنین، دەیان مەسەلە و زانیاری شەرعی لە بنەڕەتەوە لەدەست موسڵمانان دەچن، ئیبن کەسیر لەبارەیەوە دەڵێت: (لَمْ يَكُنْ فِي الْأُمَمِ مِثْلُ عَائِشَةَ فِي حِفْظِهَا وَعِلْمِهَا وَفَصَاحَتِهَا وَعَقْلِهَا)،[2] (لە ڕووی لەبەرکردن و زانست و ڕەوانبێژی و ژیرییەوە لەناو ئوممەتاندا نموونەی عائیشە بوونی نەبووە).

**ڕۆڵی ئابووری:**

ئافرەتە هاوەڵەکان دەرفەتی چالاکی ئابوورییان پێ دەدرا، تەنانەت مافی سەربەخۆیی ئابووریشیان هەبوو، خەدیجەی دایکی باوەڕداران سەرمەشقی ئافرەتە بازرگانە موسڵمانەکان بوو، دواتر ئەم سەرمەشقیە شۆڕبوویەوە نێو ئافرەتانی موسڵمان، بۆیە ئافرەتە هاوەڵەکان دەچوونە بازاڕ و مامەڵە و کڕین و فرۆشیان هەبوو، بەڵام بۆ ئەمەش پابەندی ئەو ڕێنماییانە بوون کە شەریعەتی خوا بۆی دانابوون، دەبوو خەڵکی ناو بازاڕ و بوارە ئابوورییەکشە پابەندی ئەو ڕێنماییانە بن کە تایبەت بوون بە بوونی ئافرەت لەنێویاندا، بۆیە کاتێک جوولەکەکان لە حزووری ئافرەتێکی موسڵمان لەنێو بازاڕەکەیاندا سنووریان شکاند، جەنگیان لەدژ ڕاگەیەنرا و بابەتەکە بە کەم و لاوەکی تەماشا نەکرا.

هاوکات ئافرەتی وا هەبوو هێندە سەرمایەی هەبوو کە لە پیاوەکەی دەوڵەمەندتر بوو، ئابووریەکەشی سەربەخۆ بوو و پیاوەکەی مافی ئەوەی نەبوو دەست بەسەر سەرمایەکەیدا بگرێت، جیاوازیەکە لەوەدایە ئافرەتانی ئەمڕۆ کاتێک سەربەخۆیی ئابوورییان دەبێت بیر لە بێمنەت بوون لە

[1] صحيح مسلم - كتاب الجمعة - باب تخفيف الصلاة والخطبة، الرقم ٨٧٣.

[2] البداية والنهاية، دار هجر، ج٤، ص ٣٢٢.

پیاو دەکەنەوە، بەڵام ئەوان بیریان لە یارمەتیدانی پیاوەکانیان دەکردەوە، بۆیە دەبینین رائیتەی هاوسەری عەبدوڵای کوڕی مەسعوود کە ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پاش باسکردنی سەرمایە و داهاتی خۆی و نیشاندانی ئاستی هەژاری پیاوەکەی، پرسیاری ئەوەی لێدەکات ئەگەر هاوکاری پیاوەکەی بکات لە رووی ماددییەوە، ئایا پاداشتی دەستدەکەوێت، پێغەمبەریش(ﷺ) بە بەڵێ و ئەرێنی وەڵامی دەداتەوە، لەکاتێکدا مێردەکەی یەکێکە لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان و کەسایەتیەکی زۆری دیاری ناو هاوەڵان.

رائیتە کە لە رێی ئیشی دەستیەوە سەرمایەی دەستدەکەوت، خەمی ئەوەی بوو بەهۆی هەژاری مێردەکەی و پێویستی منداڵەکانیەوە ناتوانێت خێر و صەدەقە بکات، راشکاوانە ئەمەشی بە پیاوەکەی وت، عەبدوڵایش پێی وت: بەخوا ئەگەر بەو یارمەتیدانەی ئێمە پاداشتت دەست نەکەوێت حەز ناکەم بیکەیت، رائیتەش چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئافرەتێکم ئیشی دەستی دەکەم و خەرجی خۆم و پیاوەکەم و منداڵەکەشم لەسەر ئەوەیە، بەڵام مەسرەفی ئەوان وایکردووە نەتوانم خێر و صەدەقە بکەم، ئایا ئەوەی خەرجی دەکەم بۆ ئەوان خێرم بۆ دەنووسرێت؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (أَنْفِقِي عَلَيْهِمْ ، فَإِنَّ لَكِ فِي ذَلِكَ أَجْرَ مَا أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ)،[1] (خەرجی بکە بۆیان، چونکە هەتا بۆیان خەرج بکەیت لەسەر ئەوە پاداشتت دەست دەکەوێت).

زەینەبی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) ئیشی دەستی دەکرد و لەو رێگەوە داهاتێکی دەستدەکەوت، داهاتەکەشی تایبەت نەدەکرد بە خۆیەوە، بەڵکو وەک هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی بۆ دەدەن، ئەوەی دەستی دەکەوت دەیبەخشی و دەیکرد بە خێر.[2]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٢٦٤.

[2] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل زينب أم المؤمنين(ﷺ)، الرقم ٢٤٥٢.

ئافرەتە هاوەڵەکان لە ئیشوکاری پیاوەکانیاندا هاوکار دەبوون، بۆ نموونە ئەسمائی کچی ئەبووبەکر لە ئالفدانی ئاژەڵ و ئاوڕاکێشان و چنینەوەی بەربوومدا هاوکاری زوبەیری هاوسەری بوو.[1]

وێڕای ئەوەش ئافرەتە هاوەڵەکان بەخشندەییەکی زۆریان هەبوو، چونکە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فێرکرابوون بەخشندە بن و چرووکی نەنوێنن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر هەوڵیدەدا سیفەتی بەخشندەیی لەنێو ئافرەتانی موسڵماندا زاڵ بێت، بۆ ئەوەش ڕێنمایی دەکردن ببەخشن.

ئوممو بوجەید دەڵێت: جارێک وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەخوا جار هەیە هەژار دێتە بەر دەرگاکەم و منیش هیچ بەدی ناکەم بیدەمێ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو (إِنْ لَمْ تَجِدِي لَهُ شَيْئًا تُعْطِينَهُ إِيَّاهُ إِلاَّ ظِلْفًا مُحْرَقًا، فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ فِي يَدِهِ)،[2] (ئەگەر هەر هیچت شک نەبرد پێی ببەخشیت ئەوە با سمە سووتاوێکیش بێت هەر بیدەرە دەستیەوە).

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی (لَا تُوعِي فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ، ارْضَخِي مَا اسْتَطَعْتِ)،[3] (دەستت مەگرەوەو پیسکەیی مەنوێنە با خوا دەستت بەرووودا نەگرێتەوە، چەندە دەتوانیت ببەخشە).

لە پاش ئەو وەسیەتەوە ئەسماء بەوە ناسرابوو کە زۆر بەخشندەیە، هەرچییەکی دەستبکەوتایە کۆی نەدەکردەوەو یەکسەر دەیبەخشی، لەمەدا لە عائیشەی خوشکی جیاواز بوو، عائیشە کەمە کەمە شتی دەستدەکەوت و کۆی دەکردەوە هەتا زۆر دەبوو ئینجا دەیبەخشی.[4]

---

[1] صحيح البخاري – كتاب النكاح – باب الغيرة، الرقم ٥٢٢٤.

[2] جامع الترمذي – أبواب الزكاة عن رسول الله(ﷺ) – باب ما جاء في حق السائل، الرقم ٦٦٥ و قال حسن صحيح، سنن أبي داود – كتاب الزكاة – باب حق السائل، الرقم ١٦٦٧، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ١٦٦٧.

[3] صحيح البخاري – كتاب الزكاة – باب الصدقة فيما استطاع، الرقم ١٤٣٤.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٦ و ٥٢٣.

ئافرەتە هاوەڵەکان کاتێکیش بێوەژن دەکەوتن هەوڵیاندەدا نەبن بە بار بەسەر خەڵکەوە، وەک چۆن جابیری کوڕی عەبدولا دەڵێت: پوورم تەڵاق درا، ئیتر سەرقاڵ بوو بە کشتوکاڵی خورماوە، پیاوێک سەرکۆنەی کرد لەسەرئەوەی بچێتە دەرەوەو سەرقاڵ بێت بەو ئیشانەوە، ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش ڕێی پێدا و ڕێنموونیشی کرد خێر و بەخشش بکات لە دەستکەوتی کارەکەیدا.[1]

**ڕۆڵیان لە جیهاددا:**

ئافرەتە هاوەڵەکان هاوشانی هاوەڵانی دی لە مەیدانی جیهادیشدا پشکی خۆیان لەبیرنەکردبوو، ئەگەرچی ئەم ڕۆڵە لەسەر پیاوان واجب بوو، بەڵام نموونەی چەند ئافرەتێکی نێو هاوەڵان دەبینین کە لە مەیدانەکانی جیهاددا بەشدارییان دەکرد، بەشدارییەکەشیان لەم بوارانەدا بوو:

پاڵپشتی دارایی جیهاد بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی.

دابینکردنی پێداویستی موجاهیدان و خزمەتکردنیان.

تیمارکردنی برینی بریندارەکان.

سەرپەرشتی ئەوانەی نەخۆش دەکەوتن.

جەنگ دژ بە بێباوەڕان و بەشداری ڕاستەوخۆی بەریەککەوتن.

ڕوبەیعی کچی موعەویز دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری غەزاکانمان دەکرد و لەوێ ئاومان دەبرد بۆ خەڵکەکە و خزمەتمان دەکردن و بریندار و کوژراوەکانمان دەگێڕانەوە بۆ نێو مەدینە.[2]

ئوموعەتیەی ئەنصاری دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری حەوت غەزام کرد، لە غەزاکاندا لای کەلوپەل و شمەکەکان دەمامەوەو خواردنم بۆ ئامادە دەکردن و تیماری بریندارەکانم دەکرد و سەرپەرشتی

[1] صحيح مسلم - كتاب الطلاق - باب جواز خروج المعتدة البائن والمتوفى عنها زوجها في النهار لحاجتها، الرقم ١٤٨٣.

[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب رد النساء الجرحى والقتلى إلى المدينة، الرقم ٢٨٨٣.

نەخۆشەکانیشم دەکرد.[1]

لە پاش غەزای خەندەقیش کە سەعدی کوڕی موعاز لەلایەن جوولەکەکانەوە بریندار کرا، بۆ تیماری برینەکەی برا بۆ لای ئافرەتێک کە پێی دەوترا روفەیدە و شارەزا بوو لە تیمارکردنی بریندا.[2]

خودی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرجارە و یەکێکیان بەشداری غەزاکان دەبوو، دایکە عائیشە و ئوممو سولەیم لە گەرمەی جەنگی ئوحود و لەکاتی شکستی موسڵمانان و زۆربوونی مەترسییەکاندا، دەچوون ئاویان دەهێنا بۆ موجاهیدان.[3]

ئومموعیمارەی ئەنصاری یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی لە جەنگی ئوحوددا راستەوخۆ بەشداری جەنگەکەی کرد و نزیکەی دوانزە برین بە جەستەیەوە بوو، هەرچەندە سەرەتا چووبوو بۆ ئەوەی ئاو دابین بکات بۆ موجاهیدان، بەڵام پاش شکستەکە، خۆی گەیاندە نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) و دەمێک بە شمشێر و دەمێک بە تیرهاوێژی بەرگری لە خۆشەویستمان دەکرد.[4]

ئەم حاڵەتە تەنها لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نەبوو، بەڵکو لە خیلافەتی راشیدینیشدا بەشداری ئافرەتە هاوەڵەکان لە جەنگەکاندا دەبینین، نموونەی ئەوانەش بەشداری ئەسمائی کچی یەزیدی ئەنصارییە لە جەنگی یەرمووکدا کە چەند کەسێک لە رۆمەکانی کوشت، هەروەها بەشداری ئوممو حەرامی کچی میلحانە لە یەکەم هێرشی دەریایی موسڵماناندا، ئەم ئافرەتە خۆی یەکلاکردبوویەوە بۆ چارەسەرکردنی موسڵمانان و نەهێشتنی نارەحەتی سەرشانیان.[5]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب النساء الغازيات يرضخ لهن ولا يسهم والنهي عن قتل صبيان أهل الحرب، الرقم ١٨١٢.

[2] ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٣، ص ٣٢٦.

[3] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب غزو النساء وقتالهن مع الرجال، الرقم ٢٨٨٠.

[4] ابن سعد: الطبقات الكبرى، دار الكتب العلمية، ج٨ ص ٣٠٣.

[5] ابن عبدالبر: الإستيعاب، ج٤، ص ١٨٣٨.

**پێگەیان لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا:**

ئافرەتە هاوەڵەکان لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمانانیش بەهۆی پەیامی ئیسلامەوە پێگەیەکی گرنگ و بەرچاویان پێ درابوو، ئەوان لە پرس و بابەتەکاندا قسەی خۆیان هەبوو، راو بۆچوونیان وەردەگیرا، توانای بڕیاردانیان هەبوو و موسڵمانانیش دەبوو پابەندی ئەو هەڵوێست و بڕیارەی ئەوان بن مادەم پێچەوانەی پەیامی خوا نەبێت.

لە رێککەوتنی حودەیبییەدا کاتێک موسڵمانان ئەو رێککەوتنەیان بە شکست لەقەڵەم دەدا، حاڵەتێکی دەروونی وایان بۆ دروست بوو کە ئامادە نەبوون فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەجێبگەیەنن کاتێک فەرمانی پێکردن ئاژەڵەکانیان سەرببڕن و سەریان بتاشن، ئەمەش یەکەمجار بوو هاوەڵان ئاوا لە بڕیاری پێغەمبەردا(ﷺ) خەمسارد بن، ئومموسەلەمە پێشنیارێکی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد کە بوویە هۆی چارەسەری ئەو زرووفە، ئەویش ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ ئەوەی قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکات لەناو هاوەڵاندا ئاژەڵەکەی خۆی سەرببڕێت و سەری بتاشێت، بەوەش خەڵکەکە چاوی لێ ئەکەن، خۆشەویستیش دەقاودەق پێشنیارەکەی جێبەجێ کرد و ئەنجامەکەش هەمان ئەنجام دەرچوو.[1]

لە فەتحی مەککەدا ئوممومهانیئی کچی ئەبووطالیب پەنای یەکێک لە بێباوەڕانی ناو مەککەی دا، یەکێک لە هاوەڵەکان ئەمەی لەسەر دڵ گران بوو و دەیوت ئەو بێباوەڕە دەکوژم، ئوممومهانیئیش چوویە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی (قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ)،[2] (ئەی ئوممومهانیء ئێمەش پەنای ئەو کەسە دەدەین کە تۆ پەنات داوە).

شیفائی کچی عەبدوڵا کە یەکێک بوو لە ئافرەتە کۆچەرییەکان و زۆر

[1] مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٩٢١٢.

[2] صحيح البخاري – كتاب الصلاة – باب الصلاة في الثوب الواحد ملتحفا به، الرقم ٣٥٧.

زوو موسڵمان بووبوو، لەلایەن خەلیفەی باوەڕداران عومەری کوڕی خەططابەوە ڕێزێکی تایبەتی لێ دەنرا و ڕاوبۆچوونی بەهەند وەردەگیرا، تەنانەت بەرپرسیاریتی بەشێک لە بازاڕی شاری مەدینەی پێ سپێردرا.[1]

سەمرائی کچی نوهەیک یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی ئەرکی چاودێری بازاڕی پێ سپێردرابوو و تیایدا فەرمانی دەکرد بە چاکە و ڕێگری دەکرد لە خراپە و سزای خەڵکی دەدا لەسەر لادان و تاوانێک کە لەناو بازاڕدا ئەنجام دەدرا.[2]

[1] ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٤، ص ١٨٦٩.

[2] ابن عبدالبر: الاستيعاب في معرفة الأصحاب، الطبعة الاولى، دار الجيل، بيروت، ج٤،ص ١٨٦٣.

# هاوەڵە گەنجەکان

گەنجانی دەورەی پێغەمبەر(ﷺ) کەسانێکی نموونە و باڵای نێو مێژوون، ئەوان کەنارخراوانێکی دەست وپێ سپی نەبوون، نازپێدراوانێکی پەروەردەنەکراویش نەبوون، وەک چۆن نازیان پێ دەدرا و ڕێزیان لێ دەگیرا، ئەرکیشیان پێ دەسپێردرا و متمانەشیان پێ دەبەخشرا و جڵەوی زۆر ئەرک و بەرپرسیارێتیی هەستیاریشیان دەدرایە دەست.

هاوەڵە گەنجەکان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) گۆش دەکران، ڕاست و هەڵەیان بۆ جیادەکرایەوە، هان دەدران بۆ پەیڕەوی ڕاستی و ڕێی خراپەیان لێ دووردەخرایەوە، ئەگەریش تووشی هەڵەیەک ببوونایە، ئاگادار دەکرانەوەو ڕاست دەکرانەوە.

**دامەزراوی لەسەر ئیسلام**

دەستەی یەکەمی گەنجانی ئەم ئوممەتە جوان لە واتا و پەیامی ئیسلام تێگەیشتبوون، بۆیە کە ڕازی بوون وەک دین وەریبگرن، ئامادەبوون هەموو قوربانییەکی بۆ بدەن، لەسەری دامەزراو بن، تاڵی وشیرینی و بەرزی و نشێوی ژیان ساردی نەدەکردنەوە لە پەیڕەوی دینەکەیان، ڕووگیری و هەڵچوون و داچوون و ڕەخنە و ناڕەحەتی و هەر شتێکی دی نەدەبوونە هۆکاری سازشکردن لە بیروباوەڕەکەیان.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص گەنجێک بوو هێشتا تەمەنی نەگەیشتبوویە بیست ساڵان کاتێک باوەڕی هێنا، دایکی ناڕازی بوو، سەعد بەرامبەر بە دایکی چاکەی زۆر بوو، بەڵام ڕازی نەبوو ئەو داواکارییەی قبووڵ بکات کە

وازهێنانە لە ئیسلام، دایکیشی سوێندی لێ خوارد هەتا وازنەهێنێت قسەی لەگەڵ نەکات و دەم بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە، ئینجا بە تانەوە بە سەعدی دەوت: بە لای خۆیەوە بانگەشەی ئەوە دەکەیت خوا ڕێنمایی کردویت لەگەڵ دایک و باوکتدا چاک بیت، منیش دایکی تۆم و فەرمانت پێ دەکەم وازبهێنیت، سێ ڕۆژ نانی نەخوارد هەتا لە لاوازیدا بووڕایەوە، کوڕێکی بە ناوی عومارە بڕێک ئاوی پێدا هەتا هاتەوە هۆش خۆی، دایکی کەوتە نزاکردن لە سەعد، ئەوەبوو خوای گەورە لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلى أَنْ تشرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاَ تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنيَا مَعْرُوفًا)،[1] (ئێمە دەربارەی باوک و دایک بە مرۆڤمان ڕاگەیاندو ئامۆژگاریمان کرد کە: هەمیشە ڕەفتاری چاکەیان لەگەڵ بکەن بە تایبەتی لەگەڵ دایکییدا.. دایکی بە پێستی سک هەڵیگرتووە بە لاوازی لەسەر لاوازی، تا لە داوێنی بەربۆتەوەو هاتۆتە ئەم جیهانەوە شیر بڕینەوەشی دوو ساڵی خایاند، کەوایە (ئەی مرۆڤ!) بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم و، سوپاسی باوک و دایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارە لە پێناوی تۆدا چێشتوویانە گێڕانەوەشتان هەر بۆلای منە، دوای زیندووبوونەوە..هەمیشە گوێڕایەڵیانبەو لە سنووری ڕەزامەندیی خوادا، خۆ ئەگەر هەوڵیشیانداو پێیان داگرت لەسەر ئەوە کە شتێک بکەی بە شەریک و هاوبەشم، کە هیچ بەڵگەو زانیارییەکت پێی نیە ئەوسا گوێڕایەڵییان مەکە وە لە دنیادا لەگەڵ هەردووکیاندا بە شێوەیەکی چاک و پەسەند هاوەڵی بکە، هاوڕێ و هاوکارێکی چاکبە بۆیان، بە جل و بەرگ و خۆراک و هەڵسوکەوتی چاک دڵخۆشیان بکە.. هتد).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کاتێک سەعد بینی دایکی ئاوا وەزعی شلۆق بووە، پێی وت: دایکی شیرینم، باش بزانە سوێند بەخوا دایەگیان ئەگەر هەزار

[1] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب في فضل سعد بن أبي وقاص، الرقم ١٧٤٨.

گیانت هەبێت، یەکە یەکە هەموویان دەربچن وازناهێنم لە دینەکەم، ئیتر پێت خۆشە شتێک بخۆ، نایشخۆیت با بە ویستی خۆت بێت.[1]

### ڕێنمایی هاوەڵان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵە گەنجەکانی بێبەش نەدەکرد لە ڕێنمایی و ئاراستەکردنیان، چ لە ڕێڕەوە گشتییەکاندا، یاخود لە هەنگاوە وردەکانی ژیانی کەسێتییاندا.

### بەهای گەنجێتی:

عەبدوڵای کوڕی مەسعوود لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەیفەرموو (لَا تَزُولُ قَدَمَا ابْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عِنْدِ رَبِّهِ حَتَّى يسْأَلَ عَنْ خَمْسٍ؛ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أَفْنَاهُ ، وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ ، وَمَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ ، وَمَاذَا عَمِلَ فِيمَا عَلِمَ).[2] (قاچەکانی ئادەمیزاد لە ڕۆژی دواییدا لە خزمەت پەروەردگاریدا ناڕۆن هەتا لەسەر پێنج شت پرسیاری لێ دەکرێت: لەبارەی تەمەنیەوە لە چیدا بەسەری برد، لەبارەی گەنجییەوە لە چیدا بردیەسەر، لەبارەی سامانیەوە چۆن بەدەستیهێنا و لە چیدا خەرجی کرد، چۆن کاری کرد بەو زانستەی هەیبوو).

### لە ڕەفتاردا:

خۆشەویستمان فێری دەکردن ڕێزی لەخۆیان گەورەتر بگرن، دەیفەرموو (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا).[3] (لە ئێمە نییە کەسێک میهری بۆ بچووکەکانمان نەبێت و ڕێزی گەورەکانمان نەگرێت).

هاوەڵە گەنجەکانی وەک عائیشە و ئەبووهورەیرە دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الخَيْرِ، وَمَنْ حُرِمَ

[1] ابن عساكر: تاريخ دمشق، ج٢٠، ص ٣٣١.

[2] جامع الترمذي – أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ) – باب في القيامة، الرقم ٢٤١٦، حسنه الألباني.

[3] جامع الترمذي – أبواب البر والصلة عن رسول الله(ﷺ) – باب ما جاء في رحمة الصبيان، الرقم،٢٠٥٧ و قال حسن صحيح.

حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الخَيْرِ)،[1] (هەرکەس لە نەرمونیانیی بەشیی درابوو، ئەوە بەش و بەختێکی چاکی پێدراوە، هەرکەسیش بێبەش کرابوو لە بەش و بەختی نەرمونیانیی، ئەوە لە بەش و بەختی چاک بێبەش بووە).

**لە بواری کۆمەڵایەتیدا:**

پێشەوامان ڕێنمایی گەنجە هاوەڵەکانی دەکرد هاوسەرگیری بکەن و ئەو پرۆسەیە پشتگوێ نەخەن و بیانوو نەهێننەوە بۆ خۆدزینەوە لێی، دەیفەرموو (يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)،[2] (ئەی گرۆی گەنجان، هەرکامتان لە توانایدا هەبوو با هاوسەرگیری بکات، هەرکامیشتان نەیتوانی با ڕۆژوو بگرێت چونکە دەبێتە قەڵغانێک بۆی).

**لە پەرستشدا:**

ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) جارێک لە ڕێی حەفصەوە ئامۆژگاری کردووە بۆ گرنگیدان بە شەونوێژ و فەرموویەتی (نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ ،لَوْكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ)، (عەبدوڵا پیاوێکی زۆر باشە، بریا شەونوێژی هەبوایە)، ئیتر لەوەبەدوا ئیبن عومەر گرنگی بە شەونوێژ دەدا.[3]

یاخود خۆشەویستمان درەنگانێکی شەو چوو بۆ ماڵی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و فاطیمەی کچی کە هەردووکیان گەنج بوون، وەک ڕاچڵەکاندنێک پێی فەرموون (أَلاَ تُصَلِّيَانِ؟)،[4] (ئەرێ ئەوە نوێژ ناکەن؟).

**گرفت و چارەسەر:**

هاوەڵە گەنجەکان هەر گرفت و ئاریشەیەکیان هەبوایە، خێرا خۆیان دەگەیاندە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بە دوای چارەسەردا دەگەڕان، ئەوان لەلایەن پێشەوامانەوە هێندە دەرگایان بۆ والاکرابوو، شەرمیان نەدەکرد لە

[1] سنن الترمذي، الرقم ٢٠١٣ وقال حسن صحيح.

[2] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب قول النبي(ﷺ) من استطاع منكم الباءة فليتزوج، الرقم ٥٠٦٥.

[3] صحيح البخاري - أبواب التهجد - باب فضل من تعار من الليل فصلى، الرقم ١١٥٧.

[4] صحيح البخاري - أبواب التهجد - باب تحريض النبي(ﷺ) على صلاة الليل والنوافل، الرقم ١١٢٧.

دەربڕینی حەز و خواست و خولیاکانی ناخیان، با تەنانەت بابەتێکیش بێت کە لای خەڵک مایەی شوورەیی بێت، بۆ نموونە:

گەنجێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە زینا بکەم، خەڵکەکە چاویان لێ زیت کردەوەو کەوتنە سەرکۆنەکردنی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مَهْ مَهْ)، (بوەستن، بوەستن)، ئینجا داوای لێکرد نزیک ببێتەوە، ئەویش نزیک بوویەوە، فەرمووی: دابنیشە، ئەویش دانیشت، خۆشەویستمان فەرمووی(أَتُحِبُّهُ لِأُمِّكَ)، (ئەوەت بۆ دایکت پێ خۆشە؟)، وتی: نەبەخوا خوا بمکات بە قوربانت، ئازیزمان فەرمووی (وَلَا النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِأُمَّهَاتِهِمْ)، (دەی خەڵکیش بۆ دایکانیان ئەوەیان پێ خۆش نیە)، ئینجا پێی فەرموو: ئەی ئەوەت پێ خۆشە بۆ کچەکەت؟ وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوا بمکات بەقوربانت، فەرمووی (دەی خەڵکیش بۆ کچەکانیان ئەوەیان پێ خۆش نیە)، ئینجا فەرمووی: ئەی ئەوەت پێ خۆشە بۆ خوشکەکەت؟ وتی: نەبەخوا، خوا بمکات بەقوربانت، فەرمووی (دەی خەڵکیش بۆ خوشکەکانیان ئەوەیان پێ خۆش نیە)، بۆ پووریش هەمان شتی پێ فەرموو، ئینجا دەستی خستە سەر سنگی و نزای بۆ کرد (اللَّهُمَّ اغْفِرْ ذَنْبَهُ ، وَطَهِّرْ قَلْبَهُ ، وَحَصِّنْ فَرْجَهُ)، (خودایە لە تاوانی خۆش بە و دڵی پاک بکەرەوەو داوێنی بە پاکی بپارێزە)، ئیتر لەوەبەدوا ئەو گەنجە لاینەدەکردەوە بۆ هیچ شتێک.[1]

عەبدوڵای کوڕی عەمر کە گەنجێکی نێو هاوەڵان بوو، باس لە گرفتێکی نێو ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت: باوکم ئافرەتێکی خاوەن بنەماڵەی بۆ هێنام، دوای ماوەیەک باوکم هەواڵی منی لە ژنەکەم پرسی، ئەویش وتی: پیاوێکی زۆر چاکە، تا ئێستا لەگەڵم نەنووستووەو لەو کاتەوەی شووم پێکردووە یەکمان لە ئامێز نەگرتووە، ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر(ﷺ)، بە باوکمی فەرموو: بینێرە بۆ لام، منیش چوومە خزمەتی، فەرمووی: چۆن

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٢٦٤١.

ڕۆژوو دەگریت؟ وتم: هەموو ڕۆژێک، فەرمووی: چۆن خەتمی قورئان دەکەیت؟ وتم: هەموو شەوێک، فەرموو هەر مانگێک سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرە و هەر مانگێک خەتمێک بکە، منیش وتم: توانای زیاترم هەیە، فەرمووی: لە هەفتەیەکدا سێ ڕۆژ ڕۆژوو بگرە، وتم: توانای زیاترم هەیە، فەرمووی دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبە و ڕۆژێک ڕۆژوو بگرە، وتم توانای زیاترم هەیە، فەرمووی: (صُمْ أَفْضَلَ الصَّوْمِ ، صَوْمَ دَاوُدَ ، صِيَامَ يَوْمٍ وَإِفْطَارَ يَوْمٍ ، وَاقْرَأْ فِي كُلِّ سَبْعِ لَيَالٍ مَرَّةً)،[1] (دەی چاکترین ڕۆژوو بگرە، ڕۆژووی داوود، ڕۆژێک بەڕۆژوو بە و ڕۆژێک نا، لە حەوت شەویشدا یەک جار خەتم بکە).

یاخود ئەگەر خۆیان زۆر شەرمیان بکردایە و ڕاستەوخۆ لە خزمەت پێشەواماندا قسەی ناخی خۆیان نەکردایە، لە ڕێی کەسێکی ترەوە پەیامەکەیان دەگەیاند:

عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەڵێت: من کەسێک بووم مەزیم زۆر بوو، شەرمم دەکرد لەو بارەوە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بپرسم، بۆیە داوام کرد میقدادی کوڕی ئەسوەد چوو لەو بارەوە پرسیاری بۆ کردم و وەڵامی بۆ هێنامەوە.[2]

**ڕۆڵبینینی هاوەڵە گەنجەکان:**

لە دیارترین ئەو مەیدانانەی کە گەنجە هاوەڵەکان ڕۆڵیان تێیدا هەبوو، بریتی بوون لە:

**مەیدانی زانستی:**

هاوەڵە گەنجەکان ڕاهێنرابوون گرنگیەکی زۆر بە زانست بدەن، چەشنی فێربوونی زمان و شارەزایی نووسین و خوێندنەوەو گرنگیدان بە فەرمودە، لەوەشدا کەمتەرخەمییان نەنواند، بۆ نموونە:

---

[1] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب في كم يقرأ القرآن وقول الله تعالى فاقرءوا ما تيسر منه، الرقم ٥٠٥٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب من استحيا فأمر غيره بالسؤال، الرقم ١٣٢.

موعـازی کـوڕی جەبـەل یەکێک بـوو لەوانـەی لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) قورئانیـان کۆدەکـردەوە،[1] لـە کاتێکدا هەتـا کاتـی وەفاتـی پێغەمبـەر(ﷺ) تەمەنـی سـی سـاڵانی تێنەپەڕاندبـوو.[2]

بەڵکو پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕێنمایـی ئوممەتـی دەکـرد قورئـان لـە چـوار کەسـەوە وەربگرن، سێیان لـەوان گەنـج بـوون کـە بریتـی بـوون لـە سـالمی مـەولای ئەبووحوزەیفـە و عەبـدوڵای کـوڕی مەسـعوود و موعـازی کـوڕی جەبـەل.[3]

هەروەهـا بەشـێکی زۆری فەرموودەکانـی پێغەمبـەر(ﷺ) لەلایـەن هاوەڵـە گەنجەکانـەوە بـۆ ئێمـە نەقڵ کـراون، نموونـەی ئەوانـەش (ئەنەسـی کـوڕی مالیک، ئەبووهوڕەیرە، عائیشـەی کچـی ئەبووبەکر، عەبدوڵای کوڕی عومـەر، عەبـدوڵای کـوڕی عەببـاس، عەبـدوڵای کـوڕی عەمـری کـوڕی عـاص).

ئیبـن عەببـاس ئـەو هاوەڵـە بـوو کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نـزای زانایـی و شـارەزایی بۆ کـرد، بـە حیبـری ئوممـەت ناسـراوە، خـۆی بەسـەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: کاتێک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وەفاتـی کـرد، بـە یەکێک لـە کەسـە پشـتیوانیەکانم وت: هـۆ فلانەکـەس، وەرە بـا بچیـن و دەسـت بکەیـن بـە پرسـیارکردن لـە هـاوەڵان، چونکـە ئـەوان ئەمـڕۆ ژمارەیـان زۆرە و لـە ژیانـدا مـاون، ئەویش پێـی وتـم: چەنـد جێـی سەرسـوڕمانە ئـەی ئیبـن عەببـاس، یانـی پێـت وایـە هەتـا هاوەڵانـی پێغەمبـەر(ﷺ) مابـن ئـەو خەڵکـە ئیشـیان ئەکەوێتـە لای تـۆ؟ بۆیـە نەهـات بـەدەم داواکەمـەوە، منیـش وازم نەهێنـا و چـوم بـەدەم خولیاکەمـەوە، جـاری وا هەبـوو دەمبیسـت هاوەڵێـک فەرموودەیەکـی لایـە، دەچوومـە بـەردەم ماڵەکـەی دەمبینـی کاتـی پشـوویەتی، لەبـەردەم ماڵەکەیـدا پاڵـم دەدایـەوەو دەوەسـتام هەتـا دەیزانـی لەوێـم، هاوەڵەکـە پێـی دەوتـم: ئـەی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٣٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٣٦.

[3] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب سالم مولى أبي حذيفة، الرقم ٣٧٥٨.

ئامۆزای پێغەمبەری خوا بۆچی هاتویت؟ با بتناردایە بە شوێنمدا من دەهاتم بۆ لات، منیش دەموت: نەخێر، لەسەر منە بێمە خزمەتت، ئینجا داوای ئەو فەرموودەم لێدەکرد و لێم وەردەگرت، ڕۆژان تێپەڕی و هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەمبوونەوە و خەڵکی ئیشیان کەوتە من، کابرا پێی وتم: ئەی ئیبن عەبباس، تۆ لە من ژیرتر بوویت.[1]

**مەیدانی بانگەواز:**

هاوەڵە گەنجەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە بڵاوکردنەوەو پاراستن و سەرخستن و پێشخستنی بانگەوازی ئیسلامیدا، گەنجە کۆچەرییەکان لە مەککە نموونەی یەکەمیان لەم بوارەدا پێشکەش کرد، نموونەی ئیبن مەسعوود و عەمماری کوڕی یاسر، گەنجە پشتیوانییەکانیش لە مەدینە بە هەمان شێوە.

هەریەک لە موعازی کوڕی جەبەل و سەعلەبەی کوڕی عەنمەو عەبدولای کوڕی ئەنیس کە سێ گەنجی نێو پشتیوانان بوون، بۆ ڕاچڵەکاندنی هۆزەکەیان لە جەهالەتی بتپەرستی، پێکەوە دەچوون بتەکانی بەنی سەلەمەیان دەشکاند.[2]

عەمری کوڕی جەمووح کە کەسایەتیەکی گەورەی پشتیوانان بوو، لە ماڵەوە بتێکی هەبوو بە ناوی مەناف، زۆر خۆشی دەویست و پاکی ڕادەگرت و بۆنی خۆشی لێدەدا، جا کە بڕێک لە گەنجانی پشتیوانان موسڵمان بوون، لەوانە موعازی کوڕی جەبەل و موعازی کوڕی عەمر-کوڕەکەی خۆی- و بەشداربووی بەیعەتی عەقەبە بوون، شەو دەچوون بتەکەی عەمریان فڕێ دەدایە ناو زبڵدانەوە، بۆ بەیانی عەمر هەڵسا و هاواری لێهەستا و وتی کێ ئەمشەو هێرشی بردوەتەسەر خواکانمان، پاکی کردەوەو بۆنی خۆشی لێدا،

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب العلم - الأصل في طلب الحدیث وتوقیر المحدث، الرقم ٣٦٣ وصححه الحاکم و وافقه الذهبي و قال علی شرط البخاري.

[2] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص ٥٨٣.

ئەوانیش هەمدی وایان لێکردەوە، ئەمجار عەمر کە پاکی کردەوە شمشێرێکی پێدا هەڵواسی و وتی بەخوا من نازانم کێیە وات لێدەکات، جا ئەگەر خۆت خێرێکت تیایە بەم شمشێرە بەرگری لە خۆت بکە، بۆ شەو ئەوانیش هەمدی بتەکەیان برد و شمشێرەکەیان لابرد و لە شوێنیدا سەگێکیان بەستەوە بە ملی بتەکەوەو خستیانە ناو زبڵدانێکی بەنی سەلەمەوە، عەمر بەیانی هەستا بتەکەی نەدی، چوو تا بەو شێوەیە دۆزیەوە، ئیتر راچڵەکی و وازی لە بتپەرستی هێنا و موسڵمان بوو.[1]

مەیدانی جیهاد:

هاوەڵە گەنجەکان هەر لە سەرەتاو دەستپێکی جیهاددا پشکی خۆیان لەو مەیدانەدا پچڕی و هەتا لە ژیاندا مابوون ئەو مەیدانەیان چۆڵ نەکرد، ئەوانە لە بەدرەوە هەتا تەبووک و لە یەرمووکەوە هەتا جەنگی دەریایی موسڵمانان و فتووحاتی ئەفریقیا خۆیان بێبەش نەکرد لە جیهادی رێی خوا.

ئیبن عەبباس دەڵێت: لە رۆژی بەدردا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: کێ ئاواو ئاوا دەکات و ئەوەندە و ئەوەندە پاداشتی دەستبکەوێت، خێرا گەنجەکان پێشبڕکێیان لەسەری دەکرد و بەتەمەنەکانیش لەژێر ئاڵاکاندا دەمانەوە.[2]

عەبدورەحمان دەڵێت: لە بەدردا لە ریزدا وەستابووم، تەماشای راست و چەپی خۆم کرد، دوو جەحێلی پشتیوانانم بینی، یەکێکیان وتی مامە گیان ئەبووجەهل دەناسیت؟ وتم بەڵێ، بۆچیتە برازاکەم؟ وتی بیستوومە قسەی وتووە بە پێغەمبەر(ﷺ)، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر بیبینم وازی لێ ناهێنم تا دەیکوژم یان دەمکوژێت، ئەوی تریش هەمان شتی پێ وتم، منیش نیشانم دان و ئەوانیش کوشتیان و دواتر هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی کامتان کوشتی؟ هەرکامیان وتی من، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی

---

[1] أسد الغابة، ج٤،ص ٢٢٠.

[2] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب المغازي - غزوة بدر الكبرى وما كانت وأمرها، الرقم ٣٧٨١٦.

کەستان شمشێرەکەتان سڕیوە؟ وتیان نا، سەیری هەردوو شمشێرەکەی کرد و فەرمووی هەردووکتان کوشتووتانە، ئەو دوانەش بریتی بوون لە موعازی کوڕی عەمر و موعازی کوڕی عەفرا.[1]

موعاز لە غەزای ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تردا هاودەم بە پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری کرد و لە تاکە غەزایەکیش دوانەکەوت.[2]

**مەیدانی پەرستش:**

موعاذی کوڕی جەبەل پێشنوێژی بۆ هۆزەکەی دەکرد، ئەمەش بە ئاگاداری پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەکاتێکدا کەسانێک لەناو هۆزەکەیدا هەبوون تەمەنیان لە موعاز زیاتر بوو، موعازیش گەنجێک بوو تازە پێگەیشتبوو. [3]

ئەم پەروەردەیە رەنگدانەوەی لەسەر هاوەڵان هەبوو و ئەوانیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵ گەنجاندا دەکرد، بۆیە گەنجانێکی ناو ئوممەتیان دەناردە پێشەوە بۆ پێشنوێژی.[4]

**گلەیی لە گەنجان:**

زۆرجار گەرموگوڕی گەنجان و سروشتی بیرکردنەوەو جووڵەیان، بەرخوردی دەبێت لەگەڵ دنیابینی کەسە بەتەمەنەکاندا، ئەم حاڵەتەش بە درێژایی مێژوو هەبووە، لە کۆمەڵگەی پێغەمبەریشدا(ﷺ) ئەم حاڵەتە جارجارە روویدەدا و پرسەکان دەبرانەوە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش رێی دروستی نیشان دەدان، جار هەبوو بە وەستاندنی گەنجەکە و ئاراستەکردنی، جاریش هەبوو بە وەستاندنی بەتەمەنەکان و تێگەیاندنیان لە دیوی راستەقینەی حاڵەتەکە.

---

[1] صحيح البخاري، الرقم ٢٩٨٩، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٨٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٩١٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٣٦.

[3] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٤٣١، ، صححه شعيب الأرناؤوط و قال إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[4] المستدرك على الصحيحين – كتاب الإمامة وصلاة الجماعة – من أدرك ركعة فقد أدرك الصلاة، الرقم ٧٩٠ و وصححه ووافقه الذهبي.

جارێک سولەیم هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە دەخەوین ئینجا موعازی کوڕی جەبەل دێت بۆ لامان، لە رۆژیشدا لە کاتی کارماندا کە کاتی نوێژ دێت، دێت و نوێژێکی زۆر دوورودرێژمان پێ دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (**يا معاذ بن جبل، لا تكن فتانا، إما أن تصلي معي، وإما أن تخفف على قومك**)، (ئەی موعاز خەڵک لە دین رامەفڕێنە، یان نوێژ لەگەڵ من بکە، یان نوێژت بۆ هۆزەکەت کورت بێت).[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بۆ تۆڵەی موئتە سوپایەکی پێکەوەنا و ئاڵاکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەید، لەنێو سوپاکەیدا ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەندین هاوەڵی تری گەورە هەبوون، لەسەر ئەوە کەسانێ نارەزاییان دەربڕی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لەتاو ئازار سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و بۆ قەناعەت پێکردنی خەڵک وتارێکی فەرموو و پێی سەلماندن کە ئوسامەی گەنج شیاوی ئەو بەرپرسیارێتییەیە، فەرمووی (ئەی خەڵکینە، ئەو قسەو باسە چیە لە هەندێکتانەوە پێم گەیشتوەتەوە سەبارەت بەوەی ئوسامەم بە ئەمیر داناوە، ئەگەر تانە دەدەن لە ئەمیرایەتی ئوسامە، پێشتریش تانەتان دا لەوەی باوکیم بە ئەمیر دانا، ئەرێ بەخوا ئەو کەسە بۆ ئەمیرایەتی دروست کرابوو و دوای خۆیشی کوڕەکەشی بۆ ئەمیرایەتی دروست کراوە...)[2]

**گەنج و سەرکردایەتی:**

هاوەڵە گەنجەکان هەردەم ئەرکە گرنگ و هەستیارەکانیان پێ دەسپێردرا، مەسەلەکەش پەیوەست نەبوو بە گەرموگوڕی و چالاکییانەوەو بەس، بەڵکو لەگەڵ سورشتی کەسەکاندا دەهاتەوە، گەنجێک کە توانای سەرکردایەتی

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٠١٧٣، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.

[2] ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص١٩٠.

سەربازی هەبوو، ئەرکی زانستیی پێ نەدەسپێردرا، بە پێچەوانەشەوە، ئەم حاڵەتە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نیشان درا و لە سەردەمی راشیدینیشدا شوێن پێی هەڵگیرا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) موعازی کوڕی جەبەل راسپارد وەک والی یەمەن لەکاتێکدا هێشتا تەمەنی نەگەیشتبوویە سی ساڵان.

موعاز دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) منی نارد و فەرمووی (إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ افْتَرَضَ عَلَيهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ افْتَرَضَ عَلَيهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ).[1] (تۆ دەچیت بۆ لای خەڵکێک لە ئەهلی کیتاب، جا بانگیان بکە بۆ شایەتی ئەوەی هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا، ئەگەر گوێڕایەڵت بوون بۆ ئەوە، ئەوکات فێریان بکە کە خوا لە هەموو شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژی فەرزی لەسەریان واجب کردووە، ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵت بوون ئەوە فێریان بکە کە خوا صەدەقەی لەسەریان داناوە تا لە دەوڵەمەندەکانیان وەربگیرێت و بدرێتەوە بە هەژارانیان، ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵت بوون ئەوە وریابە چاکترینی سامانیان نەبەیت، لە نزای ستەملێکراویش بترسە چونکە پەردە نیە لە نێوان نزای ستەم لێکراو و خوادا).

موعاز دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) منی نارد بۆ یەمەن، لەگەڵم هات و وەسیەتی بۆ دەکردم، من لەسەر سوارەکەم بووم و پێغەمبەریش(ﷺ) بە پیادە، دواتر فەرمووی: ئەی موعاز لەوانەیە دوای ئەمساڵ بە من نەگەیتەوە، لەوانەیە بدەیت بە لای مزگەوت و گۆڕەکەمدا، منیش لەتاو جیابوونەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەستم کرد بە گریان.[2]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب الأمر بالإيمان بالله ورسوله وشرائع الدين والدعاء إليه، الرقم ١٩.

[2] صحيح ابن حبان، الرقم ٦٤٨، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٤٧٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٧٠٦٠،

دواین هەنگاوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێش وەفاتی، ئامادەکردنی سریەیەک بوو بە سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەید بۆ هێرش بردنە سەر بەلقا، سوپاکە گەورە هاوەڵانی وەک عومەری کوڕی خەطابیشی تێدابوو.[1]

کاتێک جەنگی یەمامە روویدا و تیایدا ژمارەیەکی بەرچاو لەو هاوەڵانە شەهید بوون کە قورئانیان لەبەربوو، عومەری کوڕی خەططاب ترسی لێ نیشت و پێشنیاری کۆکردنەوەی قورئانی بۆ ئەبووبەکری صدیق خستەڕوو، ئەبووبەکر ترسی هەبوو ئەوە جۆرێک لە بیدعە بێت، بەڵام دواتر قەناعەتی بۆ دروستبوو و لەسەر راسپاردەکەی عومەر، داوای لە زەیدی کوڕی ثابت کرد ئەرکی کۆکردنەوەی قورئان بگرێتە ئەستۆ، چونکە زەیدی لەو بوارەدا پێشینە و تایبەتمەندی و رەزامەندی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هەبوو و کەسێکی جێمتمانە و گەنج و بەتواناش بوو، زەیدیش هەرچەندە ئەرکەکەی لا قورس بوو، بەڵام بە بڕیارەکە رازی بوو و لە ماوەیەکی کەمدا ئەرکەکەی بەجێگەیاند.[2]

دوای ئەوەی نووسینەوەی قورئان لە دوو توێی بەرگێکدا نووسرایەوە، نوسخەکە لای ئەبووبەکری صدیق هەڵگیرا و هەتا کاتی وەفاتی لای خۆی بوو، ئینجا درایە لای عومەری کوڕی خەططاب.[3]

**راوێژ بە گەنجان:**

عومەری کوڕی خەططاب وێڕای ئەوەی خەلیفەی موسڵمانان بوو و سەرقاڵ بوو بە جەنگی دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی ڕۆم و فارسەکانەوە، کەچی کاتێک کێشەیەکی دەهاتەڕێ، یان پرسێک بخرایەتە بەرباس، گەنجەکانی کۆدەکردەوەو ڕاوێژی پێ دەکردن،[4] چونکە دەیزانی لەوانەیە کۆمەڵێک پێشنیار و ڕاوبۆچوونیان هەبێت کە هیچکات لای گەورەکان دەست نەکەوێت.

---

صححه شعيب الأرناؤوط.

[1] ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج١، ص١٠٤.

[2] صحيح البخاري، الرقم ٤٤١٠.

[3] صحيح البخاري، الرقم ٤٧٠٥.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٨، ص ٣٧٣.

# منداڵە هاوەڵەکان

هاوەڵە منداڵەکان بەخششێکیان پێ بەخشرابوو جیاواز لە هەر بەخششێکی دی، ئەوان بەر تاقیکردنەوەی سەختی پشتگیری یان بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەکەوتن، چونکە بەڕاستی سەختترین تاقیکردنەوەی هاوەڵان ئەوەبوو باوەڕ بە کەسێک بهێنن کە لەنێویاندا دەژیا و لە کتوپڕێکدا بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کرد، زۆرکەس لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرنەچوون، بەڵام هاوەڵە منداڵەکان هەرکە هۆشیان کردەوە لەگەڵ دایک و باوکیاندا ئیسلامیان دەبینی و دەبیست.

**کەشی لەبار:**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەمینەسازییەکی تایبەتی کرد بۆ هاتنەدنیای هاوەڵە منداڵەکان، ڕێنمایی بە دایک و باوکەکان دەدا لەو ساتەوەی دەچوونە لای یەک هەتا ئەو کاتەی کوڕ و کچەکانیان دەچوونە نێو ژیانی هاوسەرگیری و دوای ئەوەیش، بۆ نموونە:

هاوەڵان فێرکرابوون لەکاتی سەرجێیدا نزا بکەن خوای گەورە ئەو منداڵەیان دووربگرێت لە شەیتان کە پێیان دەبەخشێت (بِاسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا).[1]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) منداڵی بە خەڵاتی خوا وەسف کردووە، بۆیە بە هاوەڵانی دەفەرموو (إِنَّ أَوْلَادَكُمْ هِبَةُ اللهِ لَكُمْ، يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا، وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ

---

[1] صحيح البخاري - كتاب بدء الخلق - باب صفة إبليس وجنوده، الرقم ٣٢٧١.

الذُّكُورَ)،[1] (منداڵەکانتـان خـەڵات و دیاریـی خـوان بـۆ ئێـوە، خـوای گـەورە بـۆ هـەر کەسێک بیەوێت، کچی خـەڵات دەکات، بۆ هـەر کەسیش بیەوێت، کوڕی خـەڵات دەکات).

بەرپرسیاریێتی دینداری منداڵـەکان و پاراستنی فیترەتـی پاکیانـی خستە ئەستۆی دایکان و باوکان (كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ)،[2] (هەموو لەدایکبوویەک لەسەر فیترەت لەدایک دەبێت، ئـەوە دایک و باوکـی ئـەون هـۆکارن بـۆ بەمەسیحی بوونـی یـان جوولەکەبوونـی یـان ئاگرپەرست بوونـی).

سـەروەرمان دەیفەرمـوو (لَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ)،[3] (نـزای خـراپ مەکـەن لـە منداڵەکانتـان).

خۆشەویستمان خـۆی چاودێری پـەروەردەی هاوەڵـە منداڵەکانی دەکرد و لێپێچینـەوەی لـە دایـک و باوکـەکان دەکـرد، بـۆ نموونـە: عەبدوڵای کـوڕی عامیـر باسـی بەسـەرهاتێک دەکات کـە هێشـتا منـداڵ بـووە، دەڵێـت: ڕۆژێـک پێغەمبـەر(ﷺ) لـە ماڵـی خۆمـان دانیشـتبوو و دایکیشـم بانگـی کـردم و وتـی: وەرە بـا بتدەمـێ، پێغەمبەریـش(ﷺ) بـە دایکمـی فەرمـوو: دەتویسـت چـی پـێ بدەیت؟ ئەویش وتـی: خورمـای دەدەمـێ، پێغەمبەریش(ﷺ) پێـی فەرمـوو (أَمَا إِنَّكِ لَوْ لَمْ تُعْطِهِ شَيْئًا كُتِبَتْ عَلَيْكِ كِذْبَةٌ)[4] (ئەگـەر هیچـت پـێ نەدایـە، ئـەوە درۆیەکت لەسـەر دەنووسـرا).

جارێک عەمرەی کچی ڕەواحە کە ژنی بەشیری کوڕی سـەعد بـوو، داوای لـە بەشـیر کـرد بەشـێک ببڕێتـەوە بـۆ نوعمانـی کـوڕی، بـەڵام ئـەو ڕازی نەبـوو، دواتـر دوای دوو جـار[5] پـاش یـەک سـاڵ بەشـیر ڕازی بـوو، بـەڵام عەمـرە وتـی:

---

[1] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣١٤١ و صححه و وافقه الذهبي.
[2] صحيح البخاري - كتاب الجنائز - باب ما قيل في أولاد المشركين، الرقم ١٣٨٥.
[3] صحيح مسلم، كتاب الزهد والرقائق، الرقم ٣٠١٤.
[4] سنن أبي داود، باب في التشديد في الكذب ، الرقم ٤٩٩١ ، صححه الألباني.
[5] صحيح ابن حبان، كتاب الهبة، الرقم ٥١٠٤..

نابەخوا، رازی نابم هەتا دەستی نەگریت و نەیبەیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەیت بە شایەت، بەشیریش منداڵەکەی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من بەشێکی سامانم بڕیوەتەوە بۆ ئەم کوڕەم و دایکی ئەم کوڕەشم دەیەوێت تۆ شایەت بیت لەسەر ئەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا جگە لەمە منداڵی ترت هەیە؟ وتی بەڵێ، فەرمووی ئایا ئەوەی بۆ ئەمت بڕیوەتەوە، بۆ هەموو ئەوانیشت بڕیوەتەوە؟ وتی نا،[1] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (فَإِنِّي لَا أَشْهَدُ عَلَى هَذَا، هَذَا جَوْرٌ، أَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي، اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلَادِكُمْ فِي النُّحْلِ، كَمَا تُحِبُّونَ أَنْ يَعْدِلُوا بَيْنَكُمْ فِي الْبِرِّ واللطف).[2] (دەی من نابمە شایەت بۆ شتی وا، ئەوە ستەمە، بڕۆ کەسی تر جگە لە من بکە بە شایەت بۆی، لەنێوان منداڵەکانتاندا دادپەروەر بن لە بەشدا، وەک چۆن حەز دەکەن ئەوان لە چاکەو میهردا لەنێوانتاندا دادپەروەر بن).

تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کورت دەکردەوە بۆئەوەی ژنە هاوەڵێک بچێت بەدەم گریانی کۆرپەکەیەوە، خۆی دەیفەرموو (إِنِّي لَأَقُومُ فِي الصَّلَاةِ ، أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي؛ كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ).[3] (جار هەیە کە هەڵدەستم بۆ نوێژ، مەبەستمە نوێژەکە درێژ بکەمەوە، کەچی گریانی منداڵێک دەبیستم، نوێژەکە درێژ ناکامەوە نەوەک بارگرانی دروست بکەم بۆ دایکی منداڵەکە).

**نزا بۆ کردن:**

خۆشی و تایبەتمەندییەکی هاوەڵە منداڵەکان ئەوەبوو کە راستەوخۆ بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتن، بەشێک لەوان نزای تایبەتی پێغەمبەریان(ﷺ) بە نسیب بوو، بۆ نموونە:

---

[1] صحیح مسلم، الرقم ١٦٢٣.

[2] صحیح ابن حبان، الرقم ٥١٠٤، صححه شعیب الأرناؤوط.

[3] صحیح البخاري، كتاب الأذان، الرقم ٧٠٧.

پێغەمبەر(ﷺ) ئیبن عەبباسی گوشی بە خۆیدا و فەرمووی (اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ)،[1] (خوایە حکیمەتی فێر بکە).

یان کاتێک ئومموسولەیم داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد نزا بکات بۆ ئەنەسی کوڕی مالیک، ئەو نزایەی بۆ کرد (اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ)،[2] (خوایە ماڵ و سامان و منداڵی زۆری پێ ببەخشیت و بەرەکەتیش بخەیتە بەخششتەوە بۆی).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی ناونانی منداڵە لەدایکبووەکاندا نزای خێری بۆ منداڵە هاوەڵەکان دەکرد، نموونەی ئەوانەش ئیبراهیمی کوڕی ئەبوموسای ئەشعەری[3] و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.[4]

بەشێک لەوانیش بە شێوەیەکی گشتی نزای پێغەمبەری خوایان بەرکەوت، بۆ نموونە ئەوکاتەی نزای کرد پشتیوانان و رۆڵەو نەوەکانیان (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ وَلِأَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ ، وَأَبْنَاءِ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ)،[5] (خوایە لە پشتیوانان خۆش بیت، لە رۆڵە و نەوەکانی پشتیوانانیش خۆش بیت).

**نازکێشان:**

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر نازی منداڵانی دەکێشا، گرنگیەکی زۆری پێ دەدان، لە باوەشی دەگرتن، لە قەڵادۆشکانی دەنان، ماچی دەکردن، یاری لەگەڵیاندا دەکرد، کە دەیدا بە لایاندا سەلامی لێدەکردن.

عەبدوڵای کوڕی جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە لە سەفەر دەهاتەوە، منداڵانی بنەماڵەکەی دەگرتە کۆش، جارێک پێشتر من برام بۆ لای و لە بەردەم خۆیدا سواری کردم، دواتر منداڵێکی فاطیمەش هێنرا بۆی و لە دوای خۆیەوە سواری کرد، ئیتر هەرسێکمان بەسەر سوارەکەوە بووین تا

[1] صحيح البخاري – كتاب فضائل الصحابة – باب ذكر ابن عباس، الرقم ٣٧٥٦.
[2] صحيح البخاري – كتاب الدعوات – باب قول الله تعالى وصل عليهم ومن، الرقم ٦٣٣٤.
[3] صحيح البخاري – كتاب العقيقة – باب تسمية المولود غداة يولد لمن لم يعق عنه وتحنيكه، الرقم ٥٤٦٧.
[4] صحيح البخاري – كتاب مناقب الأنصار – باب هجرة النبي(ﷺ) وأصحابه إلى المدينة، الرقم ٣٩٠٩.
[5] صحيح مسلم – كتاب فضائل الصحابة – باب من فضائل الأنصار، الرقم ٢٥٠٦.

چووینە ناو مەدینە.[1]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: جارێک ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، ئەقرەع وتی: خۆ من دە کوڕم هەیە، تا ئێستا هیچکامیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) سەیرێکی کرد و پاشان فەرمووی (مَن لا يَرْحَم، لا يُرْحَم).[2] (ئەوەی میهرو سۆزی نەبێت، میهر و سۆزی بۆ نیە).

هەمان نموونە لەنێو هاوەڵانیشدا بەدیدەکرا و بە جوانی لەو فەرموودەیە تێگەیشتبوون، بۆ نموونە کاتێک عومەری کوڕی خەططاب خەلیفە بوو، جارێک لەماڵەوە بوو کە یەکێک لە کاربەدەستەکانی ناو خیلافەتەکەی هات بۆ لای، تەماشای کرد عومەر ڕاکشاوەو منداڵەکانی چوونەتە سەر سکی و خەریکی گەمەن، کابرا ئەوەی پێ ناخۆش بوو، عومەریش سەری سوڕما لەو هەڵوێستەی کابرا و لێی پرسی: بۆچی تۆ لە ماڵەوە چۆنیت؟ ئەویش وتی: کە چوومەوە ماڵەوە کەس نوتقی لێوە نایەت، عومەر دەستبەجێ بڕیاری دا کابرا لە پۆستەکەی لاببات و پێی وت: تۆ بەرامبەر بە ژن و منداڵەکانت میهرەبان نەبیت، چۆن بەرامبەر بە ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) میهرەبان دەبیت![3]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێکەڵیی و سەردانی دەکردین، هێندە تێکەڵمان دەبوو هەتا جاری وا هەبوو، برایەکی بچووکم هەبوو کە باڵندەیەکی هەبوو و ناوی نابوو نوغەیر، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی باڵندەکەی براکەمی دەپرسی و دەیفەرموو (ئەبووعومەیر، ئەوە نوغەیر چی ئەکات؟).[4]

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر نازی ئوسامەی کوڕی زەیدی رادەگرت و گرنگی

[1] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب فضائل عبد الله بن جعفر(ﷺ)، الرقم ٢٤٢٨.
[2] صحيح البخاري، الرقم ٥٩٩٧، صحيح مسلم، الرقم ٢٣١٨.
[3] المستطرف في كل من مستطرف، ص ١٣٧.
[4] صحيح البخاري، كتاب الادب، الرقم ٦١٢٩.

پێدەدا، دایکمان عائیشە لەو بارەوە دەگێڕێتەوە جارێکیان ئوسامەی کوڕی زەید لەبەردەرگا بوو، سەری بەر لاتەنیشتی دەرگاکە کەوت و سەری بریندار بوو، پێغەمبەر (ﷺ) بە منی فەرموو: بۆی بسڕە، بەڵام من بێزم لێکردەوەو نەمتوانی بۆی پاکراگرم، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بۆی سڕی و پاکی کردەوەو فەرمووی (لو كان أسامة جارية لكسوته وحليته حتى أنفقه)،[1] (ئەگەر ئوسامە کیژۆڵەیەک بوایە، جلم دەکردە بەر هەتا خەرجیشم دەکێشا).

دیارە ئەمە وانەیەک بووە بۆ دایکە عائیشە بۆ جارەکانی دی، هەروەک خۆی دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی چڵمی ئوسامە بسڕێت، منیش وتم: ڕێ بدە من ئەوە بکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی عائیشە، خۆشت بوێت چونکە من خۆشم دەوێت.[2]

ئەبوو هورەیرە دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە بازاڕی مەدینە بووم، سێ جار هەواڵی حەسەنی پرسی، ئینجا فەرمووی: (حەسەنی کوڕی عەلی بانگ بکە)، -حەسەنیش هێشتا منداڵ بوو- منیش چووم بینیم حەسەن دەڕوات بە ڕێدا و ملیوانێک لە ملیدایە، پێغەمبەر(ﷺ) باوەشی بۆ کردەوەو بە ئاماژەی دەست بانگی کرد، کە حەسەن هات، پێغەمبەر(ﷺ) گرتیە کۆش و فەرمووی (خوایە من خۆشم دەوێت، دەی تۆیش خۆشت بوێت).[3]

یەعلای عامیریی دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەچووین بۆ میوانداریيەک، لە نیوەی ڕێدا بینیمان حوسەین خەریکە لەگەڵ منداڵاندا یاریی دەکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چوویە پێشەوەی خەڵکەکەو باوەشی کردەوە بۆ حوسەین، ئەویش جارێک بەملادا و جارێک بەولادا رایدەکرد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بۆی پێدەکەنی و بەدوایدا دەرۆیشت هەتا گرتیە

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(ﷺ)، الرقم ٢٦٥٠١، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٩٤١٠.

[2] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب أسامة بن زيد(ﷺ) الرقم ٣٨١٨ و قال حسن صحيح.

[3] صحيح البخاري، الرقم ٥٨٨٤.

باوەش، دەستێکی خستە ژێر چەناگەی و دەستەکەی تریشی لەسەر پشتەملیی دانا، ماچی کرد و فەرمووی (حُسَيْنٌ مِنِّي، وَأَنَا مِنْ حُسَيْنٍ)، (حوسەین لە منە و منیش لە حوسەینم).[1]

ئەمە تایبەت نەبوو بە کوڕەکانەوە، بەڵکو هەمان ناز و گرنگیپێدانی بۆ کچۆڵە هاوەڵەکانیش هەبوو، بۆ نموونە ئومموخالید کە کچێکی بچووک بوو و هاوەدەم بە دایکی لە حەبەشەوە گەڕابوویەوە، جلێکی بچووکی ڕەش هێنرابوو بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: ئومموخالیدم بۆ بهێنن، کە هێنرا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دەستی خۆی جلەکەی کردە بەری و فەرمووی (أبلي وأخلقي)، (کۆنی بکەیت و بیدڕیت)، واتە هێندە تەمەن بکەیت چەند جلی ئاوا کۆن بکەیت و بدڕێنیت، ئینجا بۆ ئەوەی دڵی ئومموخالید خۆش بکات، لەنێو دانیشتنەکەدا بە زمانی حەبەشی بەجیا ئومموخالیدی دەدواند و پێی دەفەرموو سەنەهـ سەنەهـ.[2] واتە جوانە، جوانە.

ڕوبەیعی کچی میعوەذ دەڵێت: جارێک پوورم منی نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، منیش کە چووم دەبینم برێک کاڵای لایە کە پاشای بەحرەین بە دیاری بۆی ناردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) پڕی هەردوو دەستی پڕکرد و فەرمووی: (کچە شیرینەکەم ئەمە بۆ تۆ).[3]

ئومامە کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، هێشتا منداڵ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خۆشیدەویست، تەنانەت کە نوێژی دەکرد، ئومامەی دەگرتەباوەش، کە دەچوو بە سوجدەدا، دایدەنا، کە هەڵدەسایەوە، هەمدی دەیگرتەوە باوەش.[4]

**نەشکاندنەوە:**

خۆشەویستمان هیچکات دەروونی منداڵی نەدەشکاندەوە، بەڵکو نموونەیەکی پێشکەش کرد کە بیانووی زۆر موسڵمانی بڕی بۆ لێدان یان

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٤٨٤٨ وصححه و وافقه الذهبي.
[2] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٤٢٧١ ، المعجم الکبیر للطبراني، الرقم ٢٤٠.
[3] المطالب العالیة لابن حجر، الرقم ٣٩١٩.
[4] صحیح البخاري، کتاب الصلاة، الرقم ٥١٦، صحیح مسلم، الرقم ٥٤٣.

زبری نواندن بەرامبەر بە منداڵان، هەر زبرییەک بەرامبەر بە منداڵان بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێکی بەجێگەیاندنی ئەرکە بەرامبەر بەو منداڵە.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم(ﷺ) کرد، هەرچیەکی پێ فەرمووبم بیکەم و تیایدا کەمتەرخەم بووبم یاخود نەمکردبێت، هەرگیز سەرکۆنەی نەدەکردم، تەنانەت ئەگەر کەسێکی نزیکیشی یان خاوخێزانی سەرکۆنەیان بکردبام ڕێگری لەوانیش دەکرد.[1]

جارێک ژمارەیەک لە هاوەڵان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دانیشتبوون، پاش ماوەیەک برێک ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش لە ئاوەکەی نۆشکرد، ئینجا سەیری کرد لەلای ڕاستیەوە مێردمنداڵێک دانیشتبوو، لای چەپیشیەوە کۆمەڵێک پیاوی بەتەمەن دانیشتبوون، بەپێی ئەو سوننەتەش کە پێغەمبەری خوا هاوەڵانی فێرکردبوو، مافی کەسی دەستەڕاستە سەرەتا ئاوی بۆ ببرێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بوو بەتەمەنەکان پێش بخات، لەگەڵ ئەوەشدا شکۆی کەسێتی ئەو مێردمنداڵەی لەبیر نەکرد و پێی فەرموو: (يَا غُلَامُ، أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ الْأَشْيَاخَ)، (ئایا مۆڵەتم دەدەیت ئاوەکە بدەم بەو پیاوە بەتەمەنانە؟)، مێردمنداڵەکەش بێ ترس وەڵامی دایەوە (ئەی پێغەمبەری خوا ئامادە نیم لەو ئاوەی تۆ لێت نۆشکردووە بەش و سەرەی خۆم واز لێبهێنم و بیدەم بە هیچ کەسێکی تر)، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بێ ئەوەی هیچ سەرکۆنەیەکی بکات، ئاوەکەی پێدا.[2]

**بیروباوەڕ و پەرستش:**

مەسەلەی ئیمان لای هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) گرنگترین پرس بوو، تەنانەت ئەوان پێش فێربوونی قورئان مەسەلەی ئیمانیان فێردەکرا، هەروەک هەریەک

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٦٢٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب الشرب والمساقاة - باب من رأى أن صاحب الحوض والقربة أحق بمائه، الرقم ٢٣٦٦.

لە ئیبن عومەر[1] و جوندوبی کوڕی عەبدوڵا ئاماژەیان پێداوە.[2]

ئیبن عەبباس بەسەرهاتێکی سەردەمی منداڵی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاری دەکردم، فەرمووی (يَا غُلَامُ ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ؛ احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ ، لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ ، وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ ، رُفِعَتِ الْأَقْلَامُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ)،[3] (هۆ رۆڵە، چەند وتەیەکت فێردەکەم بیانزانە، سنووری خوا بپارێزە خوا دەتپارێزێت، سنووری خوا بپارێزە دەبینیت دێت بەدەمتەوە، ئەگەر داواتکرد لە خوا داوابکە، ئەگەر پشتت بە کەسێک بەست پشت بە خوا ببەستە، ئەوەش بزانە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە لەسەرئەوەی سوودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن سوودێکت پێ بگەیەنن مەگەر ئەوەی خوا بۆی نووسیویت، ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە لەسەرئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن زیانێکت پێ بگەیەنن مەگەر ئەوەی خوا لەسەری نووسیویت، قەڵەمەکان هەڵگیراون و پەڕاوەکان وشکبوونەتەوە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێنمایی هاوەڵانی دەکرد گرنگی بدەن بە نوێژی منداڵەکانیان و پشتگوێی نەخەن، پێی دەفەرموون (مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِينَ)،[4] (کە منداڵەکانتان تەمەنیان گەیشتە حەوت ساڵان لەسەر نوێژ ڕایانبهێنن، کە گەیشتنە دە ساڵی لەسەر نوێژنەکردن لێدانی تەمبێکردنیان بۆ بەکاربهێنن).

منداڵە هاوەڵەکان وێڕای ئەوەی فێری فەرزەکان دەکران، هاوکات سوننەتەکانیشیان فێر دەکرا، بۆ نموونە نوێژی ئیستیخارە کە بەداخەوە لەمڕۆدا بەشێک لە موسڵمانە گەورەکانیش لەمەڕ ئەم سوننەتە هۆشیارییان

[1] المستدرک علی الصحیحین – کتاب الإیمان – کیف یتعلم القرآن، الرقم ١٠٢ و صححه ووافقه الذهبي.
[2] سنن ابن ماجه – أبواب السنة – باب في الإيمان، الرقم ٦١، صححه الألباني.
[3] جامع الترمذي – أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله، الرقم ٢٥١٦ وقال حسن صحيح.
[4] سنن أبي داود – كتاب الصلاة – باب متى يؤمر الغلام بالصلاة، الرقم ٤٩٥.

نیە، جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چۆن فێری سوورەتێکی قورئانی دەکردین، ئاوایش فێری ئیستیخارەی دەکردین بۆ هەموو شتێک.[1]

بنیادی زانستی:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گرنگییەکی زۆری دەدا بە بنیادی زانستی منداڵە هاوەڵەکان، ئەمەش لە ڕێڕەوی ژیانی قۆناغی مەدینەیدا بە روونی بەدیدەکرێت، هەر لە جەنگی بەدرەوە کە یەکەم جەنگی یەکلاکەرەوەی موسڵمانان بوو، کاتێک دیلە بێباوەڕەکان لەبەردەستدا بوون، یەکێک لە مەرجەکانی خۆئازادکردنی دیلی بێباوەڕ ئەوەبوو منداڵە هاوەڵەکان فێری خوێندن و خوێندنەوە بکات.

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەیدی راسپارد بچێت فێری زمانی جوولەکەکان ببێت، خۆی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردم فێری نووسینی جوولەکەکان ببم و فەرمووی (إِنِّي وَاللهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابِي)، (بەخوا بێخەم نیم لە جوولەکە لە ئاست نووسراوەکانم)، منیش چووم و نیو مانگم بەسەردا تێنەپەڕی هەتا فێری بووم، ئیتر ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) نووسینێکی بە زمانی ئەوان بنووسیایە من بۆم دەنووسی، ئەگەر نووسراوێکی ئەوانیشی بۆ بهاتایە من بۆم دەخوێندەوە.[2]

ئەم جۆرە بایەخدانە بە کەمتەمەنان و ڕێزگرتنەیان لەلایەن پێغەمبەری خوا و هاوەڵانیەوە، ڕەنگدانەوەی هەبووە بەسەر مێژووی ئیسلامیدا و بە هەزاران نموونەی ناوازە لەو بارەوە لە ناوچە و نەتەوەو کاتە جیاوازەکاندا بەدیدەکەین، تەنها بۆ نموونە:

ئیمامی بوخاری نەگەیشتبوویە دە ساڵان ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی لەبەر کردبوو. لە شانزە ساڵیدا دەیان کتێبی لەبەر کردبوو.

ئیبن مەندە لە هەشت ساڵیدا فەرموودەی وەرگرتووەو گێڕاویەتیەوە.

---

[1] صحيح البخاري – أبواب التهجد – باب ما جاء في التطوع مثنى مثنى، الرقم ١١٦٢.

[2] سنن أبي داود – كتاب العلم – باب رواية حديث أهل الكتاب، الرقم ٣٦٤٥.

ئیبـن ئەبیلفەروارسـی فەرمووودەنـاس لـە هەشـت سـاڵیدا فەرمـوودەی وەرگرتـووە.

ئیبنونەججار لە دە ساڵیدا فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ئیمامی بیرزالی فەرموودەناس لە هەشت ساڵیەوە فەرموودەی وەرگرتووە.

ئەبوونوعەیم لە تەمەنی هەشت ساڵیدا فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ئیبن حەجەر لە نۆ ساڵیدا هەموو قورئانی لەبەرکردووە.

ئیبن عەبدولبەر لە پانزە ساڵیەوە فەرموودەی وەرگرتووەو گێڕاوەتەوە.

بۆیـە جێی خۆیەتـی ئێمـەش ڕێـزی کەمتەمەنەکانمـان بگریـن و بـە چـاوی کەم تەماشـایان نەکەین، گوێیان بۆ بگرین، تەنانـەت زۆرجار گوێیـان لێبگرین، نـەوەک بێباکانـە گوێیـان بگریـن و بیانشـکێنین.

**بنیادی کەسێتی:**

پێغەمبـەر(ﷺ) و هاوەڵانـی گرنگییەکـی زۆریـان دەدا بـە بنیـادی کەسـێتی هاوەڵـە منداڵـەکان، بۆیـە لەگـەڵ خۆیـان دەیانبردنـە نێـو مزگـەوت و وتـاری هەینیـەوە، دەیانبردنـە کـۆڕی دانیشـتنی گەورەکانـەوە، لەکاتـی دیارنەبوونیـان هەواڵیـان دەپرسـین، لەکاتـی نەخۆشـکەوتنیان دەچـوون بـۆ سـەردانیان تـا ئاسـتێک پێغەمبـەری ئوممەتێـک و سـەرکردەی وڵات بەتایبـەت دەچـوو بـۆ سـەردانی منـداڵان، وەک سـەردانی بـۆ لای براکـەی ئەنـەس کاتێـک نەخـۆش بـوو، تەنانـەت جوولەکەکانیـش لەمـە بێبـەش نەبـوون، بەڵکـو خۆشەویسـتمان سـەردانی منداڵـی نەخۆشـی جوولەکەکانیشـی دەکـرد.

ئەنەسـی کـوڕی مالیـک دەڵێت: مێردمنداڵێکی جوولەکـە هەبـوو کـە خزمەتـی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) دەکـرد، ئەوەبـوو نەخـۆش کـەوت، پێغەمبـەری خوایش(ﷺ) چـوو بـۆ سـەردانی، لـەلای سـەری مێردمنداڵەکـەوە دانیشـت، پێـی فەرمـوو: موسـڵمان بـە، ئەویـش تەماشـایەکی باوکـی کـرد، باوکیشـی پێـی وت: بـە گوێـی بکـە، مێردمنداڵەکـەش موسـڵمان بـوو، دواتـر کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)

چوویەدەرەوە، دەیفەرموو (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ)،[1] (سوپاس بۆ خوا کە لە دۆزەخ دەربازیی کرد).

عەبدوڵای کوڕی عومەر لەلایەن باوکیەوە دەبرایە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، وەک چۆن خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێک لەنێو هاوەڵاندا پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەبارەت بە دارێک پرسیاری لە هاوەڵان کرد کە لە موسڵمان دەچێت، هاوەڵەکان هەرکامیان ناوی دارێکی دەشت و دەریان دەهێنا، منیش لە دەروونی خۆمدا دەموت دارخورمایە، بەڵام شەرمم کرد بیڵێم، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دارخورمایە، منیش دواتر بۆ باوکمم گێڕایەوە کە چۆن لە دڵی خۆمدا دەموت دارخورمایە بەڵام شەرمم دەکرد بیڵێم، ئەویش پێی وتم: ئەگەر بتوتایە ئەوەم لا خۆشتربوو لەوەی فلانەشت و فیسارە شتم دەستبکەوتایە.[2]

---

[1] صحيح البخارى، كتاب الجنائز، الرقم ١٣٥٦.

[2] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب الحياء في العلم،الرقم ١٣١.

# هاوەڵان و فتووحاتی ئیسلامی

یەکێک لە پرسە هەستیارەکانی پەیوەست بە هاوەڵان، بریتیە لە مەسەلەی فتووحات، چونکە لەلایەن نەیاران یاخود نەشارەزایانەوە وێنەیەکی ناشیرین بۆ ئەو بابەتە کێشراوەو بازاڕگەرمیشی بۆ کراوە، لەکاتێکدا کۆی مەسەلەی فتووحات لابردنی بەربەستەکانی بەردەم بانگەواز و سڕینەوەی دەسەڵاتی ستەم بووە.

گرنگترین ئەو گومانانەی سەبارەت بە فتووحات دەورووژێنرێن، لەم خاڵانەدا خۆیان دەبیننەوە:

مەبەستی هاوەڵان لە فتووحاتدا، ئەوان پێیان وایە مەبەستی ماددە و دەسەڵات و دنیا پاڵنەر بووە.

پەیڕەوی فتووحات، پێیان وایە پەیڕەوەکە بە ستەمەوە بووەو تاوانی زۆری تێدا ئەنجام دراوە.

ئاکامی فتووحات، پێیان وایە ئاکامەکانی فتووحات نەرێنی بون و سڕینەوەی گەلانێک و خستن و بچووککردنەوەی چەند ئایینێک و .. هتد بووە.

سەبارەت بە ئامانجی فتووحاتی ئیسلامی، دەتوانین بێ دوودڵیی بڵێین پەیوەست نیە بە دەستکەوتە دنیاییەکان و ململانێ لەسەر سەرمایە و قەڵەمڕەوی دنیایی، بەڵکو ئامانجی گەورەی فتووحات لابردنی بەربەستەکانی بەردەم بانگەواز و ڕێنموونی خەڵکە، خۆ ئەگەر مەبەستێکی دنیایی لەپشت فتوحاتەوە بوایە، دەبوو دەقی شەرعی ڕێگری نەکردایە لە حەجی بێباوەڕان پاش ئەوەی مەککە کەوتە دەست موسڵمانان، چونکە دەبوو بە سەرچاوەیەکی

گەورەی داهات و ناوەندێکی بەهێزی سەردان، ئەم بابەتەش لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ إِنْ شَاءَ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! چاک بزانن هەرچی هاوبەشدانەرو موشریکە ناپاک و پیسن لەبیروباوەڕو نیەتیاندا، لە باوو نەریتیاندا جا دوای ئەمساڵەیان (ساڵی نۆیەمی کۆچیی) نابێ نزیکی (کعبە) ببنەوە، خۆ ئەگەر لە هەژاری دەترسان، بە نەهاتنی ئەوان بۆ کڕین و فرۆشتن بۆ بازاڕەکانی مەککە دڵنیابن ئەگەر خوا بیەوێ لە ڕۆزی خۆی دەوڵەمەندتان دەکا، واتە: دەرگایەکی ترتان بۆ دەکاتەوەوگوزەرانتان باش دەکات چوون بەراستیی خوا زانایە، لەکارزان و کار جوانە).

جوانترین نموونەش وتوێژی موسڵمانانە لەگەڵ ڕۆستەمی سەرکردەی فارسەکاندا کە هەوڵ دەدات بە ماڵ و سامان رازییان بکات، بەڵام ئەم وەڵامە وەردەگرێتەوە (ئێمە بۆ بەدەستهێنانی دنیا نەهاتوین بۆ لاتان، بەڵکو بۆ داواکاری ئێمە ئاخیرەتە، ئەوە جاران بوو لەبەردەمتاندا دەکڕووزاینەوە و داوای ئەوەمان دەکرد کە لەبەردەستی ئێوەدا بوو، خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین و ئێمەش چووین بەدەم بانگەوازەکەیەوە بۆ دینی حەق).[1]

کاتێکیش ریبعی کە نێردراوی موسڵمانانە دەچێت بۆ دانووستان لەگەڵ ڕۆستەمدا، فارسەکان لە دیدگای خۆیانەوە شکۆی دارایی و کارگێڕی خۆیان نیشان دەدەن بۆ ئەوەی موسڵمانان سەرسام بکەن، سەرین و راخەری زێڕ یان بە زێڕ رووپۆشکراو و ترۆپکی رازاوەیی، لە بەرامبەردا ریبعی بە جلێکی دڕاوەوە خۆی کرد بە ژووردا و لەسەر زەویەکە دانیشت، راشکاوانە پێی وتن: ئێمە حەز ناکەین لەسەر ئەم رازاوەییە دابنیشین، کاتێکیش پرسیاری لێکرا مەبەستی هاتنتان چیە؟ وەڵامەکەی هیچ پەیوەست بە دنیا و

[1] ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الملوك و الأمم، ج٤، ص ١٦٧.

دەسەڵاتداری نەکرد (هاتوین هەتا بەندەکان لە پەرستشی بەندەکانەوە ببەین بۆ پەرستشی پەروەردگار، لە ستەمی ئایینەکانەوە بیانبەین بۆ دادپەروەری ئیسلام).[1]

هەروەها عوبادەی کوڕی صامت کاتێک روونکردنەوە بە مقۆقس دەدات پەیامەکە بە روونی دەخاتەڕوو (مەبەست و نیازی ئێمە جیهادی ڕێی خوا و شوێنکەوتنی رەزامەندی خۆیەتی، ئێمە کە جەنگی دوژمنانی خوا دەکەین بۆ بەدەستهێنانی دنیا و زۆربوونی سامان نیە .. هەرکام لە ئێمە باکی بەوە نیە قینتارێک زێڕی هەبێت یان تاکە درهەمێکیشی نەبێت، چونکە مەرامی هەرکام لە ئێمە بەم دنیایە پارووە نانێکە بیخوات و برسێتی شەو و رۆژەکەی نەهێڵێت، بەرگێکە خۆی پێ دابپۆشێت، هەرکام لە ئێمە تەنها ئەوەشمان هەبێت بەسمانە).[2]

ئەمەش شتێک نەبوو لەخۆوە پێی گەیشتبن، یان بۆ فرت و فێڵ بیڵێن، بەڵکو ئەوان کە لەپای موسڵمانبوونیان و پاراستنی پەیامی خوا ئامادەبوون دەستیان بچێتە ماڵ و سامانی خۆیان و خوێنی نزیکانیان، هەر ئەو پێغەمبەرەی شوێنی کەوتبوون و ئەم دیدەی بۆ دروستکردبوون، فێری کردبوون جیهاد تەنها لە رێی خوادا مانا و گەورەیی هەیە.

ئەبووهورەیرە دەڵێت: جارێک کابرایەک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسی وا هەیە دەیەوێت جیهادی رێی خوا بکات و مەبەستیشیەتی شتێک لە دەستکەوتی دنیای دەستبکەوێت، ئەویش فەمووی: (لَا أَجْرَ لَهُ)، هیچ پاداشتێکی بۆ نیە، هاوەڵان کە ئەوەیان بیست زۆر لەسەر دڵیان قورس بوو، بە کابرایان وت: بڕۆرەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا لەوانەیە جوان لێی تێنەگەیشتبیت، کابرایش رۆیشتەوەو هەمان پرسیاری کردەوەو هەمان وەڵامیشی وەرگرتەوە، هاوەڵان بۆ جاری سێیەم کابرایان ناردەوە و وتیان

[1] ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الملوك و الأمم، ج٤، ص ١٦٨.
[2] ابن عبدالحكم: فتوح مصر و المغرب، ص ٨٩.

لەوانەیە جوان لێی تێنەگەیشتبێت، کەچی هەمان وەڵامی وەرگرتەوە.[1]

هەر ئەم حاڵەتە بوو ئوممەتی بە گەنج و پیر و نێر و مێییەوە پەروەردەکرد لەسەرئەوەی مەبەستی لە جەنگدا تەنها سەرخستنی پەیامی خوا و گەیشتن بە شەهیدی بێت، لامان نامۆ نەبێت ئەم پەروەردەیە کەسی وا بەرهەم بهێنێت لە جەنگی یەرمووکدا تازەپێگەیشتوویەک بچێتە بەردەم ئەبووعوبەیدە و پێی بڵێت: ئەی ئەمیر، ئەمەوێت گیانی خۆم لەپێناو خوادا بەخت بکەم بەڵکو شەهیدیم پێ ببەخشرێت، مۆڵەتم دەدەیت بەشدار بم؟ ئەگەر هەر پەیامێکیشت هەیە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێم بڵێ با بیگەیەنم.[2]

لەوانەیە بوترێت جا چ پێویست دەکات بۆ گەیاندنی دین فتووحات ئەنجام بدرێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئایینی ئیسلام ئایینێک نیە کات و نەتەوەو شوێن و رەگەز سنوورداری کردبێت، ئایینێکی جیهانییە بۆ هەموو ئادەمیزاد هەتا رۆژی دوایی، ئەمەش بە دەقی روون باسکراوە:

(وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)

(ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانییەک بێت بۆ هەموو جیهانیان)

(تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا)

(بڵندو گەورەیە، پیرۆزو بە پیتە، ئەو خوایەی کە فورقان و جیاکەرەوەی ڕاست لە ناڕاستی ناردە سەر بەندەی خۆی موحەممەد(ﷺ) واتە: قورئان تابیێتە هۆی بێدارکەرەوەو ترسێنەر بۆ جیهانەکانی پەریی و ئادەمیزاد)

(وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ)

(ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد ئەی موحەممەد!(ﷺ)کە بۆ تەواوی خەڵکانی جیهان، ببێتە موژدە دەرو ترسێنەر بەڵام زۆربەی مەردم نازانن).

---

[1] سنن أبي داود - كتاب الجهاد - باب فيمن يغزو ويلتمس الدنيا، الرقم ٢٥١٢.

[2] الواقدي: فتوح الشام، ج١، ص ١٩٤.

کاتێک ڕێگری دەکرێت لە گەیاندنی پەیامی خوا بە جیهان و بەربەست لەبەردەم بانگەوازدا دروست دەکرێت، دەبێت بەربەستەکان لاببرێن نەوەک بە بیانووی حیکمەت و هێمنی و ئاشتەواییەوە ڕێ بدرێت دەستەیەکی گومڕا تاریکی بەسەر ئەو خەڵکەدا زاڵ بکەن وڕێ نەدەن باسی ڕووناکیشیان بۆ بکرێت، وەک ئەوەی کۆمەڵێک مامۆستا بیانەوێت شارێکی نەخوێندەوار فێری خوێندەواری بکەن، کەمینەیەکی زاڵی ستەمکاریش لەبەر بەرژەوەندی خۆیان بیانەوێت شارەکە وەک خۆی بمێنێتەوە، نەوەک ئەوەی شارەکە نادەنە دەست ئەو کۆمەڵە خوێندەوارە، بەڵکو ڕێ نادەن بچنە ناو شارەکەشەوەو خوێندەواری نیشانی ئەو خەڵکە بدەن، ئەوجا هەنگاونان بۆ لابردنی ئەو کەمینە ستەمکارە بە دەستدرێژی ناودەبرێت.

سەبارەت بە پەیڕەوی فتووحاتیش لە ڕێڕەوە گشتییەکەیدا پەیڕەوێکی ڕەوا و دروست بووە، ستەمی تێدا نەبووە، بەڵکو بۆ لابردنی ستەم بووە، سوپایەک کە نێردراوە بۆ فتووحات، تەنها فەرمانی پێ نەکراوە بچێت ئەو شوێنە بگرێت و بەس، بەڵکو ڕێکار و بڕیار و ڕێنمایی تایبەتی پێ دراوە پەیوەست بە بەها ئایینی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان و چەندین بواری دیکەش، بۆ نموونە ئەمانەش بەشێکن لە ڕێنماییەکانی ئەبووبەکری صدیق بۆ سوپای فتووحات:

ناپاکی و فڕت و فێڵ نەکەن.

جەستەی کوژراوان نەشێوێنن.

منداڵ و پیر و ئافرەت نەکوژن.

کەسانێک لە پەرستگاکاندان و موسڵمانیش نین، نەکوژرێن و پەرستشەکەشیان لێ نەشێوێنرێت.

داری بەردار نەبڕنەوە.

ئاژەڵ تەنها بۆ خواردن سەرببڕن.

ئەمانەش بە درێژایی ماوەی فتووحاتی ئیسلامی لەسەر دەستی هاوەڵان پەیڕەو کراوە، ئەگەرچی هەڵە و لادان لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) روویداوەو بۆ هاوەڵان راست کراوەتەوە، بەڵام حاڵەتی دەگمەن زاڵ ناکرێت بەسەر حاڵەتە گشتییەکەدا.

لێرەدا پێمان باشە زانیارییەکی پوخت و سەرەتایی لە بارەی فتووحاتی سەردەمی راشیدینەوە بخەینەڕوو، چونکە هاوەڵان جڵەوی ئەو فتووحاتەیان بەدەستەوە بوو، ئەگەرچی ئەم بابەتە پێویستی بە خوێندنەوەی زۆر ورد و فراوان هەیە، بەڵام لێرەدا تەنها سەربوردێکی خێرای لێ باس دەکەین.

## فتووحات لە سەردەمی ئەبوویەکردا

یەکەم گرفتی بەردەم ئەبووبەکری صدیق پاش هاتنەسەر دەسەڵات، مەسەلەی هەڵگەڕاوەکان بوو، خوای گەورە فەزڵی پێ بەخشی بتوانێت ئەو پرسە چارەسەر بکات، ئینجا بیری لەوە کردەوە جیهاد دژ بە فارس و رۆمەکانیش رابگەیەنێت، هۆکاری ئەمەش بریتی بوو لە:

یەکەم: هێشتنەوەی حەز و پەیڕەوی جیهاد لای موسڵمانان و نەمراندنی، چونکە ئەبووبەکر لە یەکەم وتاری رەسمی خیلافەتیدا دروشمێکی بەرزکردەوە (هەر قەومێک واز لە جیهاد بهێنن، خوای گەورە تووشی زەلیلییان دەکات).[1] پێشتریش مەبەستی جیهادمان خستەڕوو کە بۆ لابردنی بەربەستی بەردەم بانگەواز و نەهێشتنی ستەمە.

دووەم: بڕینی دەستی شاراوەی پشت دوژمنە نێوخۆییەکان، چونکە فارس و رۆمەکان ئەگەرچی بە راستەوخۆ هێرشیان نەدەبردە سەر موسڵمانان، بەڵام لە پشتەوە هاندەر و پشتیوانی بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکان بوون، ئەگەر سنووریان بۆ دانەنرایە، ئەگەر زۆر بوو بە چەشنی تر کێشە بۆ

---

[1] ابن هشام: السيرة النبوية،ج٢، ص ٦٦١، صحح إسناده ابن كثير في البداية والنهاية ج٥، ص ٢٦٩.

دەوڵەتی ئیسلامیی دروست بکەن.

سێیەم: ڕۆڵی موثەننای کوڕی حارثە لە قەناعەت پێهێنانی خەلیفە ئەبووبەکری صدیق تاوەکوو مۆڵەتی بدات لەگەڵ فارسەکاندا بجەنگێت.

ئەبووبەکری صدیق بۆ دەستپێکی فتووحات چەند هەنگاوێکی سەرەکی نا:

یەکەم: بانگهێشتکردنی موسڵمانان بۆ بەشداریکردن لە فتووحاتدا.

دووەم: ڕاوێژکردن بە گەورە هاوەڵان و کەسە شارەزاکان.

سێهەم: بێبەشکردنی هەڵگەڕاوەکان لە هەنگاوی یەکەمی فتووحاتدا.

چوارەم: دارشتنی پەیڕەو و ڕێنمایی تایبەت بە فتووحات و شێوازی مامەڵەی سوپای موسڵمانان لەگەڵ بەرامبەردا.

پێنجەم: ڕێکخستنی هێز و یەکەکان و دیاریکردنی ئامانج و نەخشە و ڕێوشوێنەکانی فتووحات.

**فتووحاتی عێراق:**

هەنگاوی یەکەم لە فتووحاتی عێراقدا لەلایەن موثەننای کوڕی حارثەوە نرا، کاتێک داوای لە خەلیفە کرد مۆڵەتی بدات هێرش بکاتە سەر خاکی عەجەم کە مەبەستی دەسەڵاتی فارسە ساسانیەکان بوو، ئەبووبەکریش مۆڵەتی پێدا،[1] موثەنناش ئەزموونێکی سەرەتایی سەرکەوتووی لەو بوارەدا نیشاندا.

زۆری نەخایاند ئەبووبەکری صدیق بازنەی هەوڵەکەی فراوانتر کرد و سێ یەکەی سەربازیی پێکهێنا و سەرکردەی هەر یەکەیەکی دەستنیشان کرد:

یەکەی خالیدی کوڕی وەلید لە یەمامەوە ڕوو بکاتە باشووری ڕۆژئاوای عێراق، جگە لەوەش لە مەدینە سوپای هاوکاریی بۆ نارد.[2]

[1] البلاذري: فتوح البلدان،ص ٢٣٨.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٣٧٦ – ٣٧٧.

یەکەی عیاضـی کـوڕی غەنـەم کـە لـە بەصـرەوە نزیـک بـوو رووبکاتـە بەشـی رۆژهەڵاتـی عێـراق، سـوپایەکی هاوکاریشـی بـۆ نـارد.[1]

سـوپاکەی خالیدی کـوڕی وەلیـد پێشـڕەوی دەسـتپێکرد و چەنـد جەنگێکی سـەخت و یەکلاکـەرەوەی ئەنجامـدا (جەنگـی ذاتوسەلاسـیل، جەنگـی مـذار، جەنگـی وەلجـە، جەنگـی ئولەییـس، جەنگـی حیـرە)،[2] لـە هەمـوو جەنگەکانـدا موسـڵمانان سـەرکەوتنیان بەدەسـتدەهێنا و ناوچەیەکی فراوانیان دەگرتەدەست و غەنیمەتێکی زۆریشـیان چنگ دەکەوت و ترس و بیمی سـوپای موسـڵمانانیش لـە دڵـی فارسـەکاندا نیشـت.

ئینجـا خالیـد حیـرەی کـردە بنکـەی سـەرەکی لـە عێـراق و لەوێـوە ئەمیری بۆ ناوچـەکان دەسـتنیشـان دەکـرد و کاروبارەکانـی رێکدەخسـت، ئینجـا قەعقاعـی کـرد بـە بەرپرسـی حیـرە و قۆناغێکـی نوێـی پێشـڕەوی دەسـتپێکرد، ئاڕاسـتەی پێشـڕەویەکەشـی رووەو هێزەکـەی عیاضـی کـوڕی غەنـەم بـوو بـۆ ئـەوەی هـەردوو هێزەکـە بدەنـەوە لـە یـەک، ئەوەبـوو هەریەک لـە ئەنبـار و عەیـن تەمـری فەتـح کـرد و لەوێشـوە لەسـەر داوای عیاض رووەو دەومەتەلجەنـدەل رۆیشـت و سـەرکەوتنێکی گـەورەی لـە جەنگەکانی دەومەتەلجەنـدەل و حوصەیـد و موصەیخـدا بەدەسـتهێنا، ئینجـا روویکـردە ناوچـەی فیـراض کـە خاڵـی پێکەوەبەسـتنی حیجـاز و شـام و عێـراق بـوو، لـەوێ بەرنـگاری سـێ هێـزی جیـاواز بوویـەوە، عەرەبـە بەکرێگیـراوەکان و هێزی رۆمـی و فارسـیەکان و هەرسـێ هێزەکـەی تێکشـکاند و سـەرکەوتنێکی گـەورەی بەدەسـتهێنا، دوای ئـەوە بـە فەرمانـی ئەبووبەکـری صدیـق موثەننـا کـرا بـە ئەمیـری عێـراق و خالیـدی کـوڕی وەلیـد راسـپێردرا رووبکاتـە وڵاتـی شـام.[3]

[1] تأريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٦.

[2] تأريخ الطبري، ج٣، ص ٣٤٩ – ٣٦٥.

[3] تأريخ الطبري، ج٣، ص ٣٧٣ – ٣٨٤.

**فتووحاتی شام:**

نیەتی هێرش بردنە سەر وڵاتی شام هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) پێشینەیەکی هەبوو، ئەمەش بنەڕەتێکی چاک بوو بۆ ئەبووبەکر و هاوەڵان تاوەکوو دوای دەستبەتاڵبوونیان لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان، بیر لەوە بکەنەوە دەرگای فتووحات بە رووی شامدا بخەنەسەر پشت، بۆیە لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا، ئەبووبەکری صدیق سەرەتا راوێژی بە گەورە هاوەڵان کرد و پاش مشتومڕێکی ورد لەوبارەوە کۆدەنگیەک لەسەر ئەوە دروست بوو رووەو شام پێشڕەویی دەستپێبکەن،[1] خەلیفە بانگهێشتنامەیەکی رەسمی نارد بۆ ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی بە مەبەستی بەشداریکردنیان لە فتووحاتی شامدا،[2] خێراش خەڵکێکی زۆر روویانکردە مەدینە بۆ بەشداربوون لەو سوپایەدا.[3]

یەکەمجار خالیدی کوڕی سەعیدی ئومەوی وەک ئەمیری سوپا راسپێردرا بۆ فتووحاتی شام، بەڵام دواتر ئەمیرایەتیەکە درا بە یەزیدی کوڕی ئەبووسوفیان[4] و هێزێکی پشتیوانیشی بۆ دانرا،[5] ئینجا سوپایەکی تری بە سەرکردایەتی شورەحبیلی کوڕی حەسەنە ئاراستەی ناوچەی حۆران کرد، سوپای سێیەمیش بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص رووەو فەلەستین نێردرا،[6] سوپای چوارەمیش بە سەرکردایەتی ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەڕاح رووەو حیمص نێردرا، سوپایەکی ئامادەش بە سەرکردایەتی عیکریمەی کوڕی ئەبووجەهل لە مەدینەدا پێکهێرنا بۆ ئەوەی ئامادەی هەر ئەگەرێکی لەناکاو بێت.[7]

---

[1] ابن عساكر: تأريخ دمشق، ج٢، ص ٦١ — ٦٤.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٥.

[3] البلاذري: فتوح البلدان،ص ١١١.

[4] البلاذري: فتوح البلدان،ص ١١٢.

[5] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٧.

[6] البلاذري: فتوح البلدان،ص ١١٢.

[7] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٦.

ئامانجی سەرەکی ئەم هێرشانە ئەوەبوو ئەو ناوچە عەرەبیانەی لەژێر چنگی بیزەنتیەکاندا بوون بخرێنە نێو دەسەڵاتی ئیسلامیەوە، شێوازی هێرشەکەش ئەوەبوو هەر سوپایەک لە بەرەیەکەوە هێرش ببات، سوپاکان بەو چەشنەی راسپێردرابوون بەڕێکەوتن و چەند بەریەککەوتنێک روویاندا، ناچار بیزەنتیەکان بیریان لە پەرتکردنی سوپای موسڵمانان کردەوە، موسڵمانانیش بۆ بەرگرتن بە پەرتەوازەیی سوپاکانیان، پاش راوێژ بە خەلیفەی موسڵمانان، بڕیاری یەکخستنی هێزەکانیان بۆ درا، ئینجا ئەبووبەکری صدیق هەستی بەوە کرد بارودۆخەکە پێویستی بە سەرکردەیەکی بەهێزی سەربازی هەیە، بۆ ئەمەش خالیدی کوڕی وەلیدی هەڵبژارد و بە رەسمی خالیدی کوڕی وەلیدی راسپارد عێراق جێبهێڵێت و سەرکردایەتی فتووحاتی بەرەی شام لە ئەستۆ بگرێت، ئەویش فەرمانی خەلیفەی بەجێگەیاند و رێیەکی زۆر تایبەت و مەترسیداری گرتەبەر و لە ماوەیەکی کەمدا سوپاکەی گەیاندە شام و سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی گرتە ئەستۆ و لە ماوەیەکی کەمدا سنوورێکی بەرفراوانی شام فەتح کرا، لە هەموو جەنگەکاندا موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەستدەهێنا و سەرتۆپی سەرکەوتنەکانیشیان لە جەنگی یەرمووکدا بوو،[1] لە ئەنجامدا دەستکەوتێکی زۆریان بۆ دەمایەوەو هێزی دوژمنیش تێکدەشکێنرا و سام و شکۆی موسڵمانانیش زیادی دەکرد، ئەمەش ئامادەکاریەک بوو بۆ فەتحی دیمەشق.

بە شێوەیەکی گشتی، فتووحات لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا بە پەیڕەوێکی شەرعی هەنگاوی نا و ئامانج و بنەماکانی جیهادی تێدا پەیڕەو کرا، ئەگەر لە هەندێک حاڵەتدا لادان و کەموکورتیەکیشی تێدابووبێت، لە رێڕەوە گشتیەکەدا توانی ئامانجی جیهاد و شێوازی پەیڕەو و هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەنجامەکاندا بە دروستی بەدیبهێنێت، تیایدا موسڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان بەدەستهێنا، لەوانە:

---

[1] ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٧، ص ٦ – ٢٠.

یەکەم: فراوانبوونی سنووری دەوڵەتەکەیان.

دووەم: بڵاوبوونەوەی بەرچاوی ئایینەکەیان، چونکە هاودەم بە هێزی سەربازی، هێزی بانگەوازیش لە ناوچەکاندا ڕۆڵی خۆی دەبینی.

سێیەم: شکانی هێزە نێودەوڵەتیەکانی سەردەم کە ساسانی و ڕۆمەکان بوون.

چوارەم: موسڵمانان لە مەیدانی ململانێی ناوخۆیی و ناوچەییەوە، چوونە نێو مەیدانی ململانێ نێودەوڵەتیەکانەوە و سام و شکۆیەکی زیاتریان پەیدا کرد.

پێنجەم: لە ڕووی ماددیەوە دەستکەوتێکی زۆر بۆ موسڵمانان زیادی کرد و بووژانەوەیەکی ئابووریی ڕووی تێکردن.

فتووحات لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا:

فتووحات لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا لە چەند بەرەیەکەوە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەرەوپێشچوونی بەخۆوە دی، تیایدا بە یەکجارەکی ئیمپراتۆریەتی ساسانی ڕووخێنرا و گورزی کوشندەش بەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کەوت.

**یەکەم: فتووحاتی عێراق و بەرەی ڕۆژهەڵات:**

عومەری کوڕی خەططاب وەک یەکەم هەنگاوی دەستبەکاربوونی لە خیلافەتەکەیدا، جاڕی جیهادی دا بۆ کۆبوونەوەی موسڵمانان و بەشداریکردنیان لەنێو سوپای موسڵمانان لە جەنگی ناوچەکانی عێراقدا، لە قۆناغی دووەمدا بانگهێشتەکە ئەو هۆزانەشی دەگرتەوە کە پێشتر لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوەو دواتر هاتبوونەوە نێو ریزی موسڵمانان،[1] ئەمەش جۆرێک لە ئاشتەوایی و تێکەڵکردنەوەی هەڵگەڕاوەکانی جاران بوو بە موسڵمانان تاوەکوو لە ئاست خەمخۆریی ئیسلام و موسڵماناندا خۆیان بە بەرپرسیار بزانن.

[1] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٢٧٤.

لە یەکەم هەنگاودا سوپایەکی گەورەی چەند هەزار کەسی پێکهێنرا، ئینجا خەلیفە ئەبووعوبەیدی ثەقەفی وەک ئەمیری سوپاکە دانا و ئەبووعوبەیدەش رووەو عێراق کەوتەڕێ و زنجیرەیەک جەنگ و بەریەککەوتنی لەگەڵ فارسەکاندا ئەنجامدا و لە زۆربەیاندا موسڵمانان سەردەکەوتن و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ساسانیەکان دەکەوتنە ژێر دەستی موسڵمانان،[1] دیارترین بەریەککەوتنەکانیش بریتی بوون لە: جەنگی نەماریق، جەنگی جیسر، جەنگی بوەیب جەنگی قادسیە، فەتحی مەدائین، جەنگی جەلەولا، فەتحی ئەهواز، فەتحی نەهاوەند

دوو جەنگی یەکلاکەرەوە بە نموونە وەردەگرین:

**جەنگی قادسیە:**

پاش شکستەکانیان، فارسەکان بەخۆکەوتنەوەو سوپایەکی گەورەیان پێکهێنا بۆ قەرەبووکردنەوەی شکستەکانیان، موثەننای کوڕی حارثەش سوپای موسڵمانانی کۆکردەوەو داوای سوپای پشتیوانیشی گەیاندە ناوەندی خیلافەت، خەلیفەش پاش راوێژ بە گەورە هاوەڵان، سوپایەکی گەورەی بە سەرکردایەتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص نارد، بە گەیشتنی سوپاکە لەسەر راسپاردەی خودی موثەننا، سەرکردایەتی سوپای موسڵمانان درایە دەست سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، سوپای ساسانیش بە سەرکردایەتی رۆستەم بە دەیان هەزار سەربازی پڕچەک و دەیان فیلەوە بەرەوڕووی سوپای موسڵمانان پێشڕەوییان کرد، سەرەتا وەفدی موسڵمانان چوویە لای رۆستەم و ئامانجی هاتنەکەیانی روونکردەوەو بانگهێشتی کردن بۆ نێو ئیسلام، رۆستەم چەشنی کیسرای دوێنێ تووڕەبوو و لە وەڵامدا جاڕی جەنگی دا، دواجار لە ناوچەی قادسیە بەریەککەوتنێکی سەخت روویدا و تیایدا موسڵمانان سەرکەوتن و شکستێکی کەمەرشکێن بەرۆکی

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٩، ص ٥٩٣-٥٩٩. – ٣٧.

ساسانیەکانی گرت.[1]

**فەتحی نەهاوەند (فەتحولفوتوح) و دەرهاویشتەکانی:**

سوپای فارسەکان لە ناوچەیەکی شاخاوی لە نەهاوەند کۆبوونەوەو بە بڕیاری یەزدگورد، سوپای فارسەکان لە ناوچە جیاجیاکانەوە روویانکردە ئەوێ و سوپایەکی سەروو سەدهەزار سەربازیی پێکهێنرا، هەواڵی ئەم ئامادەکاریانە گەیشتەوە بەر گوێی ئەمیری باوەڕداران، ئەویش پاش راوێژکردن بە گەورە هاوەڵان، بڕیاری دا سوپای موسڵمانان چاوەڕێی هێرشی فارسەکان نەکەن و ئەمان پێشڕەویی بکەن، بۆ ئەوەش سوپای هاوکاریی لە ناوچەکانی عێراقەوە نێردرا بۆ ئەو سوپایەی هێرشبردنەکەی پێ سپێردرابوو، سوپایەکی پشتیوانیش لە مەککەوە نێردرا، نوعمانی کوڕی موقرنیش کرا بە ئەمیری سوپاکە، کاتێک سوپای موسڵمانان نزیک بوونەوە، ترس و بیم دڵی فارسەکانی گرت و داوای دانووستانیان کرد، هەرچەندە دانووستانەکە کرا، بەڵام ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو، پاش گەمارۆیەکی زۆر، دواجار موسڵمانان سوپای دوژمنیان ناچار کرد لە سەنگەرەکانیان بێنەدەرەوەو هێرش بهێنن، جەنگێکی سەخت لەنێوان هەردوولادا روویدا و کوشتارێکی کەموێنە لە هەردوو سوپا کرا، سوپای فارسەکان تێکشکا و پاشەکشەیان کرد، لە پاشەکشەکەشیاندا رێیان لێ تێکچوو و ژمارەیەکی زۆریان لەناوچوون، دواتر موسڵمانان چوونە ناو نەهاوەند و دەستکەوتێکی بێشوماریان بۆ مایەوەو خەڵکەکەشی پەنا دران، ئیتر دوای ئەمە فارسەکان تەواو لەپێ کەوتن، لەبەر گەورەیی سەرکەوتنەکە، ئەم جەنگە بە فەتحولفوتوح ناسرا، بە دوای ئەمەشدا هەریەک لە (هەمەدان) و (رەی) و (قومس) (جورجان) و (طەبەرستان) و (ئازەربایجان) و (باب) بە رێککەوتن فەتح کران، فتووحات بەرەو ناوچەکانی رۆژهەڵات درێژەی کێشا و هەریەک لە شارەکانی (نەیسابوور) و (طووس) و (نسا) و (بەلخ) فەتح

[1] البلاذري: فتوح البلدان،ص ٢٥١ – ٢٥٥.

کران، سوپای فارسەکان لە هەر ناوچەیەک کۆدەبوونەوە، خێرا شکستیان دەهێنا، هێندە زۆریان بۆ هات کە داوای هاوکارییان لە پادشای چین کرد بچێت بە دەمیانەوە، بەڵام ئەوەش دادی نەدان، دواجار هەموو ناوچەکانی فارسەکان فەتح کران[1] و یەزدگوردیش لە رووبار پەڕیەوەو پەنای بردە لای تورکەکان و لەوێ مایەوە و دواتر هەر لەوێیش بە دەستی تورکەکان کوژرا،[2] بەمەش ئیمپراتۆریەتی ساسانی بە تەواوەتی کۆتایی پێ هات.

**دووەم: فتووحاتی شام:**

سەرەتای فتووحاتی شام لە سەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا بە لابردنی خالیدی کوڕی وەلید و دانانی ئەبووعوبەیدە لە شوێنیدا دەستیپێکرد، هۆکاری لابردنەکەشی بریتی بوو لە:

یەکەم: بەهۆی سەرکەوتنە یەکدوای یەکەکانی خالیدەوە، خەڵکێک وایاندەزانی سەرکەوتنەکان بەهۆی خالیدەوەیە، ئەمە هەم لە رووی بیروباوەڕییەوە جێی مەترسی بوو، هەم لە رووی واقیعیشەوە بە بوونی بیروباوەڕێکی لەو چەشنەوە، بە نەمانی خالید، سوپای موسڵمانان ورەی بەردەدا.[3]

دووەم: خالیدی کوڕی وەلید لە هەنگاوەکانیدا جۆرێک لە دەسەڵاتی والآ و سەربەخۆی دەویست، ئامادە نەبوو بۆ وردەکاریەکان بگەڕێتەوە لای خەلیفە، خەلیفەش بڕوای وابوو خالید ئەگەر سنووری بۆ دانەنرێ، دەست ناپارێزێ و زۆر رۆیشتنێکی تێدا هەیە، بۆیە پێشنیاری بۆ خالید کرد ئەو حاڵەتە بوەستێنێت، خالیدیش رازی نەبوو، ناچار خەلیفە بڕیاریدا بە گۆڕینی.[4]

سێیەم: عومەری کوڕی خەططاب سیاسەتی گۆڕینی والی و ئەمیرەکانی

[1] مسكويه: تجارب الأمم و تعاقب الهمم، ج١، ص ٣٨٠ - ٤١٠.

[2] تأريخ الطبري، ج٤، ص ٢٩٤.

[3] البداية والنهاية، ج١٠، ص ١٣٥.

[4] ابن حجر: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٥.

هەبوو، ئەمەی تەنها بەرامبەر بە خالید نەکرد، بەڵکو دەیویست نەفەس و روخساری نوێ بهێنێتە پێشەوەو بەرپرسەکان فێر بکات دڵیان خۆش نەکەن بە پۆستەکەیان، بۆیە لە ماوەی خیلافەتەکەیدا چەندین ئەمیر و والی گۆڕی.

ئەو ریوایەتەش کە ناکۆکیەکە دەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی، گوایە زۆرانبازییان کردووەو خالید عومەری خستووەو دواتر عومەر لە خیلافەتەکەیدا ئەو داخەی لەدڵدا ماوەو خالیدی لابردووە، ریوایەتێکی نادروست و قسەیەکی منداڵانەیە، چونکە کەسێتی عومەری کوڕی خەططاب بە موسڵمانبوونی بە تەواوەتی گۆڕا، ئێستا چۆن لە پۆستی خیلافەتدا کە بەرپرسیارێتی هەموو موسڵمانانی لەئەستۆ بووە، شتی وا دەکات؟!

کاتێک نامەی لەکارلابردنی خالید گەیشتە دەست ئەبوعوبەیدە، وەک رێزێک بۆ خالید، ماوەیەکی زۆر ئەو هەواڵە نەگەیشتە خالید هەتا لە زاری کەسانی ترەوە بیستی، بە بیستنی هەواڵەکەو دڵنیابوونەوە لە راستیەکەی، خالید دەستبەجێ گوێڕایەڵی خۆی بۆ فەرمانەکە نیشاندا و چووە ژێر فەمانبەریی ئەبوعوبەیدەوە.[1]

دیارترین فتووحاتی ئەو بەرەیە بریتی بوو لە فەتحی ئەردەن، فەتحی دیمەشق.

**جەنگی یەرمووک:**

هیرەقل کە شکستی سوپاکەی لە دیمەشق و بەعلەبەگ و حیمص و چەند ناوچەیەکی دی پێگەیشتەوە، کەوتە خۆکۆکردنەوەو نامەی بۆ سەرجەم ناوچەکان نارد و بانگەوازی بۆ جەنگێکی ئایینی کرد هەتا هەرچی مەسیحیەک هەیە تیایدا بەشداری بکات،[2] بەم چەشنە سوپایەکی گەورەی چەند سەد هەزاریی تێکەڵە لە رۆم و ئەرمەن و عەرەبەکانی پێکهێنا و

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص ١٢٩ – ١٣٠.
[2] الواقدي: فتوح الشام، ص ١٤٨ – ١٥٥.

دەستی کرد بە هێرش بردن،[1] ئەبووعوبەیدەش بەردەوام وردەکاریی جموجووڵی سوپاکەی پێ دەگەیشت، لە سەرەتاوە موسڵمانان لە چەند ناوچەیەک لەبەردەم سوپای ڕۆمەکاندا پاشەکشەیان کرد، هەڵگەڕانەوەش لە هەندێک ناوچەدا ڕوویدا کە پێشتر فەتح کرابوون، ئەمە جۆرێک لە خشتەبردنی هیرەقلی لێکەوتەوەو ڕۆمەکان وایانزانی موسڵمانان بەنیازن بە تەواوەتی شام چۆڵ بکەن، بۆیە لە پێشڕەویکردن نەوەستان، لەولاشەوە ئەبووعوبەیدە پاش ڕاوێژ بە خالیدی کوڕی وەلید، بڕیاری دا خاکی یەرمووک وەک مەیدانی جەنگی یەکلاکەرەوە دەستنیشان بکات، هەتا دواجار لە ناوچەی یەرمووک بەریەککەوتنی هەردوو سوپای ڕۆم و موسڵمانان ڕوویدا،[2] جەنگی یەرمووک لە ساڵی پانزەی کۆچیدا ڕوویدا.[3]

بەهۆی زۆریی سوپای ڕۆمەکانەوە، بۆ یەکەم جار سوپای موسڵمانان لەسەر شێوازێکی نوێ ڕێکخرا کە بە ڕێکخستنی خالیدی ناسراوە، ئەم ڕێکخستنەش ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەبوو لە جەنگەکەدا، پاش بەریەککەوتنی هەردوو سوپا و کوشتارێکی کەموێنەی چەند ڕۆژی نێوان هەردوولا، دواجار سوپای موسڵمانان سەرکەوت و ڕۆمەکان بە سەختی تێکشکان.[4]

**پاش جەنگی یەرمووک:**

دوای شکستی ڕۆمەکان لە یەرمووک، ئیدی هیرەقل دەستی لە خاکی شام شۆرد و زۆر خۆی پێوە ماندوو نەکرد، سوپای موسڵمانانیش درێژەیان دەدا بە پێشڕەویەکانیان و ناوچەیەکی بەرفراوانیان فەتح کرد.

**فەتحی قودس:**

فەتحی بەیتولمەقدیس لە ساڵی پانزەی کۆچیدا ڕوویدا، سوپای موسڵمانان

---

[1] البلاذري: فتوح البلدان، ص ١٣٦.

[2] الواقدي: فتوح الشام، ص ١٤٨ – ١٥٥.

[3] الذهبي: تاريخ الإسلام، ج٢ن ص ٨٢.

[4] () تاريخ الطبري، ج٣، ص ٣٩٦ – ٤٠٤.

بۆ فەتحی قودس بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص و سەرکردایەتی سوپای ڕۆمەکانیش لەلایەن ئەرطەبوونەوە بوو، سەرەتا عەمر هەوڵیدا لە ڕێی فەتحکردنی چەند ناوچەیەکی دەوروبەری ئیلیائەوە، سوپای بەرامبەر سەرقاڵ و ماندوو بکات،[1] دواجار گەمارۆیەکی سەختیشی خستە سەر شارەکەو نامەیەکی بۆ سەرکردەی ڕۆمەکان نارد و داوای کرد شارەکە بدەن بەدەستەوە، ئەویش مەرجی ئەوەی دانا خودی خەلیفە عومەری کوڕی خەططاب بێت بۆ بەیتولمەقدیس و خۆی بەڵێننامەیەکیان بۆ بنووسێت، عەمریش پەیامەکەی گەیاندە خەلیفە و عومەریش عەلی کوڕی ئەبووطالیبی وەک جێگری خۆی لە مەدینە دانا و خۆی گەیاندە شارەکەو بەبێ جەنگ بەیتولمەقدیس فەتح کرا،[2] ئینجا خەلیفە بەڵێننامەیەکی بۆ خەڵکی ئیلیاء نووسی کە ئەم خاڵانەی لەخۆدەگرت:

- بڕیاری دەرکردنی بەڵێننامەکە لەلایەن عومەری کوڕی خەططابەوە بوو کە خەلیفەی باوەڕداران بوو، شایەتەکانیش چوار هاوەڵ و سەرکردەی دیاری ناو موسڵمانان بوون (خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاص، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان).
- گیان و ماڵ و سامانی خەڵکی ئیلیاء پارێزراوە.
- کڵێسا و خاچەکانیان پارێزراون و نابێت داگیر بکرێن و بڕووخێنرێن و دەستکاری بکرێن، نابێت فشار بخرێتە سەر دینداریەکەیان و زیانیان پێ بگەیەنرێت.
- نابێت جوولەکەکان لەناو ئیلیائدا هاونشینی مەسیحیەکان بن.
- مەسیحیەکان لەسەریانە لەکاتی دوورینەوەو چنینەوەی بەرهەمدا سەرانە بدەن، بەرامبەر بەوە خۆیان و ماڵ و سامان و دین و هێما ئایینیەکانیان دەپارێزرێن.

---
[1] الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٣٢٩.
[2] النويري: نهاية الارب في فنون الأدب، ج١٩، ص ١٧١.

- هەرکەس رازی نیە بە مانەوە لەو شارەدا، هەتا دەگاتە شوێنی ئارامی خۆی، سەر و ماڵ و دینی پارێزراو دەبێت.

- رۆم و چەتەکان دەبێت لە ئیلیاء بچنە دەرەوە، یان دەبێت رازی بن بەو مەرجانەی دانراون، لەبەرامبەردا هەمان ئەو مافانەیان هەیە کە بۆ مەسیحیەکان هەن.

- بەڵێننامەکە پەیوەست کرا بە زیممەو پەنای خوا و پێغەمبەرەکەی و خەلیفەی موسڵمانان و سەرجەم باوەڕدارانەوە، واتە لادان لێی لەلایەن هەر موسڵمانێکەوە، بە حەرام و لادان لە فەرمانی خوا هەژمار کرا.[1]

**فەتحی ناوچە کوردیەکان:**

بە شێوەیەکی گشتی، فەتحی ناوچە کوردیەکان لە هەردوو هەڵمەتی فتووحاتی (عێراق و بەرەی رۆژهەڵات) و (فتووحاتی شام) دا، بریتی نەبوو لە جەنگێکی سەربەخۆی نێوان کورد و موسڵمانەکان، بەڵکو کوردەکان دابەش بووبوون بەسەر دوو بەرەی جیاوازی فارسی و رۆمانیدا، رێژەیەک لە کوردەکان، لە هەردوو بەرەدا، بەشێکی بچووک لە سوپای فارسی یان رۆمانییان پێکدەهێنا، واتە کوردەکان لە ناوچەی خۆیاندا دەسەڵاتی ناوچەیی و سەربەخۆیان نەبوو، ئەگەرچی لە چەند ناوچەیەکدا سوپایەکی کوردیی سەر بە فارسەکان هەبوو،[2] کاتێک سوپای موسڵمانان لە ناوچە کوردنشینەکاندا لەگەڵ سوپای فارسی یان سوپای رۆمانیدا بەریەک دەکەوتن، بەشێک لەو کوردانەی بەشداری سوپاکان بوون، لەگەڵ موسڵمانەکاندا دەجەنگان، بەڵام بەرنگاربوونەوەیەکی سەختی وا لە ناوچە کوردیەکاندا بەدینەکراوە، دەکرێت هۆکاری ئەمەش بگێڕینەوە بۆ بێزاری زۆرینەی کوردەکان لە هەردوو دەسەڵاتی فارسی و رۆمانی و ئامادەنەبوون بۆ خۆکردنە قوربانی لەپێناو ئەو دەسەڵاتانەدا، چونکە سووکایەتی و نارەحەتیەکی زۆریان لەو

[1] تاريخ الطبري، ج٣، ص ٦٠٩.

[2] تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٥٦٧.

دوو دەسەڵاتە چەشتبوو، زۆرجار سەرکردەکانی ئەو دەسەڵاتانە، لەوپەڕی سووکایەتیدا ناخی خۆیان بەرامبەر بە کوردەکان دەردەبڕی، بۆ نموونە بەرامبەر بە نەیارەکانیان ئەم دەستەواژانەیان بەکاردەهێنا (ئەی کوڕی ئەو ژنە داوێن پیسەی لەنێو خێوەتی کورداندا گەورە بویت).[1]

بەهەرحاڵ، لەناوچە کوردیەکاندا جەنگی نێوان موسڵمانان و سوپای زاڵی ناوچەکە بە بەشداریەکی ڕێژەیی کوردەکان ڕوویداوەو لە هەندێک ناوچەدا بەشێک لە کوردەکان بەرگرییان کردووەو کوشتار لە هەردوولا هەبووە، لە هەندێک ناوچەشدا بە ڕێککەوتن، چوونەتە ژێر دەسەڵاتی سوپای ئیسلامیەوە.

**سێیەم: فتووحاتی باکووری ئەفریقی:**

فتووحاتی باکووری ئەفریقی، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططاب و بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص دەستپێکرد، ئەمەش دوای فتووحاتی بەرفراوانی ناوچەکانی شام دەستپێکرد،[2] ئەوکات عەمری کوڕی عاص لەلایەن خەلیفەوە ڕاسپێردرا هەتا ڕووەو وڵاتی میصر پێشڕەوی دەست پێ بکات، یەکەم هەنگاوی فتووحاتەکەش بە فەتحی فەرما دەستپێکرد، پێشڕەوی سوپای ئیسلامی، ناوچە دوای ناوچە بەردەوام بوو و بە دوایدا فەتحی بیلبیس و ئوم دنین و فەیووم کرا.[3]

**فەتحی قەڵای بابلیۆن:**

سوپای ڕۆمەکان لە قەڵای بابلیۆن سەنگەریان گرتبوو و عەمری کوڕی عاصیش گەمارۆیەکی سەختی خستە سەریان و بەردەوام هەوڵیدەدا فەتحی بکات، بەڵام بۆی نەچوویەسەر، بۆیە داوای هێزی پشتیوانی لە خەلیفە کرد و خەلیفەش سوپایەکی پێکهاتوو لە چوار یەکەی سەربازیی هەزار کەسیی

[1] تاريخ الطبري، ج٢، ص ٣٩ و ١٧٨.
[2] تأريخ الطبري، ج٤، ص ١٠٤.
[3] أبوالقاسم المصري: فتوح مصر والمغرب، ص ٨١-٨٠، ٢١٠.

نارد.[1]

دواجار ڕێککەوتنێک کرا لەنێوان سوپای ئیسلامی و هێزی ڕۆمی و خەڵکی میصردا کە ئەم تەوەرانەی لەخۆدەگرت:

یەکەم: ئەو خاڵانەی تایبەت بوو بە قیبطیەکان کە خەڵکی ڕەسەنی میصر بوون:

- پێدانی جیزیە لەلایەن میصریەکانەوە بە دەسەڵاتی ئیسلامی.
- پێدانی خەراجی زەویەکانی میصر بە دەسەڵاتی ئیسلامی.
- جیزیە و خەراج تەنها پیاوانی دەگرتەوەو منداڵ و ئافرەت لەسەریان نەبوو.
- ئەگەر ئەو مەرجانە جێبەجێ کران، ئەوا ماڵ وسامان و ژن و منداڵیان پارێزراو دەبن
- دەبێت میصریەکان لەلایەن سوپای ئیسلامیەوە لە مەترسی دوژمن بپارێزرێن.[2]

دووەم: ئەو خاڵانەی تایبەت بوو بە سوپای ڕۆمی و نووبیەکان کە خەڵکی میصر نەبوون:

- ڕۆمیەکانی ناو میصر سەرپشک بکرێن لەوەی لە میصر دەمێننەوە یان جێی بهێڵن.[3]
- مانەوەی ڕۆمیەکان و نووبیەکان وابەستەیە بە پابەندبوونیان بەو خاڵانەی لە ڕێککەوتنی نێوان قیبطی و موسڵمانەکاندا هاتووە، هەرکەسیان مایەوە، هەمان ئەرک و مافی لەسەرە، هەرکەسیش ڕازی نەبوو، پەنا دەدرێت هەتا بە سەلامەتی دەگاتە شوێنی مەبەستی خۆی و لە دەسەڵاتی ئیسلامی دەچێتە دەرەوە.

---

[1] أبوالقاسم المصري: فتوح مصر والمغرب، ص ٨٣

[2] البلاذري: فتوح البلدان، ص ٢١٢-٢١٥.

[3] البلاذري: فتوح البلدان، ص ٢١٢-٢١٥.

- نووبیەکان مافیان هەبێت بازرگانی هاوردە و ناردەنی بکەن.[1]

نموونەی فەتحی ناوچەکانی دیکەش بریتی بوو لە: فەتحی ئەسکەندەریە، فەتحی بەرقە و تەرابلوس.

## فتوحات لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا

پاش شەهیدبوونی عومەری کوڕی خەططاب، دوو هێزە بریندار و شکستخواردووەکەی دەست سوپای ئیسلامی، کە بریتی بوون لە ساسانیەکان و رۆمەکان، ئەوەیان بە دەرفەت زانی هەتا خۆیان کۆبکەنەوەو لە هێرشێکی هەڵگەڕاوەدا، بتوانن ئەو ناوچانە بخەنەوەژێر رکێفی خۆیان کە پێشتر لەدەستیان دابوون، بۆیە لە بەرەی رۆژهەڵاتییەوە، یەزدگوردی ساسانی هەولّی دەدا سوپایەک کۆبکاتەوەو هێرش بباتە سەر هێزە ئیسلامیەکان، هێزە ناوچەییەکانیش لە ئازەربایجان و چەند شوێنێکی دیکەش، دەستیان کرد بە شکاندنی بەڵێننامەو رێککەوتنەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا، لە بەرەی رۆژئاواییشەوە، هیرەقل هێز و توانای خۆی لە نزیکی ئەسکەندەریەوە کۆکردەوە بە مەبەستی گێڕانەوەی ئەو ناوچانەی پێشتر لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بوون و بە هۆی فتووحاتی ئیسلامیەوە، کەوتبوونە دەست هێزە ئیسلامییەکان.

لە بەرامبەر ئەم مەترسیەدا، خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان سیاسەتێکی درێژخایەنی گرتەبەر کە بریتی بوو لە:

یەکەم: دامرکاندنەوەی هەڵگەڕانەوەکان و لەناوبردنی مەترسیە هەنووکەییەکانی سەر هێزە ئیسلامیەکان کە بریتی بوون لە کۆکراوەی هەردوو هێزی ساسانی و بیزەنتی لە هەردوو بەرەی رۆژهەڵات و رۆژئاواوە، لەوانەش هەڵگەڕانەوەکانی (ئازەربایجان، ئیستەخر، تەبەرستان،

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، دار هجر، ج١٠، ص ٩٢.

جورجـان، خوراسـان، کرمـان، رەی، هەمــەدان، ئیسـکەندەریە[1].

دووەم: پەلهاویشـتن بۆ ناوچەکانی دەرەوەی سنووری دەسـەڵاتی ئیسـلامی بـۆ بنەبڕکردنـی سـەرچاوەکانی هێرشـبردنە سـەر موسـڵمانان و گرتنەبـەری سیاسـەتی پێشـڕەوی لەبـری بەرگری و پاشەکشـە، لەوانـەش فەتحـی (مـەرو، جوزجـان، تەخارسـتان،[2] ئەرمینیـا، تەرابلوسـی شـام، دوورگـەی قوبـرص، فتوحاتـی باکووری ئەفریقـی، فەتحـی نۆبـە، فەتحـی ئەندەلـوس[3].

سـێیەم: بڵاوکردنـەوەی ئیسـلام لـە ناوچـە فەتحکـراوەکان بـە چەشـنێک بەرەبـەرە ببـن بـە بەشـێک لـە جەسـتەی ئوممەتـی ئیسـلامی و لەبـری هەڵگەڕانـەوەو دروسـتکردنی سەرئێشـە، ببنـە هێـزی پاڵنـەری بانگـەوازی ئیسـلامی و پەلهاوێشـتن بـەرەو دەوروبـەر.

چـوارەم: پەیڕەوکردنـی شـێوازێکی نوێـی هێـزی سـەربازیی لەنێو سـوپای ئیسـلامیدا کە بەهـۆی پێشـڕەویەکانی سـوپای ئیسـلامیەوە، پێکهێنانـی ئەو هێزە پێویسـتیەکی بێ چـەن و چـوون بـوو، ئەویـش بریتـی بـوو لـە دروسـتکردنی کەشـتیگەلی ئیسـلامی، هانـدەری سـەرەکی ئـەم بابەتـەش، موعاویـەی کـوڕی ئەبووسـوفیان بـوو، هەرچەنـدە لـە خیلافەتـی عومـەردا هەوڵیـدا قەناعـەت بـە خەلیفـە بـکات هەتـا موسـڵمانان جەنگـی دەریاییـش ئەزمـوون بکـەن، خەلیفـە رازی نەبوو، لـە سـەردەمی عوثمانـدا چەنـد جارێـک مەسـەلەکەی لەگـەڵ خەلیفە تاوتـوێ کـرد هەتـا دواجـار خەلیفـە رازی بـوو،[4] پێشـتریش پێغەمبـەر(ﷺ) ئامـاژەی دابـوو بـە کەشـتیگەلی موسـڵمانان،[5] دیارترین چالاکی کەشـتیگەلی ئیسـلامیش بریتـی بـوو لـە:

---

[1] تاريخ خليفة ابن خياط، ص ١٥٨.

[2] تاريخ الطبري، ج٤، ص ٣٠٩.

[3] () ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص ٦٤٩.

[4] البلاذري: فتوح البلدان، ص ١٥٣.

[5] صحيح البخاري، الرقم ٢٦٥٤، صحيح مسلم، الرقم ٣٦٢٦.

- هێرشی موعاویە بۆ سەر قوبرص و فەتحکردنی.[1]

- جەنگی (ذاتوصەواری) بە سەرکردایەتی عەبدوڵای کوڕی ئەبی سەرح لە ئەسکەندەرییە[2] کە جەنگێکی زۆر سەخت بوو و سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی موسڵمانانی لێکەوتەوە.[3]

چەند نموونەیەک لە رووداوەکانی فتووحاتی ئەو سەردەمە:

فەتحی ئەرمینیا: لە ساڵی (٣١) کۆچیدا،[4] بەهێزیی و بەردەوامیی هێرشی سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی مەسلەمەی فەهری بۆ سەر ناوچەکانی ئەرمینیا و بێهیوابوونی ئەرمەنەکان لە پشتیوانی بیزەنتیەکان، ئەرمەنەکانی ناچار کرد لەگەڵ سوپای ئیسلامیدا رێکبکەون و ناوچەکە ملکەچی دەسەڵاتی ئیسلامی ببێت.[5]

جەنگی تورکەکان: جەنگی نێوان موسڵمانان و تورکەکان لە خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا دەستیپێکرد،[6] دواتر لە خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا موسڵمانان توانییان پاش چەند بەریەککەوتنێکی سەخت، چەند ناوچەیەک فەتح بکەن.[7]

جەنگی ذاتوصەواری: جەنگێکی دەریایی نێوان سوپای موسڵمانان و رۆمەکان بوو، سەرکردایەتی سوپای ئیسلامیی لەدەست عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرحدا بوو و ژمارەیەک لە هاوەڵە ناسراوەکان تیایدا بەشداربوون، قوستەنتینی کوڕی هیرەقلیش بە سەدان کەشتیەوە سەرکردایەتی سوپای رۆمەکانی دەکرد، پاش بەریەککەوتنێکی سەخت،

[1] البلاذري: فتوح البلدان، ص ١٥٣.

[2] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٧٠.

[3] () ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص ٢٣٨.

[4] تاريخ الطبري، ج٤، ص ٢٩٢.

[5] البلاذري: فتوح البلدان، ص ١٩٦-١٩٧.

[6] () ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص ١٥٦-١٥٧.

[7] ابن الأثير: الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٤١١-٤١٢.

موسـڵمانان سـەرکەوتن و سـوپای بەرامبـەر بـە سـەختی تێکشـکا.[1]

کوژرانـی یەزدگـورد: لـە خیلافەتـی عوثمانـی کـوڕی عەففانـدا، یەزدگوردی پادشای ساسانیەکان هەوڵیدەدا سوپاکانی یەکبخات و ناوچە لەدەستدراوەکانی بگێڕێتـەوە، بـەڵام سـەرکەوتوو نەبـوو و بەهـۆی شکستەکانیەوە، لـەم شـار بۆ ئـەو شـار رایدەکرد، هەتـا دواجـار بـە زەلیلـی کـوژرا.[2]

---

(1) تاريخ الطبري، ج٤، ص ٢٩٠.

(2) تاريخ الطبري، ج٤، ص ٢٩٣-٣٠٠.

# فیتنەی نێوان هاوەڵان(ﭫ)

هاوەڵان ئەو دەستەیە بوون کە دەیان ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بە چاکە وەسفیان دەکەن، ڕەزامەندی خوا و سەربەرزی و دڵخۆشی ڕۆژی دوایی موژدەکانی قورئان و سوننەت بوون بۆ هاوەڵان، بۆیە قسەکردن لە سەر مەسەلەکانی پەیوەست بە هاوەڵان وریاییەکی زۆری دەوێت.

یەکێک لەو مەسەلانەی کە بوەتە باسی ڕەخنەگرتنی ناحەزانی ئیسلام و ڕۆژهەلاتناسان و کەسانێکی ناو ئوممەتی ئیسلامیش، بریتیە لە ڕەخنەگرتنیان لە فیتنەی نێوان هاوەڵان، ئەمانە لە چەندروویەکەوە هەوڵ دەدەن ئەو مەسەلەیە زەق بکەنەوە:

یەکەم: دووبارەکردنەوەی گێڕانەوە ناراستەکان و هەوڵدانی تەواو بۆ بەڕاست دانانی ئەو گێڕانەوە ناڕاستانە، هێندە لە نووسینە جیاجیاکان و گوتار و مشتومڕەکانیاندا دەیانڵێنەوە تا وادەکەن خەڵکێکی زۆر بە ڕاستیان بزانن بێ ئەوەی توێژینەوەیەکی بنچینەیی بۆ گێڕانەوەکان بکەن.

دووەم: زێدەکاری بۆ گێڕانەوەکان، بۆ نموونە زیادکردنی ژمارەی کوژراوەکان بەجۆرێ ئەگەر بڵێین سەد قات زیاتر نووسراوە ڕاستە.

سێیەم: نیازخراپی لە لێکدانەوەکانیاندا بەجۆرێ هەموو هەوڵ و هەنگاوێکی هاوەڵان دەکەنە تەمای سیاسی نەک ئیجتیهادێک، ئیتر وا باسەکە دەخەنەروو کە گوایە هەموو ئەو حاڵەتە هەوڵی دەستخستنی دەسەڵات بووە.

چوارەم: چاوپۆشی لە ڕۆڵە دەرەکیەکانی وەک ڕۆڵی سەبەئیەکان، ئەسڵەن بەجۆرێ حاشای لێ دەکەن وەک ئەوەی بڵێی هەرچی سەرچاوەی مێژوویی هەیە بەوانەشەوە کە ئەوان دڵیان پێ خۆش دەکەن درۆزن بون و بوختانیان بۆ سەبەئیەکان کردووە.

ئامانجیشیان لەمە چەند شتێکە، لەوانە:

یەکەم: هەوڵی ڕەشکردنی ئەزموونی پێشینەی هاوەڵان تا بڵێن ئەوانەی ئەمەیان کرد لەرابردووشدا بۆیان بگونجایە هەر وایان دەکرد، واتە تا بڵێن هەردەم نیازی هاوەڵان دەسەلات ویستی بووە، بە واتایەکی تر دەیانەوێ بڵێن هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) دووڕوو بوون.

دووەم: هەوڵی گومان خستنە سەر ڕاستی قورئان و فەرموودە تا بڵێن ئەم کەسانەن قورئان و فەرموودەیان نەقڵ کردووە بۆیە دەکرێت بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری ئەو دوانەیان کردبێت.

سێیەم: گومان خستنە سەر بیروباوەڕی موسڵمان بەرامبەر بە زانایی پەروەردگاری بە غەیب، وەک بڵێن خوایەک کە ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەو هاوەڵانە دەربڕی دواتر هاوەڵان کەوتنە وێزەی یەکتر و خوێنیان ڕشت.

چوارەم: تا ئەو پەیامەی خۆیان بسەلمێنن کە هاوەڵان چاکترین دەستە نەبون بەڵکو ئەوانیش وەک هەر خەڵکێکی تر وابوون و هیچ جیاوازیەکیان نەبووە.

پێنجەم: تا لێرەوە بڵێن موحەممەد(ﷺ) سەرکەوتوو نەبووە لە گەیاندنی پەیامەکەی و پەروەردەکردنی دەورووبەریدا، تەنانەت قسەبکەن لەسەر چاکی و کەسایەتی پێغەمبەریش(ﷺ).

بەڵام ئەهلی سوننەو جەماعە بەردەوام ئەو هەوڵانەیان پووچەڵ کردوونەتەوە و ڕاستیەکانیان خستووەتەروو، هەرچەندە کینەلەدڵان ئەگەر بچنەوە ئەو بارەو بەچاوی خۆیان بارەکە ببینن هەر هەمان ڕای خۆیان

هەیە یان دەبوونە هاریکاری سەبەئی و خەواریجەکان.

دەبێت وا بڕوانینە فیتنەی نێوان هاوەڵان:

١- هاوەڵان نیازیان پاک بووە و ئەوەی کردوویانە نیازی خراپە نەبووە، چونکە زۆرێک لەوانەی بەشدار بوون لە بەیعەتی ریضواندا هەبوون کە خوا رەزامەندی خۆی بۆیان دەربڕی، مەسەلەکە راجیایی هاوەڵان بوو بۆ چارەسەری کێشەیەک کە ناحەزانی ئیسلام هەڵیانگیرساندبوو.

٢- رێبەرانی هەردوو دەستەی هاوەڵان موجتەهید بون، ئیمامی عەلی(C) موژدەپێدراوی بەهەشت و زانایەکی هەڵکەوتە و کەسی نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تەلحە و زوبەیریش(ﭫ) موژدەپێدراوانی بەهەشت و هاوەلانی دڵسۆزی پێغەمبەر(ﷺ) و زانایانی ئوممەت بون، دایکمان عائیشەش(ﭬ) خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و کچی راستگۆ و گەورەی هاوەڵان و یەکەم خەلیفەی موسڵمانان و زاناترین ئافرەتی ناو ئوممەتی ئیسلامی بووە، دەی دەکرێ کەسانێک خوا بەهەشتی بریبێتەوە بۆیان هێندە نیاز پیس بن(پەنا بەخوا لە وتەی وا).

٣- روودانی جەنگ و ناکۆکی لەنێوان موسڵماناندا کۆتا هێڵی سوور نیە، بەڵکو چاوەروانکراوە، وەک خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردووە(وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)، واتە (ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران پێکەوە بە جەنگ هاتن جا هەرچی تواناتان هەیە بەکاری بێنن و ئاشتیان بکەنەوەو بانگیان بکەن بۆلای بڕیارەکانی خوا جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژیی کردە سەر دەستەکەی تر، واتە: ملی ڕانەکێشا بۆ ئاشتیی و یەککەوتن ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیاندا بجەنگێن کە دەستدرێژی دەکات، تا ناچار دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو حوکمی خوا. ئینجا ئەگەر کۆمەڵە

ستەمکارەکە گەڕایەوە بۆ حوکمی خوا، جا ئێوەیش بەئینصاف ناوبژییان بکەن وە دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن چونکە بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ)،[1] هەر بۆیە لە جەنگی جەمەلدا هەردوو لا ڕێککەوتن بەڵام شەو دوورووە زیان بۆ ماوەکان جەنگەکەیان هەڵگیرساند.

٤- ئەو ژمارە زۆرەی باس دەکرێ سەبارەت بە کوشتاری نێوان هاوەڵان ناڕاستیەکی تەواوە و ڕێژەکە زۆر کەمترە لەوەی باسکراوە، بەڵکو زۆرێک لە هەوادارانی دواتری لایەنە سیاسیەکان گێڕانەوەیان بۆ ئەو ڕووداوانە زیاد کردووە.

## فیتنەی سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففان

### سەبەئیەکان:

عەبدوڵای کوڕی سەبەء: کەسایەتیەکی جوولەکەی یەمەنی بوو کە لە خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند،[2] بە ئیبنوسەوداء ناسرابوو،[3] ئامانجیشی دزەکردنە نێو موسڵمانان بوو بە مەبەستی لێدانی دەسەڵاتی ئیسلامی، خێرا لە هەرێمەکانی حیجاز و بەصرە و کووفەوە دەستیکرد بە پیلانەکەی، هەوڵیدا لە هەرێمەکانی شامیش هەوادار کۆبکاتەوە،[4] بەڵام موعاویە زوو هەستی کرد بە مەترسی ئەو کەسایەتیە و ڕێگریی لێکرد،[5] ئینجا روویکردە میصر و لەوێیش هەوادارێکی زۆری بۆ بانگەوازەکەی کۆکردەوە.[6]

باس و بەسەرهاتی عەبدوڵای کوڕی سەبەء و سەبەئیەکان، چ لە

---

[1] الحجرات: ٩.

[2] مسكويه: تجارب الأمم، الطبعة الثانية، مطبعة سروش، طهران، سنة ٢٠٠٠، ج١، ص ٤٣٥.

[3] ابن الأثير: الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٥١٧.

[4] مسكويه: تجارب الأمم، الطبعة الثانية، مطبعة سروش، طهران، سنة ٢٠٠٠، ج١، ص ٤٣٥.

[5] تاريخ الطبري، ج٤، ص ٣٤٠.

[6] () ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص ٢٦٣.

سەرچاوە سەرەکیەکانی مێژووی ئیسلامی و چ لە سەرچاوەکانی شیعەشدا تۆمار کراوە، بۆ نموونە: لە سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامی وەک: (سەیفی کوڕی عەمر،[1] دەینەوەری،[2] طەبەری،[3] مەقدیسی[4]، لە سەرچاوەکانی شیعەش وەک (خصیبی،[5] کیششی، طووسی،[6] مەجلیسی[7]، کەچی بەشێکی زۆری ڕۆژهەڵاتناسان و نووسەرانێکی ناو جیهانی ئیسلامی، بە چەند ئامانجێکی دیاریکراو، هەوڵ دەدەن نەبوونی کەسایەتیەکی لەو چەشنە لە مێژوودا بسەلمێنن، ئامانجی سەرەکیش تیایدا، بریتیە لە شاردنەوەی ڕۆڵی سەبەئیەکان لە فیتنەی سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففان و کەڵەکەکردنی تاوان و کەمتەرخەمیەکان لە کەسێتی خەلیفەدا، ئیبنولئەثیر بە وردی ڕێڕەوی گشتی ئاشووبەکەی نیشانداوە (عەبدولای کوڕی سەبەء کەسێکی جوولەکە بوو، لە سەردەمی عوثماندا موسڵمان بوو، ئینجا لەناو حیجازدا ئەملاوئەولای دەکرد و لەوێوە چوو بۆ بەصرە و دواتر بۆ کووفە، ئینجا بۆ شام، مەبەستی بوو سەر لە خەڵکی بشێوێنێت، کەچی لەوێ بۆی نەچوویەسەر و خەڵکی شام دەریانکرد، ئینجا چوو بۆ میصر و لەوێ لەناو خەڵکەکەیدا مایەوەو دەیوت: جێی سەرسوڕمانە خەڵکی بڕوایان بەوە هەیە عیسا دەگەڕێتەوە، کەچی بڕوایان بەوە نیە موحەممەد بگەڕێتەوە، بەمەش بنەمای گەڕانەوەی بۆ دانان و ئەوانیش لێیان وەرگرت، دوای ئەوە پێی دەوتن: هەر پێغەمبەرێک وەصییەکی هەیە و عەلیش وەصی موحەممەدە،

---

[1] سيف بن عمرو: الفتنة و وقعة الجمل، ص ٤٨.

[2] المعارف، ص ٦٢٢.

[3] تاريخ الطبري، ج٤، ص ٣٤٠.

[4] البدء والتاريخ، ج٥، ص ١٢٥.

[5] حسين بن حمدان الخصيبي (ت: ٣٣٤هـ): الهداية الكبرى، الطبعة الرابعة، مؤسسة البلاغ، بيروت، سنة ١٩٩١، ص ١٥١.

[6] محمد بن الحسن الطوسي: اختيار معرفة الرجال، الطبعة الاولى، مؤسسة النشر الاسلامي، ١٤٢٨هـ ص ١٠٢.

[7] محمد باقر المجلسي: بحار الأنوار، مؤسسة الوفاء، بيروت، ج٢٥، ص ٢٦٣.

ستەمکارتر لەو کەسە کێیە کە وەسیەتی پێغەمبەری خوا بەجێنەهێنێت و وەسیەتەکەی پێشێل بکات، عوثمان بە ناحەق خیلافەتی وەرگرتووە، دەی هەستن و دەست بدەنە تانەدان لە والی و بەرپرسەکانتان و وا نیشان بدەن کاردەکەن بە (فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە) هەتا دڵی خەڵکەکە بۆ خۆتان ڕاکێش دەکەن، ئینجا بانگخوازانی خۆی –بە ناوچەکاندا– بڵاوکردەوەو لەسەر خراپەی والیەکانی لە ناوچەکان نامەی بۆ دەنووسین و ئەوانیش هەمان شتیان دەکرد و نامەیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، بە نهێنی بانگەوازیان دەکرد بۆ ڕاوبۆچوونی خۆیان، هەندێک نامەی ساختەیان لەسەر کەموکورتی والی و بەرپرسەکانیان دادەڕشت و دەیانناردە بۆ شوێنەکانی تر، خەڵکی هەر ناوچەیەک ئەمەی دەکرد بۆ خەڵکی ناوچەکانی تر، هەتا خۆیان گەیاندە مەدینەش و لەوێش بانگەشەکەیان بڵاوکردەوە)، پەیامەکە گەیەنرایە کۆشکی خیلافەت و پاش مشتومڕ لەو بارەیەوە، هەنگاو نرا بۆ چارەسەرکردنی.[1]

**تۆمەتەکان بەرامبەر بە عوثمانی کوڕی عەففان**

دەستەی سەبەئیەکان، بە سەرکردایەتی عەبدوڵای کوڕی سەبەء، پاش ئەوەی بڕیاریان دا، بەرامبەر بە عوثمانی کوڕی عەففان هەنگاو هەڵنێن، لەسەر ڕێنمایی و ڕاسپاردەی گەورەکەیان، ئەم هەنگاوانەیان نا:

- تانەدان لە والی ناوچەکان، بە چەشنێک هەوڵ بدەن وەک ستەمکار و مافخۆری خەڵک نیشانیان بدەن.
- وا خۆیان نیشان بدەن، فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگریی دەکەن لە خراپە و ستەم.
- پتەوکردنی پەیوەندیەکانی ڕێکخستنی سەبەئیەکان لە سەرجەم هەرێمەکاندا و ئاڵوگۆڕی نامە و زانیاریی ورد لەنێوانیاندا.[2]

---

[1] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٥٢٦.

[2] تاريخ الطبري، ج٤، ص ٣٤٠-٣٤١.

- هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی ناو و ناوبانگی گەورە هاوەڵان و کەسایەتیەکان بۆ پشتگیریی بانگەوازەکەیان.[1]

- هەنگاونان بۆ ساختەکردنی مۆر و بەڵگەنامەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی و کەسایەتیە ئیسلامیەکان، وەک ساختەکردنی مۆری خەلیفە و نووسراوی عائیشەی دایکی باوەڕداران.[2]

لەو ماوەدا، سەبەئیەکان بە وردی ئیشیان دەکرد لەسەر جووڵاندنی رای گشتی و هاندانی خەڵک بەرامبەر بە والیەکانی ناوچەکان، هەتا ئەمە بکەنە کەرەستەیەکی دەستیان بۆ لێدانی خودی خەلیفە، دواجار پاش سەرکەوتنی هەنگاوی یەکەمی پیلانەکەیان، هەوڵ و هێرشەکانی خۆیان چڕکردەوە لەسەر خودی خەلیفە و چەندین دۆسیەی تۆمەتیان بۆ خەلیفە کردەوە، لەوانە:

- زەوتکردنی مافی عەلی کوڕی ئەبووطالیب:

ئەمە یەکەم تۆمەت بوو کە راستەوخۆ لەلایەن خودی عەبدوڵای کوڕی سەبەئەوە ئاڕاستەی خەلیفە دەکرا و دەیوت: عەلی وەصیی پێغەمبەری خوایە و دەبوو دوای پێغەمبەر(ﷺ) عەلی بکرایە بە خەلیفە، عوثمانیش بە ستەم بووە بە خەلیفە و ئەو مافەی لە عەلی زەوت کردووە.[3]

ئەم تۆمەتەش هیچ راستیەکی نیە، چ رەفتاری خودی عەلی و چ هەڵوێستی موسڵمان و چ شێوازی هەڵبژاردنی عوثمانی کوڕی عەففان، بەڵگەی نادروستی ئەو تۆمەتەن.

- زبریی بەرامبەر بە گەورە هاوەڵان و کەسایەتیەکان:

لێدان و سزادانی عەمماری کوڕی یاسر.

لێدان و سزادانی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود.

---

[1] ابن العربي: العواصم من القواصم.

[2] ابن العربي: العواصم من القواصم.

[3] تاريخ الطبري، ج٤، ص ٣٤٠.

دوورخستنەوەی ئەبووزەری غیفاری بۆ ناوچەی رەبذە.

دەرکردنی ئەبوودەردا لە شام.

ئەوانەش یان تۆمەت بوون، یان شێواندنی راستی هەڵوێستەکان بوون، یان گەورەکردنی رووداوەکان بوون زیاتر لە قەبارەی خۆیان، یان لێسەندنەوەی مافی ئیجتیهاد و بڕیاردانی خەلیفە بوو، بە چەشنێک پێیان رەوا نەدەبینی، هێندەی حاکمێکیش دەسەڵاتی حوکم و بڕیاردانی هەبێت.

- هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەسوکاریدا:

حەکەمی گێڕایەوە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دووری خستبوویەوە.

موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیانی کرد بە والی کە شیاوی کاربەدەستی نەبوو.

عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیزی کرد بە والی کە شیاوی کاربەدەستی نەبوو.

مەڕوانی کرد بە والی کە شیاوی کاربەدەستی نەبوو.

پێنج یەکی ئەفریقیای دا بە مەڕوان.

بەخششی هەبوو بۆ خزم و نزیکانی خۆی و موسڵمانانی لێ بێبەش دەکرد.

وەلیدی کوڕی عوقبەی کرد بە والی کە کەسێکی فاسقەو شیاوی کاربەدەستی نیە.

بە گشتی، هەڵوێستی عوثمان بەرامبەر بە خزم و کەسەکانی، لە رێڕەوی گشتی شەریعەت دەرنەچووە، ئەو خزمانەی کە کران بە والی، کەسانی شیاو بوون و بە ئیجتیهاد کران بە والی، هەروەها کەمینەیەکی والیەکان لە خزمانی خۆی بوون، جگە لەوە، هەندێک لەوانە، وەک موعاویە، لەلایەن خەلیفەی پێشووەوە دانرابوو و لێهاتوویی موعاویەش لای هەموان روون و بەرچاو بوو، ئەو بەخششەش کە باس دەکرێت، عوثمان لە داهاتی تایبەتی خۆی

بەخششی دەکردن، ئەوەش کە بە مەڕوانی بەخشی، بە ئیجتیهادێک بوو و پاش ئەوەی نارەزایی موسڵمانانی لێکەوتەوە، خێرا لێی وەرگرتەوە.[1]

- رەخنەگرتن لە ئیجتیهادەکانی:

سوننەتی کورتکردنەوەی نوێژی لە سەفەردا لەکارخست.

عومەر بۆ لێدانی حەد قامچی بەکاردەهێنا، کەچی ئەم کردی بە گۆچان.

چوویە سەر پلیکانەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا ئەبووبەکر و عومەر لەو پلیکانە خوارتر دەوەستان بۆ وتاردان.

سووتاندنی موصحەفەکانی قورئان و هێشتنەوەی یەک نوسخە.

فراوانکردنی سنووری پەچەی ئاژەڵانی بەیتولمال و بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەندی شەخصیی خۆی.

عوبەیدوڵای کوڕی عومەری لە بەرامبەر هورمزاندا نەکوشت.

خەلیفە، هەم وەک گەورە هاوەڵێک، هەم وەک ئەندامێکی دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان، هەم وەک زانایەکی ناو هاوەڵان، مافی ئەوەی هەبوو ئیجتیهاد لە برێک مەسەلەدا بکات، زۆرینەی هاوەڵانیش گلەیی و رەخنەیان نەبووە لە ئیجتیهادەکانی، بەڵام ئاشووبگێڕان ئەو ئیجتیهادەیان پێ رەوا نەدەبینی.

- رەخنەگرتن لە رابردووی:

ئامادەی غەزای بەدر نەبووبوو.

لە رۆژی ئوحوددا مەیدانی جیهادی جێشهێت و رایکرد.

لە بەیعەتی ریضواندا ئامادە نەبوو.

بەشدارنەبوونی لە بەدردا، بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، نەوەک خۆدزینەوە بێت لە غەزاکە، بەجێگەیاندنی فەرمانی پێغەمبەریش(ﷺ) داواکراو و لەپێشترە لە حەز و بیرکردنەوەی شەخصی، جێهێشتنی مەیدانی جیهاد لە ئوحوددا، پاش دەنگۆی شەهیدبوونی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و دەستەیەک لە هاوەڵان ئەو هەڵوێستەیان هەبوو، خوای گەورەش بە دەقی ئایەت

[1] ابن الأثير: الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٥٢٨.

لێخۆشبوونی بۆ دەرکردن، ئامادەنەبوونی لە بەیعەتی ڕیضواندا، سەروەری بوو بۆ عوثمان، چونکە وەک نێردراوی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ مەککەو خۆی خستە بەردەم ئەگەری مەرگ و کوژران، خودی بەیعەتەکەش لەسەر دەنگۆی کوژرانی عوثمان وەرگیرا، واتە عوثمان، پێش هاوەڵان بە کردار بەیعەتی مەرگی بەجێگەیاند و چووە بەردەستی بێباوەڕان.

جارێک ئیبن عومەر لەگەڵ خەڵکێکی قوڕەیشیدا دانیشتبوو، کابرایەکی میصری هات بۆ لای، وتی ئەی ئیبن عومەر پرسیارێکت لێدەکەم وەڵامم بدەرەوە، ئایا دەزانیت عوثمان لە ڕۆژی ئوحوددا ڕایکرد؟ وتی بەڵێ، وتی دەزانیت لە بەدردا ئامادە نەبوو؟ وتی بەڵێ، وتی دەزانیت لە بەیعەتی ڕیضواندا ئامادە نەبوو؟ وتی بەڵێ، کابرا وتی الله اکبر، ئیبن عومەر وتی وەرە با بۆت ڕوون بکەمەوە، ڕاکردنی ئوحودی من شایەتی دەدەم کە خوا لێی خۆش بوو، بۆ ئامادەنەبوونی بەدریش لەبەرئەوەبوو کە کچەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هاوسەری بوو و نەخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو تۆ پاداشت و پشکی یەکێک لە ئامادەبوانی بەدرت هەیە، بۆ ئامادەنەبوونیشی لە بەیعەتی ڕیضوان، ئەوە ئەگەر لەناو مەککەدا بڵندپایەتر لە عوثمان هەبوایە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لەبری عوثمان دەنارد، پێغەمبەر(ﷺ) عوثمانی نارد و بەیعەتەکە دوای ئەوە بوو کە عوثمان چوو بۆ مەککە، لە کاتی بەیعەتەکەدا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی ڕاستی نیشان دا و فەرمووی ئەوە دەستی عوثمانە، دەستی ڕاستی دا بەسەر دەستەکەی تریدا و فەرمووی (ئەوە بۆ عوثمان)، ئینجا ئیبن عومەر بە کابرای وت دەی ئێستا بڕۆ.[1]

- دروستکردنی تۆمەت:

لەسەر وشترەکەی لەگەڵ کۆیلەکەیدا نامەیەکی نووسی بۆ ئیبن ئەبی سەرح سەبارەت بە کوشتنی ئەو کەسانەی لە نامەکەدا باسی کردبوون.[2]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٩٢، صحيح البخاري، الرقم ٣٥١٦، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٢٦.

[2] ابن العربي: العواصم من القواصم، ص ٦١ و ما بعدها.

ئەمـەش تۆمەتێـک بـوو کـە بـە پیلانێکـی ورد داڕێژرابـوو و ئاگـری فیتنەکەی پێ خۆشکرا و پیلانگێڕانی بـەرەو کۆشکی خیلافـەت ئاڕاستەکرد و شـەهیدبوونی خەلیفـەی لێکەوتـەوە.

**هەوڵی چارەسەر:**

دەنگـۆی هـەوڵ و پیلانەکانـی سـەبەئیەکان کەوتـەوە بەرگوێـی خەلیفـە و موسـڵمانانیش، بـۆ چارەسـەری ئەمـەش چەنـد هەنگاوێـک نـران:

خێـرا موسـڵمانان هەواڵەکەیـان گەیانـدە خەلیفـە و داوای چارەسـەرکردنی بارودۆخەکەیـان کـرد، بژاردەی چارەسەریشیان خسـتە بەردەسـتی خەلیفـە.

خەلیفـە گوێبیسـتی رەخنـە و ناڕەزاییـەکان بـوو، هەندێـک لەوانـەی چارەسـەر کـرد، وەک گۆڕینـی هەندێک لـە والیـەکان، ناڕەوابوونـی هەندێـک لـە رەخنەکانیشـی سـەلماند.

بـۆ هـەر ناوچەیـەک نێردراوێکـی خـۆی نـارد بـۆ وەرگرتنـی وردەکاری، ئوسامەی کوڕی زەید بۆ بەصرە و موحەممـەدی کوڕی مەسلەمە بۆ کووفە و عەبدوڵای کـوڕی عومـەر بۆ شـام و عەممـاری کـوڕی یاسـر بـۆ میصـر.

خەلیفـە، بانگهێشـتی سـەرجەم والـی و بەرپرسـەکانی کـرد و لـەو بارەیـەوە راوێـژی پێکـردن و دواتـر بڕیـاری کۆتایـی درا.[1]

**شەهیدکردنی عوثمانی کوڕی عەففان:**

پـاش گەڕانـەوەی والیـەکان و چڕکردنـەوەی هەوڵـەکان بـۆ چارەسـەری دەنگـۆکان، ئاشـووبخوازان هەوڵیانـدا پێـش سـەرکوتکردنیان، فریـای خۆیـان بکـەون و گۆمەکـە بشـڵەقێنن، بـۆ ئەمـەش بانگەوازیـان کـرد هەمـوان لـە ناوچەکانـەوە رووبکەنـە مەدینـە،[2] ئەوەبـوو لـە مانگـی ذیلقەعیـدەی سـاڵی سـی و پێنجی کۆچیدا لـە مەدینە کۆبوونـەوە[3] و سـەرەتا چاویـان کـەوت بـە

---

[1] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٥٢٧.

[2] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٥٢٩.

[3] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ١٧٥.

نوێنەرانی خەلیفە کە بریتی بوون لە (عەلی کوڕی ئەبووطالیب، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا، زوبەیری کوڕی عەووام)،[1] دواتریش چاویان کەوت بە خودی خەلیفە، پاش مشتومڕێکی زۆر رازیی بوون بە گەڕانەوە، بەڵام پیلانی کۆتایی جێبەجێ کرا کە بریتی بوو لە ساختەکردنی نامەیەک بەناوی خەلیفەوە، گوایە لەو نامەدا فەرمانی کردووە بە والی میصر، لەگەڵ گەیشتنەوەی ئەو خەڵکەدا، هەموویان بکوژێت، پێشتریش نامەی ساختە بە ناوی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و زوبەیری کوڕی عەووامەوە نووسرابوو و نیشانی خەڵک درابوو، گوایە داوایان کردووە، لە هەموو ناوچەکانەوە کۆببنەوەو بێن بۆ کوشتنی خەلیفە.[2]

پیلانەکە سەری گرت و ئاشووبخوازان و هەڵخەڵەتاوانی دەستی ئاشووبخوازانیش گەڕانەوەو گەمارۆی ماڵی خەلیفەیان دا، پاش گەمارۆدانی ماڵی خەلیفە، سێ بژاردەیان دەستنیشان کرد:

وازهێنانی خەلیفە،

خۆبەدەستەوەدانی خەلیفە

کوشتنی خەلیفە.[3]

خەلیفەش بە هیچکام لەو بژاردانە رازی نەبوو، بۆ هەریەک لەوانەش بەڵگە و بیانووی بەدەستەوە بوو.

عائیشە دەڵێت: جارێک پێغەمبەر(ﷺ) دای بەسەر شانی عوثماندا و پێی فەرموو (**يا عثمان، إن الله عز وجل عسى أن يلبسك قميصا، فإن أرادك المنافقون على خلعه، فلا تخلعه حتى تلقاني**)،[4] (ئەی عوثمان، لەوانەیە خوای گەورە جلێکت بەبەردا بکات، جا ئەگەر دووڕووەکان ویستیان لایبەرن، لایمەبە تا دەگەیتەوە پێم، سێ جار ئەوەی پێ فەرموو)، مەبەست بەو جلە خیلافەتێک بوو کە خوا

[1] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٥٣٠.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ١٧٥.

[3] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ١٨٥.

[4] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٠١٢، صححه شعيب الأرناؤوط.

پێی بەخشی و دوورڕووەکانیش ئەو ئاشووبگێڕانە بوون کە ویستیان لە خیلافەتەکەی لایبەرن، دواجاریش شەهیدیان کرد.

- ماوەی چل ڕۆژ گەمارۆکە درێژەی کێشا،[1] هاوکات خەلیفە، نەیهێشت موسڵمانان بەرگریی لێ بکەن،[2] مەبەستی بوو فیتنە و خوێن ڕژان تووشی موسڵمانان نەبێت و سەرجەم تیرەکان تەنها ڕوو لە خۆی بن، دواجار، ئاشووبخوازان هێرشیان بردە سەر خەلیفە و شەهیدیان کرد.[3]

ماوەی گەمارۆدانی ماڵی عوثمان چل ڕۆژ بوو، شەهید کردنیشی لە ڕۆژی هەینیدا بوو، لە ڕۆژی هەژدەی ذیلحیججەدا بوو، رایەک دەڵێت: لە ڕۆژانی پاش جەژنی قوربان بوو، رایەکیش دەڵێت: لە سێی مانگی ذیلحیججەدا بوو، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە لە هەژدەی مانگی ذیلحیججەدا بوو، تەمەنیشی هەشتاو دوو ساڵ تێپەڕی کردبوو، هەندێک دەڵێن هەشتاو دوو ساڵ و شەش مانگ، یان دەڵێن هەشتاو چوار ساڵ یان هەشتاو شەش یان هەشتاو هەشت یان نەوەد ساڵ بوو، هەریەک لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی و حەفتاو پێنج ساڵیش هاتووە،[4] ئیبن حەجەر دەڵێت: ڕاسترینیان ئەوەیە لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵ و شەش مانگیدا شەهید کرا.[5]

کاتێک هەواڵی شەهیدبوونی عوثمان گەیشت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەلی تەواو شڵەژا و هاودەم بە طەلحەو زوبەیر و سەعد چوون بۆ لای عوثمان و بینییان کوژراوە، عەلی تووڕە بوو لە حەسەن و حوسەین و وتی: ئێوە لەبەر دەرگا بوون و هێشتتان ئەمیری باوەڕداران بکوژرێت؟! ئەوانیش وتیان: ئێمە ئاگادار نەبوین بە کوژرانی، عەلی دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی دا لە حەسەن و دای بەسەر سنگی حوسەینیشدا، قسەشی وت بە

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ١٩٠.

[2] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٥٤٠.

[3] ابن كثير: البداية والنهاية، طبعة دار هجر، ج١٠، ص ٢٩٨-٣١٠.

[4] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ١٩٠-١٩١.

[5] ابن حجر: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٤٥٨.

موحەممەدی کوڕی طەلحەو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر.[1]

**پشکی هاوەڵان لە شەهیدبوونی عوثماندا:**

بە گشتی لە سێ خاڵدا ئەم پرسە دەخەینەڕوو:

یەکەم: شێواندنی رای هاوەڵان: ئاشووبگێڕان ناوبانگ و کەسێتی هاوەڵانیان دەقۆستەوە، یان ئیجتیهادەکانیان بۆ خۆیان دەقۆستنەوە وەک ئیجتیهادەکەی ئەبووذەر، یان نامەی ساختەیان بە دەم گەورە هاوەڵانی وەک عائیشەی دایکی باوەڕداران و عەلی و زوبەیر و طەلحەوە دەنووسی.

دووەم: هاوەڵان بە گشتی، هەوڵی بەرگریکردن لە خەلیفەیان دا، بەڵام خودی خەلیفە ڕێگریکرد لەو هەوڵەیان، بۆ نموونە:

پشتیوانان: زەیدی کوڕی ثابت بە خەلیفەی وت: وا پشتیوانان لەبەردەرگان و دەڵێن ئەگەر دەتەوێت ئێمە دووبارە پشتیوانانی خواین، عوثمان وتی: پێویستم بەوە نیە، دەست بگرنەوە-و مەجەنگن-.[2]

کۆچەریەکان: عەلی کوڕی ئەبووطالیب و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و زوبەیری کوڕی عەووام.[3]

گەنجە کۆچەریەکان، وەک حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلی، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر، عەبدوڵای کوڕی عومەر.[4]

صەفییەی دایکی باوەڕداران کە لە کاتی گەمارۆکەدا خواردنی دەگەیاند بە خەلیفە.[5]

سێیەم: لە پێشبینی هاوەڵاندا نەبوو بارەکە بگاتە کوشتنی عوثمانی کوڕی عەففان، بەڵام کە بارەکە گەیشتە ئەوە، ئینجا هاوەڵان هەستیان کرد بە کەمتەرخەمییان لە بە مەترسی گرتنی ئەو بارەو هەندێک لۆمەی خۆیان

---

[1] ابن حبان: الثقات، ج٢، ص ٢٦٥.

[2] تاريخ خليفة ابن خياط، ص ١٧٣.

[3] ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، ص ٥٣٠.

[4] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ١٨١.

[5] ابن حجر: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٤١.

دەکرد، هەندێک لۆمەی ئەوانی تریان دەکرد کە بۆچی کەمتەرخەم بون، هەندێکیش بڕیاری تۆڵەسەندنەوەیان دا.

## راجیایی و فیتنەی نێوان هاوەڵان
## لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا

کاتێک بەیعەتی خیلافەت درا بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، بارودۆخی موسڵمانان بەم چەشنە بوو:

- بەشێکی زۆری هاوەڵان لە مەدینە بوون و هەموویان بە کۆچەران و پشتیوانانیشەوە، بەیعەتیان دا بە عەلی.

- دایکانی باوەڕداران هاودەم بە بەشێک لە هاوەڵان و موسڵمانانێکی دی، پێشتر چووبوون بۆ مەککە بۆ بەجێگەیاندنی حەج، لەنێویشیاندا عائیشەی کچی ئەبووبەکر.

- موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و بەشێک لە هاوەڵانی ناو شام و خەڵکی شامیش، ئامادە نەبوون بەیعەت بدەن بە عەلی، مەگەر دوای تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عوثمان.

- موسڵمانان و هاوەڵانی هەرێمەکانی دەرەوەی حیجاز سەرجەمیان – جگە لە شام- بەیعەتیان دا بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب.

ئیجتیهادی هاوەڵان بۆ بارودۆخەکە بەم چەشنە بوو:

عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە خەلیفەی شەرعی بوو، پێی وابوو پەلە نەکەن لە تۆڵەسەندنەوە هەتا بارودۆخەکە هێور دەبێتەوەو ئاشووبخوازان پەرت دەبن، چونکە ئەوان لەوپەڕی بەهێزیدان و لە باشترین حاڵەتدا، ئەگەر جەنگیشیان لە دژ رابگەیەنرێت، خوێنێکی زۆر دەڕژێت.

عائیشەی دایکی باوەڕداران و هەریەک لە طەلحە و زوبەیریش کە بەیعەتیان دابوو بە خەلیفەو بەهۆی سووربوونیان لەسەر تۆڵەسەندنەوەی

عوثمان روویانکردبوویە مەککە، پێیان وابوو دەبێت تۆڵەی خوێنی عوثمان دوانەخرێت و ڕێگە نەدرێت ئاشووبگێڕان بڵاوەی لێ بکەن، ئەگەر خەلیفە رازی ببێت، ئەوە دەچنە ژێر ئاڵای سوپاکەی، ئەگەریش بەوە رازی نەبێت، ئەوە دەبێت لە هەرێمەکانی ترەوە کاربکرێت لەسەر نیشاندانی مەترسی سەبەئی و ئاشووبخوازەکان و فشارێکی وا دروست بکرێت کە خەلیفە قەناعەت پێ بکات بەبێ دواخستن تۆڵەی خوێنی عوثمان بکرێتەوە، بەم نیازەوە بڕیاریان دا رووبکەنە بەصرە و دواتر جەنگی جەمەلی لێکەوتەوە.[1]

موعاویە و هەوادارانیشی لە شام، پێیان وابوو هەتا تۆڵەی خوێنی عوثمان نەکرێتەوە، هیچ بەیعەتێک نەدەن بە عەلی و ملکەچی دەسەڵاتەکەی نەبن، چاوەڕێ بوون ئەو مەرجە لەلایەن خەلیفەوە وەڵام بدرێتەوە.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەو چەشنەی کە پێشتر مەرجی دانابوو، دەبێت موسڵمانان رازی بن بە چەشنی بەڕێوەبردنی خیلافەتەکەی، دەیویست سەرجەم موسڵمانان پابەندی بڕیارەکەی بن.

عائیشە و طەلحە و زوبەیریش بۆ بەجێگەیاندنی ئیجتیهادەکەیان، روویانکردە بەصرە و موسڵمانانێکی زۆر چوونە ریزی سوپاکەیانەوە.

موعاویەش لە شام مایەوەو چاوەڕێی وەڵامی مەرجەکەی بوو، خەلیفەش بڕیاری لابردنی موعاویەی دەرکردبوو، موعاویەش لەبەرئەوەی تا ئەو کاتە بەیعەتی نەدابوو، ئامادە نەبوو ئەو فەرمانە قبووڵ بکات.

**جەنگی جەمەل:**

پاش ئەوەی عائیشە و سوپاکەی گەیشتنە دەوروبەری بەصرەو پەیامی خۆیان گەیاندە سەرکردەو جەماوەری ناوچەکە و والی بەصرە و موسڵمانانی ئەوێ مەرامی هاتنی سوپاکەیان زانی،[2] خەڵکەکە دابەش بوون بەسەر سێ بەشدا:

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٢٣١.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٢٣٢.

بەشێک راستەوخۆ بە ئیجتیهادەکەی عائیشە رازی بوون و دایانە پاڵ سوپاکەی.

بەشێکی دیکەیان، لەنێوان بەرەی عائیشە و گەورە هاوەڵانێکی وەک طەلحەو زوبەیر و بەرەی خەلیفەی باوەڕدارانـدا دەستەوسان وەستان و بێلایەنییان هەڵبژارد.

بەشێکی دی کە والی و هەوادارانی بوون، لەسەر بەیعەتەکەی عەلی مانەوەو ئامادە نەبوون دەرگای شارەکە بە رووی عائیشە و هەوادارانیدا بکەنەوە، بەم هۆیەشەوە وردە بەریەککەوتنێک لەنێوان هەردوو سوپادا روویدا.[1]

خەلیفەش کە ئاگادار بوو بە هەڵوێستی هەریەک لە خەڵکی شام و بارودۆخی بەصرە، سەرەتا هەوڵیدا بەبێ دەرچوون لە مەدینە، لە رێی ناردنی نێردراوانی خۆیەوە، لە ناوچەکاندا کێشەکان چارەسەر بکات، بەڵام بەهۆی سەرنەگرتنی پلانەکەیەوە، دواجار بڕیاریدا خۆی بچێت بەدەم مەسەلەکەوەو رێگەنەدات لە سەردەمەکەی ئەودا بۆ یەکەمجار پەرتبوون و بەشبەشبوون لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا رووبدات، بۆیە سوپایەکی رێکخست و سەرەتا بەرەو بەصرە بەرێکەوت.

پێش ئەوەی هەر جۆرە بەرنگاربوونەوەیەک لەنێوان دوو سوپاکەدا رووبدات، قەعقاع کەوتە نێوانیانەوە، عائیشە و طەلحەو زوبەیری دواند و بانگهێشتی کردن بۆ یەکڕیزی و دوورگرتن لە دووبەرەکی، گوێی لە پەیامی ئەوانیش گرت (بۆ چاککردنی حاڵی نێوان ئەو خەڵکە هاتوین)، سەبارەت بە شێوازی چاککردنەکەش پرسیاری لێکردن (لە چ روانگەیەکەوەیە؟ ئەگەر بە رەوامان زانی شوێنتان دەکەوین، ئەگەریش بە رەوامان نەزانی ئیتر هیچ)، وەڵامیشی لێ وەرگرتن (بکوژانی عوثمانمان دەوێن لەناوببرێن)، پاش ئەوەی وەڵامی پەیامەکەی ئەوانی دایەوە، ئینجا پێشنیاری خۆی بۆ

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، طبعة دار هجر، ج١٠، ص ٤٣٥ و ما بعدها.

چارەسەر خستەڕوو (پێم وایە دەرمانی ئەم دەردە ئارامگرتنە تا بارەکە هێور دەبێتەوە)، ئەوانیش وتیان (رازین، ئەگەر عەلیش هەمان رای هەبوو) عەلیش هەمان رای هەبوو، بەم چەشنە هەردوولا رێککەوتن، پاش دیداری نێوان هەردوولا، دڵخۆشی هەردوو بەرەی موسڵمانانی گرتەوەو خەلیفەش وتارێکی پێشکەش کرد بۆ خەڵکەکە کە تیایدا باسی خراپەی دووبەرەکی کرد و نیازی رێککەوتنەکەی خستەڕوو.

لە وتارەکەی خەلیفەوە، کە دەستەی ئاشووبگێڕان زانییان خەریکە هەردوولا رێکدەکەون، کەوتنە خۆ و وتیان (ئەم رێککەوتنە دژ بە ئێمەیەو ژمارەشمان کەمە و رێککەوتنی ئەوان تەنها لەسەر خوێنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت عەلیش وەک عوثمان لێبکەین)، بەڵام عەبدوڵای کوڕی سەبەء وتی: راکەتان زۆر خراپە، چونکە ئەوکات هەردوولا دەبنە دوژمن و لێتان دەدەن، بەڵکو دەبێت جەنگ لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەڵگیرسێنین، سەبەئیەکان خۆیان بەشکرد بەسەر هەردوولادا و جەنگیان هەڵگیرساند، هەردوولا وایانزانی بەرامبەر ناپاکی نواندووە، جەنگێکی قورس روویدا و هەریەک لە طەلحە و زوبەیر تیایدا کوژران، سوپای عەلی سەرکەوت و عائیشە و یاوەرانیشی لەلایەن خەلیفەوە بە رێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ کرا و بەرەو مەدینە گەڕێنرانەوە.[1]

جەنگەکە لە رۆژی هەینی و لە ناوەڕاستی مانگی جومادیلئاخیرەی ساڵی سی و شەشی کۆچیدا روویدا و لە هەمان رۆژدا کۆتایی پێ هات.[2]

سەبارەت بە ژمارەی کوژراوانی ئەو جەنگە، زیادەڕەویەکی بێشومار کراوەو بەپێی ماوەو کاتی جەنگەکەو سوورنەبوونی جەنگاوەرانی هەردوولا لەسەر کوشتاری بەرامبەر و بەراوردی کوژراوانی ئەو جەنگە لەگەڵ کوژراوانی جەنگە گەورەکانی ئەو کات و سەردەمەدا، دەردەکەوێت ژمارەی کوژراوانی هەردوولا لە چەند سەد کەسێک تێپەڕی نەکردووە.

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٧، ص ٢٣٨ وما بعدها.

[2] تاريخ خليفة ابن خياط، ص ١٨٥.

**جەنگی صفین:**

هۆکاری سەرەکی جەنگەکە، دوو ئیجتیهادی جیاوازی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان بوو، عەلی دەیوت: دەبێت موعاویە و خەڵکی شام بەیعەت بدەن، چونکە بەیعەتی خیلافەت بەم دراوەو نابێت دوو خەلیفە هەبن، موعاویەش دەیوت: دەبێت تۆڵەی خوێنی عوثمان وەربگیرێتەوە، ئینجا باسی بەیعەت دەکرێت.

تۆمەتێک ئاراستەی موعاویە کراوە کە گوایە ویستوویەتی خۆی ببێت بە خەلیفە، بۆیە بەیعەتی نەداوەو جەنگی هەڵگیرساندووە، بەڵام لە راستیدا هیچ دەقێکمان نیە ئاماژە بەوە بدات موعاویە نیەتێکی لەو چەشنەی هەبووبێت، بەڵکو بە دەقی صەحیح ئامانجی موعاویە باسکراوە:

ئەبوومسلیمی خەولانی و چەند کەسێکی دی، بە موعاویەیان وت: لەگەڵ عەلی نیزاع دەکەیت؟ -لە سەر خیلافەت ململانێی لەگەڵ دەکەیت؟- مەگەر تۆ وەک ئەو وایت؟ ئەویش وتی: نە بەخوا، من چاک دەزانم عەلی لە من باشترە و پایەدارترەو لەمن لەپێشترە بەم کارە -خیلافەت-، بەڵام مەگەر ئێوە نازانن عوثمان بە ستەملێکراویی کوژراوەو منیش ئامۆزای ئەوم، ئێستاش وا داوای خوێنەکەی دەکەم، بڕۆن بە عەلی بڵێن با بکوژەکانی عوثمانم بداتە دەست، منیش دەچمە ژێر بڕیاری ئەو، ئەوانیش رۆیشتن بۆ لای عەلی و ئەوەیان پێ وت، بەڵام عەلی رازی نەبوو.[1]

بە دەقی صەحیح سەلماوە کە هەردوو سوپای عەلی و موعاویە لە موسڵمانانن،[2] هەروەها موعاویە و سوپاکەی دەستەی یاخیبوون (الفئة الباغية)،[3] عەلی و سوپاکەشی لە حەقەوە نزیکترن،[4] عەلیش بۆ جێبەجێکردنی دەقی قورئان، بڕیاری دا جەنگی موعاویە و سوپاکەی بکات،

[1] الذهبي: تاريخ الاسلام، ج٣، ص ٥٤٠.
[2] صحيح البخاري، الرقم ٢٥٧٧.
[3] صحيح البخاري، الرقم ٢٦٧٧.
[4] صحيح مسلم، الرقم ١٨٣٠،

خـوای گـەورە دەفەرموێت (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٩) إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ)، واتـە (ئەگـەر دوو دەسـتە لـە بـاوەڕداران پێکـەوە بـە جەنـگ هاتـن جـا هەرچـی تواناتـان هەیـە بـەکاری بێنـن و ئاشـتیان بکەنـەوەو بانگیـان بکـەن بـۆلای بڕیارەکانـی خـوا جـا ئەگـەر دەسـتەیەکیان دەسـت درێژیـی کـردە سـەر دەسـتەکەی تـر، واتـە: ملـی ڕانەکێشـا بـۆ ئاشـتیی و یەککەوتـن ئـەوا ئێـوەش لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵەیانـدا بجەنگێـن کـە دەسـتدرێژی دەکات، تـا ناچـار دەبـێ و دەگەڕێتـەوە بـۆ بڕیـارو حوکمـی خـوا. ئینجـا ئەگـەر کۆمەڵـە ستەمکارەکە گەڕایـەوە بـۆ حوکمـی خـوا، جـا ئێوەیـش بەئینصـاف ناوبژییـان بکـەن وە دادپـەروەر بـن و بـەلای هیـچ کەسـێکیاندا دامەبـڕن چونکـە بێگومـان خـوا دادپەروەرانـی خـۆش دەوێ،بەڕاسـتی هـەر بـڕواداران بـرای یەکـن جـا ئەگـەر لـە نێـوان دوو براتانـدا، ناکۆکـی پەیـدا بـوو ئێـوەش بەزوویـی نێوانیـان چـاک بکـەن و ئاشـتیان بکەنـەوە هەمیشـە لـە خـوا بترسـن لـە هەمـوو گوتـارو کردارێکتانـدا، بەشـکو خـوا ڕەحمتـان پێبـکات.).

عەلـی کـوڕی ئەبووطالیـب جەنگـی سـوپای شـامی کـرد هەتـا ئـەو کاتـەی گەڕانـەوە بـۆ فەرمانـی خـوا، ئـەوکات دەسـتی هەڵگـرت لـە لێدانیـان و بڕیـاری دادوەریـی دا، دوای خۆیشـی حەسـەنی کـوڕی بەشـی دووەمـی جێبەجـێ کـرد کـە صولحـی نێـوان برایانـی موسـڵمان بـوو.

پـاش ئاڵوگـۆڕی نامـە و نێـردراو لەنێـوان عەلـی و موعاویـە و نەگەیشـتنە ئەنجـام، عەلـی کـوڕی ئەبووطالیـب بڕیاریـدا هێـرش بباتـە سـەر شـام هەتـا ئـەو کاتـەی موعاویـە و سـوپاکەی دێنـە ژێـر بـار، موعاویـەش پـاش ڕاوێـژ بـە خەڵـک و دەوروبەرەکـەی، بڕیاریـدا بەرنـگاری سـوپاکە ببێتـەوە، عەلـی لـە عێراقـەوە سـوپایەکی چەنـد هـەزار کەسـی ئامـادە کـرد و موعاویـەش بـە سـوپایەکی چەنـد

هەزار کەسیەوە رووەو ناوچەی صفین هات، لەویّ هەردوو سوپا ماوە ماوە هێرشیان دەبردە سەر یەکدی، دواجار لە جەنگێکی سەختی چەند رۆژەدا بەریەککەوتن، تیایدا عەمماری کوڕی یاسر کە لەنێو سوپای عەلیدا بوو، بە دەستی سوپاکەی موعاویە کوژرا، پێغەمبەریش(ﷺ) ئاماژەی بەوەدابوو کە دەستەی یاخیبوو عەممار دەکوژن، بەوەش ئەوە روون بوویەوە کە حەق لای عەلی کوڕی ئەبووطالیبە، لە هەردوو لاوە ویستی صولح و رێککەوتن روو لە هەڵکشان بوو، سوپای موعاویە بڕیاریان دا واز لە جەنگ بهێنن و داوای صولحیان کرد، نوسخەیەکی قورئانیان برد بۆ عەلی کوڕی ئەبووطالیب هەتا لەسەر قورئان رێکبکەون، ئەویش رازی بوو، هەر لایەک نوێنەری خۆی دەستنیشان کرد بۆ ئەنجامدانی رێککەوتنەکە، بەم چەشنە جەنگەکە کۆتایی پیّ هات.[1]

**مەسەلەی دادوەریی:**

لە بەرەی عەلی کوڕی ئەبووطالیبەوە ئەبوومووسای ئەشعەری و لە بەرەی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیانیشەوە، عەمری کوڕی عاص، وەک نوێنەر دەستنیشان کران و دەستکراوە کران هەتا لەسەر دەقێکی روون رێکبکەون و صولحی نێوان هەردوولا بکەن.[2]

لەم بارەوە چەندین گێڕانەوەی نادروست تۆمارکراون و لە کتێبەکانی مێژووی ئیسلامیدا بازاڕگەرمییان بۆ کراوە، لە گێڕانەوەکاندا ئەبوومووسا بە کەسێکی کاڵفام و سادەو نەزان باسکراوە، لەکاتێکدا پێشتر لە سەردەمی عومەر و عوثمانیشدا بەرپرسیارێتی گەورەی پیّ سپێردرابوو، عەمری کوڕی عاصیش بە کەسێکی فێڵباز و تەکەڵەباز نیشان دراوە، سەنەدی هیچکام لە گێڕانەوەکانیش دروست نین.

سەبارەت بە رێککەوتنی نێوان ئەو دوو دادوەرە، دەقێکی روون بە

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص ٥٤١ و ما بعدها.

[2] ابن الجوزي: المنتظم، ج٥، ص ١٢٣.

صەحیحی تۆمار نەکراوە، بەڵام دەرهاویشتەکانی ڕێککەوتنەکە، ئەوە نیشان دەدەن کە ڕێککەوتنێک لەو نێوەندەدا هەبووە.

**مەترسیە ناوخۆیی و دەرەکیەکان**

لە سەروبەندی ململانێکانی نێوان عەلی و موعاویە و پاش ڕوودانی جەنگی صفین و مەسەلەی دادوەریی نێوانیان، دوو مەترسیی نوێ دەرکەوتن کە بە خێرایی هەوڵ درا بەریان پێ بگیرێت، مەترسیەکی دەرەکی لە بەرەی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیانەوە کە هێرشی ڕۆمەکان بوو، مەترسیەکی ناوخۆییش لە بەرەی عەلی کوڕی ئەبووطالیبەوە کە خەواریجەکان بوون.

هێرشی ڕۆمەکان:

لە سەروبەندی ناکۆکی و جەنگی نێوان هەردوولادا، پادشای ڕۆمەکان بە فرسەتی زانی و سوپاکەی ڕێکخستەوەو هەوڵیدا هەندێک لەو ناوچانە بگێڕێتەوە کە پێشتر سوپای ئیسلامی فەتحی کردبوون، خێرا موعاویە هەستی بە مەترسی بارودۆخەکە کرد و نامەیەکی هەڕەشەئامێزی بۆ نووسی: (ئەی نەفرەت لێکراو، سوێند بەخوا ئەگەر دەست هەڵنەگریت و نەگەڕێیتەوە بۆ نێو وڵاتی خۆت، لەگەڵ ئامۆزاکەمدا لە دژت ڕێکدەکەوم و لە هەموو ناوچەکانی وڵاتەکەت دەرت دەکەم و سەرزەویت لێ بەرتەسک دەکەمەوە)، پادشای ڕۆم کە ئەمەی پێگەیشت، ترس و بیم دایگرت و دەستی هەڵگرت و خێرا داوای ئاگربەستی کرد.[1]

**جەنگی خەواریجەکان:**

پاش ڕێککەوتنی نێوان ئەبوموسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص، دەستەیەکی نێو سوپاکەی عەلی، ئەمەیان بە تاوانێک وەسف کرد کە خاوەنەکەی پێی کافر دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە، حوکمی بێباوەڕیی و کوفری عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان دەرکرد و جەنگیان لە دژ ڕاگەیاند،[2]

---

[1] ابن كثير: البداية و النهاية، ج١١، ص ٤٠٠.

[2] البغدادي: الفرق بين الفرق، ص ٥٦.

دروشمەکەیان ئەوەبوو دەیانوت حوکم تەنها بۆ خوایە، ئەمانەش بە خەواریجەکان ناسراون.

بۆ بەرگرتن بەم مەترسیە نوێیە، عەلی کوڕی ئەبووطالیب بە سێ جۆر هەنگاوی نا:

یەکەم: نەرمی نواندن: عەلی دەیوت مزگەوتتان لێ قەدەغە ناکەین و پشکی خۆتان پێ دەدین و لەگەڵتان ناجەنگین مەگەر ئێوە دەست بکەن بە جەنگ.[1]

دووەم: دانووستان و وتوێژ: بۆ ئەمەش کەسانی وەک عەبدوڵای کوڕی عەبباسی نارد هەتا قسەیان لەگەڵدا بکات، ئەویش پاش ئەوەی سەردانی کردن و وتوێژی لەگەڵ کردن، توانی قەناعەت بە زۆرینەیان بکات، بەڵام بەشێکیان قەناعەتیان نەکرد و لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەرچوون.[2]

سێیەم: جەنگی یەکلاکەرەوە: خەواریجەکان لە نەهرەوان کۆبووبوونەوەو لەوێ کەوتنە کوشتار و ئاژاوە نانەوە، بەتایبەت کوشتنی عەبدوڵای کوڕی خەبباب و هەڵدڕینی سکی ژنەکەی، کە عەلی ئەمەی بیست، ئیتر بڕیاری دا هێرش بباتە سەر خەواریج و لەگەڵیان بجەنگێت، سوپای کۆکردەوەو لە رووبار پەڕیەوەو خۆی گەیاندە لای خەواریجەکان، سەرەتا داوای کرد ئەوانەی بەشدار بوون لە کوشتاری خەڵکدا تەسلیم بکرێن هەتا تۆڵەیان لێ بکرێتەوە، کەچی ئەوان رازی نەبوون، بەڵکو وتیان: هەموومان بکوژین و خوێنی ئێوەشمان لا حەڵاڵە، هەریەک لە ئەبووئەیووبی ئەنصاری و سەعدی کوڕی عوبادە هەستان و ئامۆژگارییان کردن، بەڵام سوودی نەبوو، دواتر عەلی خۆی قسەی بۆ کردن، کەچی هەر وازیان نەهێنا، دواجار جەنگێکی سەخت لەنێوانیاندا روویدا و تیایدا خەواریجەکان شکان و کوشتارێکی زۆریان لێ کرا.[3]

---

[1] ابن كثير: البداية و النهاية، ج٧، ص ٢٨٥ - ٢٩٠.

[2] أبو نعيم: حلية الاولياء، ج١، ص ٣١٨.

[3] ابن كثير: البداية و النهاية، ج٧، ص ٢٨٥ - ٢٩٠.

### دامرکانەوەی ئاگری فیتنە

پاش ئەوەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب شەهید کرا، بەیعەتی خیلافەت درا بە حەسەنی کوڕی عەلی، خەڵکی لەسەر راوبۆچوونی خۆیان بەیعەتیان پێدا، نەوەک هیچ دەقێکی نەقڵیی لەبارەی خیلافەتیەوە هاتبێت، عەلی باوکیشی لە سەرەمەرگیدا دەیوت: من بەو بارەوە جێتان دێڵم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) جێی هێشتن-واتە کەستان بۆ دیاری ناکەم- جا ئەگەر خوا خێری بوێت بۆتان، لەسەر چاکترین کەستان کۆتان دەکاتەوە، وەک چۆن دوای پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر چاکترین کەستان کۆی کردنەوە.[1]

نزیکەی چل هەزار کەس بەیعەتیان دا بە حەسەن، ئەوانە پێشتر بەیعەتی مەرگیان دابوو بە عەلی باوکی،[2] حەسەنیش مەرجی لەسەر خەڵکی دانا (بەو بڕیارە بەیعەتتان پێ داوم کە لەگەڵ هەر کەسێ ئاشتی بکەن کە من ئاشتی لەگەڵ دەکەم و لەگەڵ هەر کەسێ بجەنگن کە من لەگەڵی دەجەنگم)، ئینجا رازی بوو بەیعەتی پێ بدرێت.[3]

### رێککەوتن و دەستبەرداربوون لە خیلافەت

لەژێر فشاری خەڵکی عێراق و سەربازانیدا، حەسەن سوپایەکی دوانزە هەزار کەسی رەوانە کرد بۆ جەنگ دژ بە سوپای شام، سەرکردەی سوپاکەش قەیسی کوڕی سەعد بوو، موعاویەش لەولاوە بە سوپایەکەوە بەرەو عێراق پێشڕەوی کرد، بەڵام دەنگۆی کوژرانی سەعد، سوپای حەسەنی خستە شڵەژان و دووبەرەکیەوە،[4] دەست کرا بە تاڵان و بڕی و خودی حەسەنیش لەلایەن ئەندامێکی ناو سوپاکەیەوە بریندار کرا،[5] بەڵام زۆریی سوپا و بەهێزیی کەسایەتی خودی حەسەن، وایکرد سوپای شام

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٨ ص ١٤.

[2] ابن الأثير: أسد الغابة، ج٢، ص ١٩.

[3] ابن حجر: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

[4] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٨ ص ١٤.

[5] الذهبي: تأريخ الإسلام، ج٤، ص ٦.

هەست بە کەلێن و لاوازیەکانی نەکەن، بەڵکو موعاویەش حەزی خۆی نیشاندا بۆ ڕێککەوتن،[1] بە چەشنێک دواتر پەڕەیەکی سپی نارد بۆ حەسەن و پێی وت: چ مەرجێکت دەوێت بینووسە،[2] لە خوارووی پەڕەکەشەوە مۆری خۆی لێدابوو.[3]

پێشتریش حەسەنی کوڕی عەلی، بەو مەرجەی کە لە کاتی بەیعەت وەرگرتندا لەسەر خەڵکەکەی دانا، حەز و نیەتی خۆی بۆ صوڵح و ڕێککەوتن نیشاندابوو، بۆیە دیارترین ڕووداوی خیلافەتە شەش مانگیەکەی، ڕێککەوتنی بوو لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و دەستبەرداربوونی بوو لە خیلافەت لەپێناو یەکڕیزیی موسڵماناندا.

لەگەڵ سەرەتاکانی ئەم حەز و ویستەی حەسەن و دەرکەوتنی ئاماژەکانیدا، ئاشووبگێڕانێک دەیانویست بەری پێ بگرن،[4] وەک چۆن لە سەردەمی باوکی و لە جەنگی جەمەلدا بەریان گرت بە ڕێککەوتنی نێوان عەلی و عائیشە، بەڵام ویستی خوای لەسەربوو نزاکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێتەدی کە حەسەن ببێتە هۆی ئاشتیی و ڕێککەوتنی نێوان دوو دەستەی گەورەی موسڵمانان.[5]

چەند کەسایەتیەک کەوتە نێوان هەردوو سوپاوەو هەوڵی ڕێککەوتنەکەیان دەستپێکرد و ڕەزامەندیی هەردوو سوپایان بەدەستهێنا بۆ ڕێککەوتن،[6] دواجار هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر چەند خاڵێک کە ڕاجیایی هەیە لەسەر وردەکاریی ڕێککەوتنەکە، ئەوەی ڕوونە بریتیە لە ڕێککەوتن لەسەر:

یەکەم: دەستگرتنەوە لە جەنگ و ڕشتنی خوێنی موسڵمانان.

---

[1] صحيح البخاري، الرقم ٢٥٧٧.

[2] ابن الجوزي: المنتظم، ج ٥، ص ١٨٣.

[3] تأريخ ابن خلدون، ج٢، ص ٦٤٨.

[4] الذهبي: تأريخ الإسلام، ج٤، ص ٦.

[5] صحيح البخاري، الرقم ٣٤٥٠ .

[6] صحيح البخاري، الرقم ٢٥٧٧.

دووەم: پێدانی دەسەڵات بە موعاویە، بەو مەرجەی دوای موعاویە خیلافەت بە شوورا بێت.[1]

سێیەم: دەستنیشانکردنی داهاتێکی دیاریکراو بۆ حەسەنی کوڕی عەلی.[2]

دوای ئەم ڕێککەوتنە، خەڵکێک ڕازی نەبوون بەیعەت بدەن بە موعاویە، بۆیە حەسەن کەسە دیارەکانی خەڵکی عێراقی لە کۆشکی مەدائیندا کۆکردەوە و پێی وتن: ئێوە بەو بڕیارە بەیعەتتان پێ داوم کە لەگەڵ هەر کەسێک ئاشتی بکەن کە من ئاشتی لەگەڵ دەکەم و لەگەڵ هەرکەسیش بجەنگن کە من لەگەڵی دەجەنگم، وا منیش بەیعەتم داوە بە موعاویەو ئێوەش گوێڕایەڵی بن.[3]

[1] ابن حجر الهيتمي: الصواعق المحرقة، ج٢، ص ٣٩٩.
[2] صحيح البخاري، الرقم ٢٥٧٧.
[3] ابن حجر: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٧٣.

# چۆن بڕوانینە هاوەڵان

بەگشتی چەند خاڵێک دەخەینەڕوو تا بزانین بە چ چاوێک تەماشای هاوەڵان بکەین، چونکە زۆر کەس کە حوکمی ناحەق دەدەن بەرامبەر بە هاوەڵان، لە نەبوونی پێوەرێکی ڕەوایە لەلایان، ئیتر یان زێدەڕۆیی دەکەن، یان کەمتەرخەمی دەنوێنن، مەرجیش نیە ڕوانین بۆ هاوەڵان تەنها لەم خاڵانەدا کۆبکرێتەوە:

یەکەم: هاوەڵان دەستەی بنەڕەتی پەیوەست بە دینی ئیسلامن:

چونکە ئەوان خوێندکاری خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و دەستەگوڵی پەروەردەی نێردراوی خوان، بۆیە ئەگەر بوترێت پۆلی هاوەڵان کەوتوون و لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچوون، دروستکردنی نیشانەی پرسیارە لەسەر خودی کەسێتی و توانا و گەیاندنی پەیامی پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوا.

هەروەها ئەوان نووسەرەوەی قورئان بوون، ئەو قورئانەی ئێستا لەبەردەستی هەمواندایە، لە دڵ و دەست و دەمی هاوەڵانەوە وەرگیراوە، ئەوان قورئانیان لە دڵەکانیاندا دەپاراست و بە دەست دەیانخستە سەر پەڕەکان و بە دەم دەیانگەیاند و بە کردەوەش پەیڕەویان دەکرد، بە هەمان شێوەش هەمان ئەرکیان بەرامبەر بە فەرمووده بەجێگەیاند تەنها هێندە نەبێت نووسینەوەی فەرموودەیان پەیڕەو نەدەکرد و زیاتر گرنگییان دەدا بە گەیاندنی بە زارەکی و کردەیی.

جا ئەگەر کەسێک بیەوێت هاوەڵان بشکێنێت و تانەیان لێبدات، تانەی داوە لە قورئان و فەرموودەش، چونکە سەرچاوەی گەیاندنی قورئان

و فەرمـوودە بـە خەڵكـی دیكـە هـاوەڵان بـوون، جـا ئەگـەر ئـەوان خـراپ و ناراست بووبن، چۆن دەكرێت بە چاكی و دروستی هەموو سەرچاوەكانی نەقڵیان(قورئان و فەرمـوودە) بەوپـەڕی دروسـتیەوە گەیاندبێت، ئەمـەش واتـە تێكشـكاندنی قورئـان و سـوننەت.

هەروەهـا هـاوەڵان گەیەنـەری دیـن و روونكردنـەوەی وردەكاریەكانـی ئیسـلام بـون، ئـەوان چ بـە فەتحـی خـاك و ناوچـەكان و چ بـە فەتحـی دڵان ئیسـلامیان بـە سـەر زەویدا بڵاوكردەوەو گەیاندیـان بـە مرۆڤایەتی، هەر ئەوان لـە ئەلف تـا یائی ئیسـلامیان بۆ خەڵك باسكرد، چونكە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) تـا مابـوو ئەوانـی فێركـرد، ئیتـر دوای وەفاتـی، ئـەوان لەبـری پێغەمبـەر(ﷺ) دینیـان دەگەیانـد، گەیاندنـیَ بـیَ زێدەكاری و بەوپـەڕی پاراسـتنەوە.

بۆیـە دەبینیـن شـكاندنی هـاوەڵان و تانەلێدانیـان، واتـە شـكاندن و تانـەدان لـە هەمـوو پایـەو بنەڕەتەكانـی ئیسـلام(قورئان، فەرمـوودە، پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەزموونـی بـاڵای ئیسـلامی...).

ئەگـەر حەواریەكانـی پێغەمبـەر عیسـا سەرمەشـقی بـاڵا بـن بـۆ ئایینـی مەسـیحیەت، ئـەوا هاوەڵانـی پێغەمبـەر(ﷺ) سـەرچاوەو سەرمەشـقی بـاڵان بـۆ موسـڵمانان.

لەوانەیـە كەسـێك كـە هاوڕایـە بـە پارێـزراوی قورئـان، بـەڵام هـاوڕا نیـە بـە عەدالـەت و گەورەیـی هـاوەڵان، بڵێت ئاخـۆ خـوا خـۆی بەڵێنـی پاراسـتنی قورئانـی داوەو فەرموویەتی(إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون)

(بەڕاسـتی ئێمـە خۆمـان ئـەم قورئانەمـان ناردۆتـە خـواریَ و، هـەر خۆیشـمانین ئـاگادارو پارێزەریـی و، لەدوژمنـان دەیپارێزیـن و ناهێڵیـن زێـدو كەمـی تێدا بكـەن، بۆیـە ئـەوە چەندین سـەدە هـات و چـوو، لەگـەڵ ئـەو هەمـوو دژو نەیارانـەدا، كەسـێك نەیتوانیـوە تەنهـا پیتێكـی بگـۆڕیَ، یـان لێـی لاببـات).

قسـەكەی زۆر دروسـتە كـە دەڵێـت: قورئـان پارێـزراوە، بـەڵام لـەوەدا

تێکەوتووە کە هۆکاری پاراستنەکە لەبەرچاو ناگرێت، دەی هەر هاوەڵان ئەو هۆکاری پاراستنە بون، ئەگەرنا ئەم ئایەتەش هەر هاوەڵان تۆماریان کردووە، یان بەدەستی ئەوان نووسراوەتەوە، یان لەسەر زاری ئەوانەوە خراوەتە سەر پەڕاو، بۆیە ئەگەر هاوەڵان توانیبێتیان لادان لە هەر بەشێکی ئیسلامدا دروست بکەن، دەکرێت ئەو گومانەشیان لێ بکرێت ئەو ئایەتەشیان لەخۆوە دانابێت، دەی ئەزموونی ئیعجازی قورئانی پارێزراوی قورئانی سەلماندووە، ئەمەش سەلماندنی دەست و دەم و دڵ پارێزی هاوەڵانە.

بە پوختی لێدانی هاوەڵان واتە لێدانی هەموو سەرچاوە بنەڕەتیەکانی ئیسلام و هەڵوەشاندنەوەی ورد و دروشتی ئەو ئیسلامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خوای گەورەوە وەریگرتووەو گەیاندوویەتی.

دووەم: هاوەڵان دەستەی شایەتی بۆ دراون:

هاوەڵان ئەو دەستەیەن کە خوای گەورە لە چەندین شوێنی قورئاندا شایەتی بۆ داون، لێیان رازی بووە، وەسفی کردون، ئایەتی لەبارەوە دابەزاندون، بە هاودەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کردون، ئەوانەن کە بەڵێنی چاکەو بەهەشتی پێداون، پێغەمبەری خواش(ﷺ) لە فەرموودەدا دەیان جار وەسفی کردون و لێیان رازی بووەو شایەتی راستگۆیی و چاکەی بۆ داون، دەی ئەم تایبەتمەندیە زۆر ناوازەیە کە کەسانێک لە سەرچاوە بنەڕەتیەکانی ئیسلامدا شایەتییان بۆ درابێت، ناکرێت کەسانێک خوا لێیان رازی بووەو لە قورئاندا ئەوەشی تۆمارکردبێت و بەڵێنی چاکەی بۆ دابن، ئێمە بەڵێنی خراپەیان بۆ دابنێین و لێیان رازی نەبین، پێشتر چەندین ئایەت و فەرموودەمان لەبارەی پلەوپایەی هاوەڵانەوە هێناوەو دەکرێت بە خوێندنەوەی ئەم خاڵە ئەو ئایەت و فەرموودانە بێنینە بەرچاو، بۆ نموونە:

(وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ

وَرَضُوا عَنْهُ، وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً، ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ(.[1]

واتە:(لـە دەسـتەی یەکەمـی پێشـەنگی کۆچکـەران و پشـتیوانان و چـاک پەیڕەوانـی ئەوانییش خـوا ڕازیـی بـوو لێیـان و ئەوانیـش لـە خـوا ڕازیبـوون. بـەدەر لـەوەش چەنـدان بـاخ و بێسـتانی بـۆ سـازداون کـە: بـە بـەر درەخـت و کۆشـکەکانییدا روبـار گەلـێ دەچێـت بـە هەتـا هەتاییـش تێیـدا دەمێننـەوە هـەر ئەوەیشـە دەسـکەوت و سـەرفرازیی گـەورەو بـە نـرخ.).

خـوا بەڵێنـی چاکـە بـە هـاوەڵان دەدات وەک دەفەرموێـت: (لا يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلاًّ وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ).[2]

واتە:(چوونیـەک نیـن ئـەو کەسـەتان کـە پێـش (فەتـح) و (ئازادکردنـی مەککـە) مـاڵ و دارایـی خـۆی بەخـت کـردووەو، لەگـەڵ دوژمنانـی خـوادا جەنـگاوە، لەگـەڵ ئەوانـەی تـردا کـە پـاش فەتحـی مەککـە دێـن و مـاڵ و دارایـی خۆیـان بەخـت دەکـەن و دەجەنگێـن، ئـا ئەوانـە کـە لـە پێـش فەتحـی مەککـەوە ماڵیـان بەختکـردووەو جەنـگاون، پلەیـان گـەورە تـرە لەوانـە کـە لـە پـاش فەتحـی مەککـەوە ماڵیـان بەختکـردووەو جەنـگاون. وە هەریەکـێ لەوانـەش ماڵیـان بەخـت کـردووەو جەنـگاون، بـە پێـی پلـەی خۆیـان خـوای میهرەبـان بەڵێنـی بەهەشـتی داونەتـێ وە خـوای هـەق ئـاگادارە بـە کارەکانتـان..).

(لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ).[3]

واتـە:( چـوون بـۆ جیهـاد فەرمـان و کارێکـی بـڕاوەی خوایـە، بۆیـە هـەر جـۆرە دواکەوتنێـک- بـێ بیانـووی شـەرعیی- وەرناگیـرێ و ناپەسـەندەو تۆڵـەی هەیـە.. بۆیـە خـوا لـەوکارەی پەیامبەرەیـش خـۆش بـوو کـە: مۆڵـەتی دەسـتەیەک

---

[1] التوبة: ١٠٠.
[2] الحدید: ١٠.
[3] التوبة: ١١٧.

لەدوو ڕووەكانیدا كە: لە گەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبووك وە لە كۆچكەران و پشتیوانانیش- كە هەندێكیان چوونە جیهادو، هەندێكیشیان خۆیان بە زەوییدا نووساند خۆشبوو ئەوانەیان كە لە جەنگە سەختەكەی (تەبووك) دا دوای پێغەمبەر كەوتن و پەیڕەوییان لێكردو چوونە تەبووك پاش ئەوە خەریكبوو هێندێكیان دڵیان لاڕێ بێت و نەچنە جیهادەكەوە! پاشان دووبارە خوا تەوبەی لێوەرگرتن چونكە بەڕاستیی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بەلوتفە، زۆریش لەگەڵیان بە میهرە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەبارەت بە هاوەڵانی دەیفەرموو:

(يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ ، فَيَقُولُونَ: فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ ، ثُمَّ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ ، فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ: هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ: هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ).[1]

واتە:(سەردەمێ دێت بەسەرخەڵكدا دەستەیەك لە خەڵك غەزا دەكەن، دەوترێ ئایا لەنێوتاندا كەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)هەیە؟ دەڵێن بەڵێ، ئیتر فەتحیان بۆ دەكرێ، دواتر سەردەمێ دێت بەسەر خەڵكدا دەستەیەك لە خەڵك غەزا دەكەن، دەوترێ ئایا لەنێوتاندا كەس هەیە هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەری(ﷺ) كردبێت؟ دەڵێن بەڵێ، ئیتر فەتحیان بۆ دەكرێ، دواتر سەردەمێ دێت بەسەر خەڵكدا دەستەیەك لە خەڵك غەزا دەكەن، دەوترێ ئایا لەنێوتاندا كەس هەیە هاوەڵی هاوەڵانی دەوری هاوەڵانی پێغەمبەری(ﷺ) كردبێت؟ دەڵێن بەڵێ، ئیتر فەتحیان بۆ دەكرێ).

سێیەم: هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤ بون:

ئەوان نە لە مرۆڤ زیاتر بون، نە لە مرۆڤ كەمتر بون، مرۆڤبوونیش واتای كەمی و نزمی ئاستی ئەو كەسە ناگەیەنێت، بەڵكو مرۆڤبوون لە

[1] رواه البخاري و مسلم.

ئیسلامدا پلەیەکی بەرزەو جێی شانازیە، ئەوەتا لە قورئاندا هاتووە:

(قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِنْ نَحْنُ إِلاَّ بشرٌ مِثْلُكُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَمَا كَانَ لنَا أَنْ نَأْتِيكُمْ بِسُلْطَانٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ)، (جا پەیامبەرەکانیان لەوەڵامدا پێیان وتن: بەڵێ ئێمەیش وەک خۆتان وتتان بنیادەمێکین وەکو ئێوە بەڵام ئەوەندە هەیە خوای گەورە حەز بەهەر بەندەیەکی خۆی بکا، کەپلەی پەیامبەریتی پێببەخشێ، ئەوا دەیداتێ و ئەو خەڵاتەی دەکات و ئێمەش بۆمان نییەو ناتوانین هیچ نیشانەو بەڵگەیەکتان بۆ بهێنین لەوانەی داوامان لێدەکەن، بەفەرمان و مۆڵەتی خوا نەبێو دەسا باگشت بڕوادارانیش وەکو ئێمە تەنها بەخوا پشت ببەستن.).

هەروەها دەفەرموێت (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بشرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلاَ يشرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا)، (پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر(ﷺ)! منیش تەنها هەر مرۆڤێکم وەک ئێوە، وەحیم بۆ دەکرێ کە: بڵێم بەڕاستی تەنیا یەکخواو پەرستراو هەیە، تەنها خواو پەرستراوێکی یەکتایە ئینجا هەرکەسێک لەئێوە ئومێدی بەگەیشتنی دیداری پەروەردگاری خۆی هەبێ لەدوارۆژدا با کاری چاک و کردەوەی دروست ئەنجام بدات وە لەپەرستنی پەروەردگاری خۆیدا هیچ کەسێک نەکاتە هاوتاو هاوبەشیی و ڕووپامایی نەکات، چونکە خوا تەنها دڵسۆزیی و ئیخلاس وەر دەگرێ، نەریاو رووپامایی و شیرک و هاوبەش دانان.)

جا کاتی خۆیشی کۆمەڵێک کاڵفام هەبوون کە پلەی مرۆڤبوونیان لەلا کەم و بێبایەخ بوو، بۆیە وەک تانەیەک لە پێغەمبەران دەیانوت جا خۆ ئەوانەش مرۆڤن، وەک ئەوەی مرۆڤبوون بەهای ئەوەی نەبێت پێغەمبەرایەتی بۆ ببێت، مرۆڤبوون نەک شانازیەکە بۆ هاوەڵان، سەروەریەکە پێغەمبەران شانازییان پێوەکردووە، خوای گەورە نموونەی وتەی ئەو کەسانەمان بۆ دەخاتەڕوو و دەفەرموێت:

(فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا هَذَا إِلَّا بشرٌ مِثْلُكُمْ يُرِيدُ أَنْ يتَفَضَّلَ عليكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنْزَلَ مَلَائِكَةً مَا سمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ)، (جا گەورە گەورەکانی هۆزەکەی، -کە خوانەناس و بێ باوەڕبوون- وتیان: ئەم (نووح)ـەیش هەر مرۆڤێکە وەکو ئێوە، هیچ پلەو پایەیەکی لەئێوە زیاتر نیە! ئەیەوێ خۆی بەسەر ئێوەدا زاڵ بکا، جا کەوابوو وریابن! نەخەڵەتێن سەرباری ئەوەش ئەگەر خوا ویستبای پەیامبەرێک بنێرێ، فریشتەی دەنارد، نەک ئادەمیی، جا کەوایە با ئەو هەر بۆخۆی بڵێ، ئێوەش بەگوێی مەکەن ئەم قسەوباسە کە نوح دەیکا (داوای پێغەمبەرێتی و، یەکخواپەرستی) تا ئێستا ئێمە لە باووباپیرانمانەوە نەمان بیستووە، کەوایە با هەر بۆ خۆی بڵێ ).

هەروەها دەفەرموێت: (وَقَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الْآخِرَةِ وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنيَا مَا هَذَا إِلَّا بشرٌ مِثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيشْرَبُ مِمَّا تشرَبُونَ)، (بەڵام گەورە گەورەو دەمڕاسانی هۆزەکەی- ئەوانەیان باوەڕیان بە دیداری گەیشتن بە پاشە ڕۆژ نەبوو و بە درۆیان دەزانی، وە لەژیانی دونیاشدا نازو نیعمەتێکی زۆرمان پێدابوون - وتیان: ئەم پێغەمبەرە! مرۆیەکە، هەر وەک ئێوە زیاتر نیە لەوە، واتە: نە فریشتەیەو نەشتێکی ترلەو شتانەش دەخوا کە ئێوە لێیدەخۆن و لەوشتانەش ئەخواتەوە کە ئێوە لێیدەخۆنەوە، واتە: هەموو سیفەتەکانی، سیفەتی ئادەمزادن!).

دەی مرۆڤیش وەک هەر کاڵایەک ئاستی نزم و مامناوەند و باڵای هەیە، هەرچەندەش لەوپەڕی ئاستی باڵادا بیت هەر هەڵەو نەپێکان لە ئەزموونی مرۆییدا هەیە، خوای گەورە وا مرۆڤی دروست کردووە کە هەڵە دەکات، سەروخواری هەیە، لادانی هەیە، تاوان دەکات، بەڵام ڕێژەی لادان و تاوان و ئاستی مانەوە تیایدا و پلەی نەگەڕانەوەو تەوبەنەکردنە کە ئاستی مرۆڤەکە دیاری دەکات، هەیە تا ئەوپەڕی خراپە دەڕوات و ڕێگەی گەڕانەوەش دادەخات، ئیتر وای لێدێت خوا وا وەسفی دەکات:

(أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا)، (یا پێت وایە کە زۆربەیان «وتەکانت» بە دڵ دەبیسن و بیر لە ماناو مەبەستەکەی دەکەنەوەو تێدەگەنخۆ ئەوانە هەر وەک ماڵاتن (بزن، مەڕ، وشتر، گا) خاوەنی بیکردنەوە نین، بەڵکو لەوانەشە گێل و وێڵ ترو نەزانتر بن، چونکە گەلێ جار ئاژەڵ بەگوێی خاوەنەکەی دەکاو، هەرکەسێکیش چاکەی لەگەڵ بکات لەبیری ناچێت.).

هەیانە تا ئەوپەڕی چاکەکاری دەڕوات و ڕێی بەرەو خراپەچوون لەخۆی دادەخات، وای لێ دێت خوا لێی ڕازی دەبێت:

(قَالَ اللَّهُ هَذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ)، (خوای بە هەق پاش ئەوهەموو ئامۆژگارییە کردنی فەرمووی: ئیتر ئەمڕۆراستگۆیان، ڕاستگۆییان کەڵکیان پێدەگەیەنێت، واتە: تەنیا یەک خواپەرستان قازانجیانە بۆخوا پەرستانی ڕاستگۆ، لە بەهەشتدا چەند باخاتێک هەیە و بەبەریاندا چەندین ڕووبار بەخوڕ دەچێت بەهەتا هەتاییش تێیاندا ئەمێننەوە خوای میهرەبان لێیان ڕازییە، واتە: کردەوەکانی وەرگرتوون و ئەوانیش لەخوا ڕازین هەر ئەوەیش سەرکەوتن و سەرفرازی گەروەیە.).

هەروەها دەفەرموێت (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ)، (لە دەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان و چاک پەیڕەوانی ئەوانییش خوا ڕازیی بوو لێیان و ئەوانیش لە خوا ڕازییبوون. بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەر درەخت و کۆشکەکانییدا ڕوبار گەلێ دەچێت بە هەتا هەتاییش تێیدا دەمێننەوە هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازیی گەورەو بە نرخ).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت (كل بنو آدم خطاء و خير الخطائين التوابون)،[1]

[1] رواه الترمذي و ابن ماجة.

(هەموو ئادەمیزادێ هەڵـەکارە، چاکترینـی هەڵەکاریش ئەوانـەن کـە تەوبـە دەکـەن و دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا).

بـەڵام ئەمـەش دوو جۆری هەیـە، جۆرێکیـان بـە ئەنقەسـتە کـە ئەمـە تاوانـە، واتـە سزای لەسـەرە، ئیتر یـان ئـەو کەسـە تەوبـەری لەسـەر دەکات و خـوا لێی خۆش دەبێت، یان باکی نیە بە تەوبەو دەمێنێتەوە سەر رەحم و بڕیاری خوا خۆی، جۆری دووەمیان هەڵەیەکە کە بە ئەنقەست نیە، ئەمەیان بۆ خەڵکی ئاسایی ئومێدی لێخۆشبوونی خوایی هەیـە، بـەڵام بـۆ پێغەمبـەران ئیجتیهاد بـووە، واتـە تاکـە پێغەمبەرێـک نیـە نیـازی خراپـی هەبووبێـت لـە هەڵەیەکـدا کـە کردوویەتـی، بەڵکـو ئیجتیهادێکـی کـردووەو نەیپێـکاوە، هەروەهـا ئەمـە بـۆ موجتەهیدانـی نـاو ئوممەتـی ئیسـلامیش هەیـە وەک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەفەرموێت:( إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)،[1] (ئەگـەر حاکم حوکمی کرد و ئیجتیهادی کرد دواتر پێکای ئـەوە دوو پاداشـتی بۆ هەیـە، ئەگەر حوکمـی کرد و ئیجتیهادی کرد و دواتر نەیپێکا و هەڵـەی کرد ئـەوە پاداشـتێکی بۆ هەیـە).

هەڵەیەکـی کەسـانێکی بەهەڵـەدا چـوو ئەوەیـە یـان هـاوەڵان لـە سـەروو مرۆڤـەوە تەماشـا دەکـەن و ئامـادە نیـن هەڵەیەکـی هـاوەڵان قبـووڵ بکـەن، یـان ئەوەیـە لـە خـواروو مرۆڤـەوە تەماشـایان دەکـەن و دان بـە فـەزڵ و پلەوپایەیانـدا نانێن، زۆرجـار ئەوانـەی هـاوەڵان لـە سـەروو مرۆڤـەوە تەماشـا دەکـەن، کـە هەڵەیەکـی هـاوەڵان دەبینـن ئیتـر دنیایـان لـێ دێتـە یـەک و خێـرا هاوکێشـەکە سـەروخوار دەکەنـەوەو هـاوەڵان دەبەنـە خـواروو ئاسـتی مـرۆڤ، واتـە لـە هیـچ بارێکـدا مرۆڤبوونیـان پـێ رەوا نابینـن.

مـرۆڤ بـوون واتـە ژیـان وەک مرۆڤێـک بـەو تایبەتمەندیانـەی خـوا داویەتـی بـە مـرۆڤ، لەوانـەش هەڵـەو تـاوان، ئیتـر هـەر مرۆڤێـک پێویسـتە هەنـگاو بـەرەو کەمـاڵ بنێـت، خـواش رازیـە بـەو سـیفەتی مرۆڤبوونـە بـۆ هـاوەڵان

[1] رواه البخاري و مسلم.

و موسڵمانانی تریش، چاوەڕوانی ئەوەشی کردووە موسڵمانانیش لەژێر کارتێکەرە مرۆییەکاندا بن، بۆ نموونە خوا ئەگەری ئەوەی داناوە دوو دەستە لە باوەڕداران نەک تەنها موسڵمانان پێکەوە جەنگ بکەن:
(وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بينَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بينَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)، (ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران پێکەوە بە جەنگ هاتن جا هەرچی تواناتان هەیە بەکاری بێنن و ئاشتیان بکەنەوەو بانگیان بکەن بۆلای بڕیارەکانی خواجا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژیی کردە سەر دەستەکەی تر، واتە: ملی ڕانەکێشا بۆ ئاشتیی و یەککەوتن ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیاندا بجەنگێن کە دەستدرێژی دەکات، تا ناچار دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو حوکمی خوا. ئینجا ئەگەر کۆمەڵە ستەمکارەکە گەڕایەوە بۆ حوکمی خوا، جا ئێوەیش بەئینصاف ناوبژییان بکەن وە دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن چونکە بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ).

ئەوەی لەبەرچاو گرتووە موسڵمانان تاوان بکەن، بەڵام بۆ هەریەک لەو بارانەش چارەسەری داناوە.

بۆیە پەروەردەیەکی هەڵەیە ئەگەر وا موسڵمان گۆش بکەین کە پێی وابێت هاوەڵان عیصمەتیان هەبووەو دوورن لە هەڵەو نەپێکان، ڕاست ئەوەیە هاوەڵان مرۆڤگەلێک بون کە ئاستێکی باڵای مرۆڤایەتییان تۆمار کردووە.

جا ئەوەش کە لە فیتنەی نێوان هاوەڵاندا ڕوویدا حاڵەتێکی ئاسایی بووە لە حاڵەتی مرۆڤبوون، تیایدا یان هەردوولا هەڵە دەبن، یان لایەنێک هەڵە دەبێت، ئەو بارەی فیتنەی نێوان هاوەڵانیش بە جوانی ڕوون کراوەتەوە کە کێ حەق بووەو کێ هەڵەی کردووە.

هەر لەم روانگەوە کە هاوەڵان پلەی مرۆڤبوونیان پێ رەوایەو بەو بوونی ریزە هەڵەشەوە، خوای گەورە لێیان رازی بووە، دەی ئەمە بەڵگەیەکی روونە کە دەکرێت موسڵمانی ئەمرۆش بە بوونی هەندێک هەڵەشەوە هەر خوا لێی رازی بێت، بۆیە وەک چۆن هەڵەیە هاوەڵانمان تەنها بە بێ بوونی بچووکترین پەڵەش ئینجا قبووڵ بێت، هەروەهاش هەڵەیە موسڵمانی ئەمرۆمان بەبێ بوونی هیچ پەڵەیەک ئینجا قبووڵ بێت، گرنگ لەوەدا ریژەی بنەڕەتیە، ئەگەر موسڵمانێک لە بنەڕەتە سەرەکیەکاندا دەرچوو، ئیتر مەرج نیە بۆ رەزامەندی خوا و مرۆڤەکانیش بگاتە پلەی کەماڵ ئینجا دانی خێری پیا بنرێت.

پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی نەخۆشی سەرە مەرگیدا چوویە سەر مینبەر و بە هاوەڵانی فەرموو (إِنَّ النَّاسَ يَكْثُرُونَ وَيَقِلُّ الْأَنْصَارُ حَتَّى يَكُونُوا فِي النَّاسِ بِمَنْزِلَةِ الْمِلْحِ فِي الطَّعَامِ فَمَنْ وَلِيَ مِنْكُمْ شَيْئًا يَضُرُّ فِيهِ قَوْمًا وَيَنْفَعُ فِيهِ آخَرِينَ فَلْيَقْبَلْ مِنْ مُحْسِنِهِمْ وَيَتَجَاوَزْ عَنْ مُسِيئِهِمْ)،[1] (خەڵکی زیاد دەکەن و پشتیوانان کەم دەکەن تا ئەوەی لەناو خەڵکدا وەک خوێی ناو چێشتیان لێ دێت، دەی هەرکامتان شتێکی گرتەدەست کە تیایدا زیانی هەبێ بۆ خەڵکێ و سوودی هەبێ بۆ هەندێکی تر با کاری چاکەکاری پشتیوانان قبووڵ بکات و چاوپۆشیش لەوەیان بکات کە خراپەیەک دەکات).

چوارەم: هاوەڵان کەسانی سەردەمی خۆیان بون:

دەبێت ئەوە لەیاد نەکەین کە هاوەڵان لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا ژیاون، واتە چواردە سەدە پێش ئێستا، ئەوان لەمرۆدا ناژین، بۆیە هەڵەیە حوکمی ئەمرۆ بدەین بەسەر هاوەڵاندا، بۆیە دەبێت کاریگەری ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی ئەوکات لەبەرچاو بگرین، ئەمە هەڵەیەکە کە زۆر کەس بۆ هەر ساتێکی مێژوویی تووشی دەبن، ئەویش ئەوەیە حوکمی ئەمرۆ دەدەن بەسەر رۆژگاری رابردوودا، بۆ نموونە کەسانێک لەمرۆدا کە دیدی

[1] رواه أحمد و البخاري.

ناسیۆنالیستی باو و بڵاوە، حوکمی نارەزایی دەدەن بەسەر صەلاحەدینێکدا کە چەندین سەدە پێش ئێستا ژیاوەو سەردەمەکە مۆدێلی دیدی ناسیۆنالیستی نەبووە، بۆیە کاتێک ژیانی هاوەڵان دەخوێنینەوە، دەبێت هەموو لایەنەکانی باری ئەو سەردەمە لەبەرچاو بگرین، جلوبەرگیان، خۆراکیان، گوفتاریان، جووڵەیان، هەموو ئەوانە لە واقیعێکی جیا لەم واقیعەدا بون، چۆن هەڵەیە گلەییان لێ بکەین بۆچی لەبری ئۆتۆمبێل سواری وشتر بون، ئاواش هەڵەیە هەندێک واقیعی تری ژیانیان وا تەماشا بکەین.

پێنجەم: هاوەڵان لەنێو خۆیاندا ئاستیان جیاواز بووە:

وەک چۆن پێشتر وتمان پلەبەندی لە ئاستی مرۆڤەکاندا هەیە، لەنێو دەستەیەکی مرۆڤەکانیشدا ئاستی جیاواز هەیە، جا ئاستەکە بەپێی بیر و ئایدۆلۆژیاکان جیاوازن، لە دیدی ماددیگەراکانەوە ئاستی مرۆڤەکان بە پێوەری ماددە دیاری دەکرێت، لە دیدی دەمارگیرەکانەوە ئاستی مرۆڤەکان بەپێی رەنگی پێست یان باڵا یان هەر پێوەرێکی دی دیاری دەکرێت، لە ئیسلامیشدا ئاستی مرۆڤەکان بە پێی ئاستی گوێڕایەڵییان بۆ خوا(تەقوا) دیاری دەکرێت، بۆیە دەبینین لە نێو هاوەڵاندا ئەو ئاست جیاوازیە هەبووە، نەک وەک فەوتانی مافی کەسەکانی دی، نا وەک ئەوەی هەرکەسەو مافی خۆی دیاریکراو بێت.

خوای گەورە کە باسی هاوەڵانی پێش فەتحی مەککەو پاش فەتحی مەککە دەکات خاڵی جیاوازی و خاڵی هاوبەشیشیان باس دەکات و دەفەرموێت (لا يسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ مِنْ قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الَّذِينَ أَنْفَقُوا مِنْ بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ).

(چوونیەک نین ئەو کەسەتان کە پێش (فەتح) و (ئازادکردنی مەککە) ماڵ و دارایی خۆی بەخت کردووەو، لەگەڵ دوژمنانی خوادا جەنگاوە، لەگەڵ ئەوانەی تردا کە پاش فەتحی مەککە دێن و ماڵ و دارایی خۆیان

بەخت دەکەن و دەجەنگێن، چونکە پێش ئازادکردنی مەککە، زیاتر پێویستی بە بەخشینی ماڵ بوو ئا ئەوانە کە لە پێش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون، پلەیان گەورە ترە لەوانە کە لە پاش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون. وە هەریەکێ لەوانەش ماڵیان بەخت کردووەو جەنگاون، بە پێی پلەی خۆیان خوای میهرەبان بەڵێنی بەهەشتی داونەتێ وە خوای هەق ئاگادارە بە کارەکانتان).

لە فەرموودەیەکدا کە موعاذ لە ریفاعەی باوکیەوە (کە بەشداربووی بەدر بووە) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: جبریل (علیه السلام) هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی فەرموو (بەشداربوانی بەدر لەنێوتاندا چۆن سەیر ئەکەن؟)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(لە بە فەزلترینی موسڵمانانن) یان وتەیەکی هاوواتای ئەوە، جبریلیش فەرمووی: (بۆ فریشتە بەشداربووەکانی بەدریش هەر وایە).[1]

بۆیە کاتێک قسە لەسەر هاوەڵێک دەکرێت کە تەنها کاتی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) رۆژێک یان دوان بووەو ئیتر چووەتەوە بۆ ناوچەی خۆی و لەوێ ژیاوە، ئەمە پلەوپایەی زانستی و رووکەشی جیاوازە لەو هاوەڵەی کە بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووەو فەرموودەی لێوە وەرگرتووە، هەروەک تاوانی هاوەڵێکیش کە زۆر کەم لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت بە رووکەش جیاوازە لە تاوانی هاوەڵێک کە بەردەوام لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووبێت، بۆیە رەوا نیە لە هەموو مەسەلەیەکدا یەک حوکم بەسەر هەموو هاوەڵاندا بدرێت.

هاوکات هەرچەندە ئەو پلەبەندیە هەبووە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشتووە لە پشکە دنیاییەکەدا هاوەڵانێکی دی دوابکەون، بۆ نموونە هەرچەندە ئەبووبەکر و عومەر پلەی هاوەڵێتییان لای پێغەمبەر(ﷺ) لەپێشتر بوو، کەچی بۆ کۆتا سوپا پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامەی کوڕی زەیدی دانا وەک

[1] صحيح البخاري، الرقم ٣٧٩٠.

سەرکردە کە چ لە رووی هاوەڵێتی و چ لە رووی تەمەنیشەوە لە ئاست ئەبووبەکر و عومەردا نەبوو، یان دوای فەتحی مەککە پێغەمبەر(ﷺ) عەتتابی کوڕی ئەسیدی وەک والی مەککە دانا هەرچەندە تازە موسڵمان بووبوو، خۆ عوسمان ی کوڕی عەففانیش هەبوو کە هەم ئومەوی بوو و هەم لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوان بوو و هەم موژدەپێدراوی بەهەشت بوو و هەم زۆرینەی سامانی خۆی بۆ ئیسلام خەرج کردبوو و هەم دوو کچی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەهاوسەرگرتبوو و دەیان فەزڵی تریشی هەبوو.

بۆیە پێویستە بەوجۆرەی لە فەرمووده صەحیحەکاندا هاتووە پلەوپایەی هەر هاوەڵێ یان هەر تاقمە هاوەڵێ وەک خۆی لەبەرچاو بگرین تا بتوانین حوکمی دروست لەبارەیانەوە بدەین.

ئەمە بۆ ئەوە نیە کە هەڵەکەیان بشەرعێنین، نا، بەڵکو بۆ ئەوەی ئینصاف بەکاربێت لە ئاست کەسەکەدا، ئەگەرنا هەڵەیەکی گەورە لای هەندێک موسڵمانی ساویلکە ئەوەیە کە بۆ بەرگریکردن لە ماوەیەکی مێژووی ئیسلامی یان لەسەرکردنەوەی سەرکردە یان کەسایەتیەکی ناو مێژووی ئیسلامی، رەوایەتی دەدەن بە کارێ یان رووداوێکی ئەو ماوە یان سەرکردەو کەسایەتیە کە پێچەوانەی خودی شەریعەتە، گرنگ لای ئێمە پاراستنی دینەکەیە، نەک پاساو هێنانەوە بۆ هەڵەی پەیڕەوانی، ئەوانە دەستەیەک بون چون، ئەوەی بەدەستیانهێنا بۆ خۆیانەو ئەوەش ئێمە بەدەستی دێنین بۆ خۆمانە.

# چی لە هاوەڵانەوە فێر ببین؟

## لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دامەبڕێ

یاوەرێتیی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەزڵێک بوو کە خوای گەورە بە هاوەڵانی بەخشی، بەڵام دانەبڕان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ هەموو ئوممەتەکەی ماوەتەوەو هەرکەس بیەوێت، دەتوانێت لێی تێر بێت، هەرکەسیش نیەتی ئەوەی نەبێت، ئەگەر بگەڕێتەوە ئەو سەردەمەش، پێناچێت بتوانێت پشکی هاوەڵبوون بۆ خۆی بپچڕێت، خۆ هەر لەو سەردەمەدا دووڕووەکانیش لە مەدینەدا دەژیان و نوێژیشیان لە دوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەکرد، تەنانەت هەندێک جار بۆ مەیدانی جیهادیش لێی جیا نەدەبوونەوە، بەڵام دڵیان نەدابوو بە خۆشەویستیی و شوێنکەوتنی ڕاستەقینەی پێشەنگی مرۆڤایەتی.

هاوەڵان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوون و خوای گەورە هاوەڵێتی هەم جەستە و هەم فەرمایشت و پەیامەکەی سەروەری بە نسیب کردن و ئەوانیش بە تەواوی مانا قەدریان زانی، ئێمەش فەرمایشت و پەیامەکەیمان بۆ ڕەخسێنراوەو جێی خۆیەتی ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەین و پێی لێ دانەبڕین.

ئەوان هەوڵیان دەدا ڕۆژانە بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بگەن، ئەبووبەکری صدیق نەیدەتوانی ڕۆژێک بەسەر ژیانیدا تێپەڕێت و بە خزمەتی پێشەوامان نەگات، هێندە ڕاستگۆیانە لە دەوری بوو، وەڵامی ئەو هۆگرییەی لە ڕەفتاری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەرگرت، وەک عائیشەی کچی ئەبووبەکر

دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: هێشـتا مـن تـەواو عەقڵم نەگرتبوو کـە دایـک و باوکـم باوەڕیـان هێنابـوو بـە پێغەمبـەر(ﷺ)، هەرچـی ڕۆژێکیش هەبـوو، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بەیانـی و ئێـوارە سـەردانی دەکردیـن.[1]

پشـتیوانانیش بـە هەمـان شـێوە، هەتـا پێغەمبەرەکەیـان لـە مەککـە بـوو، وابەستەی پەیامەکەی بوون، کە تەشریفیشی هێنا بۆ شارەکەیان، یەکپارچە کات و دڵ و ژیانی خۆیان پەیوەست کرد بە پێشەواکەیانەوە، کێبڕکێیان بوو لەسەرئەوەی چۆن خزمەتی بکەن، چی بکەن دڵخۆشی بکەن، لە مزگەوت، بازاڕ، حەج و عومرە، جیهاد و غەزاکاندا، هاوەڵیی پێغەمبەری خوایان دەکرد و لە فەرمان و ڕێنماییەکانی دەرنەدەچوون:

یەکێکیـان خـۆی یەکلادەکردەوە بۆ بـواری وەرگێڕان هەتـا لەو ڕوانگەوە خزمەتـی پێغەمبـەر(ﷺ) بـکات، نموونـەی ئـەوەش زەیـدی کـوڕی سـابت بـوو کاتێـک پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانـی پێکـرد خـۆی فێـری زمـان و نووسـینی جوولەکـەکان بـکات هەتـا وەرگێڕانـی گوفتـار و نووسـراوەکانیان بـکات بـۆ پێغەمبەر(ﷺ)، زەیدیش هێندە خێرا چوو بە دەم فەرمایشتەکەیەوە هەتا لە مـاوەی پانـزە ڕۆژدا خـۆی فێرکـرد.[2]

هەیانبـوو خـۆی یەکلادەکـردەوە بـۆ وەرگرتنـی فەرموودەکانـی بـواری فیتنـە و ناڕەحەتییـەکان کـە دێنـە ڕێـی موسـڵمانان، حوزەیفـەی کـوڕی یەمـان سەرمەشـقی ئـەو بوارەیە، وەک خـۆی دەڵێت: (خەڵکـی سـەبارەت بـە بـواری چاکە پرسـیاریان لە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەکرد، منیش سـەبارەت بـە خراپـە و فیتنـە پرسـیارم لـێ دەکـرد).[3]

عەبدوڵای کـوڕی مەسـعوود کـە یەکێـک بـوو لـە دەسـتەی یەکەمـی موسـڵمانبوان، هێندە وابەستەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، خۆی دەڵێت: سـوێند

[1] صحيح البخاري، كتاب الصلاه، باب المسجد يكون في الطريق من غير ضرر بالناس و به، الرقم ٤٧٦.
[2] سنن أبي داود، كتاب العلم، باب رواية حديث أهل الكتاب، الرقم ٣٦٤٢.
[3] السنن الكبرى للنسائي، كتاب فضائل القرآن، الأمر بتعلم القرآن، الرقم ٧٩٧٨.

بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە جگە لەو، هەر سوورەتێک لە قورئاندا هەیە، ئەزانم کەی دابەزیوە و لەسەر چی دابەزیوە،[1] پێغەمبەری خوایش(ﷺ) شایەتی دەدا بۆ شارەزایی ئیبن مەسعوود لە قورئاندا و دەیفەرموو (اسْتَقْرِئُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ: مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَبَدَأَ بِهِ)،[2] (بۆ فێربوونی خوێندنەوەی قورئان، گوێ لە چوار کەس بگرن، عەبدوڵای کوڕی مەسعوود، واتە پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم ناوی ناو چوار کەسەکە بەو دەستی پێکرد)،

هاوەڵی وایش هەبوو ئەگەر بۆی نەگونجایە زۆر لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بێت، کاتی تایبەتی بۆ تەرخان دەکرد و سەرجەم ئیشوکارەکانی تری لەگەڵ ئەو کات و دەرفەتەدا دەگونجاند، نەوەک ئیشوکارەکانی دەست پێ بکات و هەرکات لێبوویەوە، ئینجا بچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وەک چۆن عومەری کوری خەططاب دەگێڕێتەوەو دەڵێت: من و دراوسێیەکی پشتیوانیم کە ماڵمان لە سەرووی مەدینەوە بوو، کردبوومان بە سەرە، هەر ڕۆژەو یەکێکمان دادەبەزین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ڕۆژێک ئەو و ڕۆژەکەی تریش من، ئەو ڕۆژەی من بچوومایە، هەرچی وەحییەک دابەزیایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خۆم دەمهێنایەوە بۆ دراوسێ پشتیوانییەکەم، ئەو ڕۆژەش کە ئەو دەچوو، هەر وایدەکرد.[3]

هاوەڵانێکیش کە درەنگ کەوتن لە گەیشتن بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، هەوڵیان دەدا قەرەبووی ماوەی لەدەستچوویان بکەنەوە، جوانترین نموونەش لەنێویاندا ئەبووهورەیرە بوو، چونکە ئەم هاوەڵە چوار ساڵ پێش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە و لە خزمەت پێشەواماندا مایەوە، هەوڵیدا قەرەبووی ساڵانی لەدەستچووی بکاتەوەو بە شەو و ڕۆژ خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ هاوەڵێتی خۆشەویستمان و وەرگرتنی فەرموودەکانی،

---

[1] صحيح مسلم، كتاب فضائل الصحابة، الرقم ٢٤٦٣.

[2] صحيح البخاري، كتاب فضائل الصحابة، الرقم ٣٧٥٨.

[3] صحيح البخاري، تاب العلم، باب التناوب في العلم، الرقم ٨٩.

وەک خۆی دەڵێت: من کەسێکی هەژاری ناو ئەهلی صوففە بووم کە دایم هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بووم.[1]

ئافرەتانیش هەوڵیان دەدا پێ لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانەبڕن و کاتێکی تایبەتی لێ وەربگرن بۆ خۆیان، وەک چۆن ئەبووسەعید دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیاوان فەرمایشتەکانت دەبیستن و دەرفەتیان زۆرە گوێت لێ بگرن، دەی بەشێک لە کاتەکەشت بدە بە ئێمە و ڕۆژێکمان بۆ دابنێ هەتا بێینە خزمەتت و ئەوەی پەروەردگار فێری کردویت، فێرمان بکەیت، ئەوەبوو پێغەمبەریش(ﷺ) کاتێکی بۆ تەرخان کردن.[2]

حوذەیفە دەڵێت: جارێک دایکم پێی وتم: لە کەیەوە نەچوویتەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)؟ منیش وتم: ماوەیەکە، ئەوەبوو لێم تووڕە بوو، منیش وتم: باشە ئێستا دەچم بۆ لای پێغەمبەر و نوێژی لەگەڵ دەکەم بەڵکو داوای لێخۆشبوون بۆ من و تۆیش بکات، چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لە دوایەوە نوێژی ئێوارەم کرد، ئینجا کە پێغەمبەر(ﷺ) چوو منیش شوێنی کەوتم، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتم: حوذەیفەی کوڕی یەمان، فەرمووی: بۆچی هاتویت؟ منیش بۆم باس کرد دایکم چی پێ وتووم و چی ڕوویداوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوا لە تۆ و دایکیشت خۆش بێت).[3]

هاوەڵە مێردمنداڵ و کەمتەمەنەکانیش بە هەمان شێوە، زۆر هەوڵیان دەدا بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە زۆر لە مەیدانی جیهاددا دەیگێڕانەوە و نەیدەهێشت لەبەر کەمی تەمەنیان بەشداریی بکەن، لە کاتی ئاساییشدا، لە دەوری بوون و فەرموودەیان لێوە

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥٩٥و صححه الذهبي.

[2] صحيح البخاري، كتاب الإعتصام بالكتاب والسنة، باب تعليم النبي أمته من الرجال و النساء، الرقم ٧٣١٠.

[3] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم(رضي الله عنهم) أجمعين - ذكر عمرو بن العاص السهمي(رضي الله عنه) - ذكر دعاء المصطفى(ﷺ) لحذيفة بن اليمان بالمغفرة ، الرقم ٧١٢٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

وەردەگرت، بۆیە دەبینیت زۆرترین فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن ئەو هاوەڵانەوە گێردراونەتەوە کە لە سەردەمی سەروەرماندا لە هەرەتی مێردمنداڵی و لاوێتیدا بوون.

ئێستا دەپرسیت: من چۆن لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانەبڕێم؟

کورت و پوخت بە چەند خاڵێک وەڵامەکەت وەربگرە:

- ✓ هەوڵ بدە شوێن فەرمان و ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانی بکەویت.
- ✓ گرنگییەکی زۆر بدە بە قورئان و فەرموودەکانی.
- ✓ لە دڵەوە و بە کرداریش، وابکە پێغەمبەری خوات لە هەموو کەس خۆشتر بوێت، تەنانەت لە خۆشت زیاتر.
- ✓ صەڵەواتی زۆری لەسەر بدە و ڕۆژ تێنەپەڕێت بەسەرتدا دەمت بە صەڵەواتی خۆشەویستت پاراو نەکردبێت.
- ✓ مەهێڵە هیچ مانگێک لە ژیانت تێپەڕێت بەبێ خوێندنەوەی بەشێک لە ژیانی، نەکەیت بە تەنها یەک یان دوو کتێب و زنجیرە وتار لەسەر ژیانی، دەست هەڵبگریت، ئەوە ئەو کەسەیە کە خوای گەورە ڕێنمایی کردویت (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ)، (بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا پێشەنگیی و سەرمەشقیەکی باشتان بۆ هەیە، بۆ ئەوانەتان کە بڕوای بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە و ئاواتی ڕەزامەندی ئەو و بردنەوەی قیامەتی هەیە).
- ✓ لە کردار و گوفتار و مامەڵەی ڕۆژانەتدا، هەوڵ بدە پێشەنگیی پێوە بکەیت، برۆ بە دوای مامەڵەی خۆشەویستدا لەگەڵ دەوروبەری (هاوسەر، منداڵ، خزم و کەسوکار، دراوسێ، کۆمەڵگە، دۆست، دوژمن، گەنج، پیر، ئافرەت، پیاو، دەوڵەمەند، هەژار) لە هەر بوارێکی ژیاندا (کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، زانستیی..) لە هەر جومگەیەک لە جومگەکانی ژیانتدا، بگەڕێرەوە سەر ڕێنمایی و ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ)، دڵنیابە براوە دەبیت.

✓ هەوڵ بدە بەپێی توانا چی لەبارەی پێغەمبەرەکەتەوە دەزانیت بیگەیەنە، چونکە ئەمە داخوازی پێغەمبەری خوایە (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً)،[1] (ئەوەی لە منەوە وەریدەگرن، بیگەیەنن، با تەنانەت تەنها ئایەتێکیش بێت)، دریغیی مەکە لە گەیاندنی تەنها ئایەتێک، تاکە فەرموودەیەک، یەک ڕێنمایی و زانیاریی، باسکردنی ژیانی پێغەمبەرەکەت.

## تەنها بۆ خۆت مەژی

هیچ کات ژیانی تایبەتی و بیرکردنەوەی خۆت مەکە بە گشتاندنێک بۆ دەوروبەرت، چونکە ئەو بارودۆخ و ژیانەی خۆت تیایدایت، جیاوازە لەوەی خەڵکانێکی تر تیایدا دەژین.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (إِنِّي لَأَقُومُ فِي الصَّلَاةِ ، أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا ، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي؛ كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ)، (جار هەیە کە هەڵدەستم بۆ نوێژ، مەبەستمە نوێژەکە درێژ بکەمەوە، کەچی گریانی منداڵێک دەبیستم، نوێژەکە درێژ ناکامەوە نەوەک بارگرانی دروست بکەم بۆ دایکی منداڵەکە).[2]

هاوەڵانیشی وا فێر دەکرد کە تەنها لە حاڵەتی ژیانی خۆیانەوە هەنگاو نەنێن، تەنانەت لە پەرستشەکانیشدا ئەو جیاکارییەی لەبەرچاوگرتبوو و هاوەڵانی لەسەر ڕادەهێنا، بڕوانە ئەم بەسەرهاتەی دوو هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ):

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: جارێک موعاذی کوڕی جەبەل پێشنوێژی بۆ هۆزەکەی دەکرد، حەرامیش هاتە ژوورەوەو دەیشیویست ئاوی دارخورماکانی بدات، بەڵام چووە مزگەوت تا پێشتر نوێژەکەی بکات، لە نوێژەکەدا دەبینێ موعاذ زۆر درێژە بە نوێژەکەی دەدات - لە گێڕانەوەکەی ئەبوو نوعەیمدا هاتووە کە سوورەتی بەقەرەی دەخوێند- بۆیە حەرام کەناری گرت و خۆی نوێژەکەی تەواو کرد و چوو بۆ ئاودانی دارخورماکانی،

[1] صحيح البخاري، كتاب أحاديث الأنبياء، باب ما ذكر عن بني إسرائيل، الرقم ٣٤٦١.
[2] صحيح البخاري، كتاب الأذان، الرقم ٧٠٧.

کاتێک موعاذ نوێژەکەی تەواو کرد پێی وترا خۆ حەرام هاتە ژوورەوە، کە بینی تۆ درێژەت دا بە نوێژەکەت کەناری گرت و نوێژی خۆی کرد و چوو بۆ ئاودانی باخە خورماکەی، موعاذیش وتی دەی بە دڵنیاییەوە ئەو مونافیقە، لەپێناو خورماکانیدا پەلە دەکات لە نوێژدا؟! حەرام چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موعاذیش لەوێ بوو، حەرام وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ویستم ئاوی باخە خورماکەم بدەم، بۆیە چوومە مزگەوت تا لەگەڵ خەڵکەکە نوێژ بکەم، بەڵام کە بینیم موعاذ نوێژەکە درێژ دەکاتەوە، من نوێژەکەم کرد و درێژم نەکردەوەو چووم بۆ ئاودانی باخە خورماکەم، کەچی موعاذ بانگەشەی ئەوەی کردووە من مونافیقم، پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی وەرچەرخاند بە ڕووی موعاذدا و فەرمووی (أَفَتَّانٌ أَنْتَ ؟ أَفَتَّانٌ أَنْتَ ؟ لَا تُطَوِّلْ بِهِمُ ، اقْرَأْ بِـ { سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى } { وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا } وَنَحْوِهِمَا)،[1] (ئەرێ تۆ پەکخەریت، ئەرێ تۆ پەکخەریت؟! نوێژەکەیان بۆ درێژ مەکەرەوە، ئەم ئایەتانەو هاوشێوەی بخوێنە سبح اسم ربک الأعلی، والشمس و ضحاها).

لە گێڕانەوەکەی بوخاریدا هاتووە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە موعاذی فەرموو (فَلَوْلَا صَلَّيْتَ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ ، { وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا } { وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى } فَإِنَّهُ يُصَلِّي وَرَاءَكَ الْكَبِيرُ وَالضَّعِيفُ وَذُو الْحَاجَةِ)،[2] (با کە نوێژت کرد ئەمانەت بخوێندایە، سبح اسم ربک، والشمس و ضحاها، واللیل إذا یغشی، چونکە لە دوای تۆوە کەسی بەتەمەن و لاواز و خاوەن ئیشی گرنگ هەن نوێژ دەکەن).

ئەبووهورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ ، فَإِنَّ مِنْهُمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ)،[3] (هەرکامتان بەرنوێژیی کرد بۆ خەڵک، با دوورودرێژ نوێژەکە بەجێنەگەیەنێت، چونکە ئەو خەڵکە کەسی لاواز و نەخۆش و بەتەمەنیان

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٤٣١، ، صححه شعيب الأرناؤوط و قال إسناده صحيح على شرط الشيخين.
[2] صحيح البخاري - كتاب الأذان - باب من شكا إمامه إذا طول، الرقم ٧٠٥.
[3] صحيح البخاري - كتاب الأذان - باب إذا صلى لنفسه فليطول ما شاء، الرقم ٧٠٣.

تێدایە، هەرکامیشتان بە تەنها بۆ خۆی نوێژی کرد، با چەندە ویستی نوێژەکەی درێژ بکاتەوە).

بۆت ڕەوا نیە هەرچۆنێک بۆ ژیانی تایبەتی خۆت بیرت کردەوە، هەمان شت بەسەر دەوروبەریشتدا بسەپێنیت، نەوەک ئەوەش، بەڵکو دەبێت لەبەر مافی چواردەور و نزیکەکانت، واز لە هەندێک ویست و بیرکردنەوەی خۆیشت بهێنیت، چونکە بڕیار وایە تۆ لەناو خەڵکدا بژیت، ئەو جۆرە ژیانەش ڕێنمایی تایبەتی بۆ دانراوە.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک خوەیلەی کچی حەکیم هاتەژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بینی شێوەیەکی شپرز و شێواوی هەیە، بە عائیشەی فەرموو ئەوە بۆ وایە؟ عائیشە وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ژنە مێردی نیە، چونکە مێردەکەی بە ڕۆژ ڕۆژوو دەگرێت و بە شەویش شەونوێژ دەکات، دەستی لە خۆی شتووەو خۆی وێران کردووە،[1] پێغەمبەریش(ﷺ) ناردی بە شوێن عوثمانی کوڕی مەظعووندا، ئەویش هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عوثمان پشتت کردوەتە سوننەتم؟) عوثمان وتی نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (بەڵکو بە شوێن سوننەتی تۆدا هەنگاو دەنێم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فَإِنِّي أَنَامُ وَأُصَلِّي ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ ، وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ فَاتَّقِ اللهَ يَا عُثْمَانُ فَإِنَّ لِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا ، وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا فَصُمْ وَأَفْطِرْ ، وَصَلِّ وَنَمْ)،[2] (دەی من دەخەوم و نوێژیش دەکەم، ڕۆژوو دەگرم و بەربانگیش دەکەمەوە، ژن بەهاوسەر دەگرم، دەی ئەی عوثمان لەخوا بترسە، چونکە ژن و منداڵت مافیان هەیە بەسەرتەوەو میوانت مافی هەیە بەسەرتەوەو جەستەشت مافی هەیە بەسەرتەوە، دەی ڕۆژوو بگرەو ڕۆژووش بشکێنە، نوێژ بکەو بشخەوە).

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٧٣٣، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[2] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٩٤٩، حسنه شعيب الأرناؤوط.

هاوەڵان زۆر بە جوانی لەم پەیامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێگەیشتبوون، بۆیە دوای خۆیشی، بە جوانترین شێوە بەجێیان دەگەیاند، هەوڵیان دەدا بەرژەوەندیی گشتیی موسڵمانان پێش بەرژەوەندی و بیرکردنەوەی شەخصیی خۆیان بخەن، جوانترین نموونەش بۆ ئەم بابەتە ئەمەیە:

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا عەبدوڵای کوڕی حوذافە بەشداری هێرشێک بوو بۆ سەر ڕۆمەکان، بەڵام لە جەنگەکەدا بەدیل گیرا، ئینجا برا بۆ لای پاشاکەیان، وتیان ئەمە لە هاوەڵانی موحەممەدە، ئەویش وتی دەبیت بە مەسیحی و نیوەی سامانی خۆم بدەم بە تۆ؟ عەبدوڵا وتی ئەگەر چیت هەیە و چی موڵکی هەموو پاشایانی عەرەبە بیدەیت بە من، هێندەی چاوتروکانێ وازناهێنم لە ئایینەکەی موحەممەد، پاشاکە وتی دەی دەتکوژم، ئەویش وتی چی دەکەیت بیکە، ئەوەبوو فەرمانی کرد و لەخاچ درا، پاشان بە تیرهاوێژەکانی وت تیرەکە بدەن لە نزیکی جەستەی و مەیکوژن، زوو زوو پێی دەوت دەبیت بە مەسیحی؟ ئەویش ڕازی نەدەبوو، ئینجا لەسەر خاچەکە دایانگرت و مەنجەڵێکی گەورە ئاوی کوڵاویان هێنا، دوو دیلی موسڵمانانی بانگ کرد و هێنران، فەرمانی کردو یەکێکیان خرایە ناو مەنجەڵەکەوە، ئینجا بە عەبدوڵای وت: دەبیت بە مەسیحی؟ ئەویش وتی: نابم، هاوکات دەگریا، بە پاشا وترا ئەو گریا، بۆیە وایزانی ترساوە، وتی بۆچی دەگریت، عەبدوڵا وتی من یەک گیانم هەیە دەرچێ، خۆزگە هێندەی تاڵەکانی سەرم گیانم هەبوایەو هەموویان لەپێناو خوادا دەخرانە ناو ئاگر، پاشا وتی ئامادەیت سەرم ماچ بکەیت و ئازادت بکەم؟ عەبدوڵا وتی ئەگەر هەموو دیلەکان ئازاد بکەیت بەڵێ، پاشا وتی بەڵێ، ئەویش سەری ماچ کرد و دیلەکانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ لای عومەر و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد، خەلیفەش وتی ئەرکی سەرشانی هەر موسڵمانێکە سەری عەبدوڵا ماچ بکات و وا منیش خۆم دەست پێدەکەم، ئەوەبوو سەری عەبدوڵای ماچ کرد.[1]

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٤.

هەر لەو ماوەی سزادانەیشدا جارێک برایە ژوورێک و مەی و گۆشتی بەرازی بۆ دانرا، سێ ڕۆژ بەس ئەوەی بۆ دانرا، ئەویش هیچی لێ نەخوارد، پاشا پێی وت بۆچی دەستت بۆ هیچیکامیان نەبردووە؟ ئەویش وتی لەبەر ناچاری بۆم حەڵاڵ بوو بیخۆم، بەڵام حەزم نەکرد تۆ دڵخۆش بکەم، ئینجا داوای کرد سەری ماچ بکات و لە بەرامبەردا دیلەکانی بۆ ئازاد بکات، ئەویش سەری ماچکرد، ئەوەبوو پاشاکە سێ سەد دیلی لەگەڵ ئازاد کرد و سی هەزار دینارو چەندین خەڵاتی تریشی پێدا.[1]

## ڕێی زانست بەرمەدە

سیفەتێکی جوانی هاوەڵان ئەوەبوو کە دوای ئەو سەردەمی نەفامییەی تێیانپەڕاندبوو، زۆر بە تاسەوە بەدوای زانستی ڕاستەقینەدا وێڵ بوون، هەوڵیان بۆ دەدا، ڕێزی زانایان دەگرت و ئەو بەشە زانستەش کە لەلایان بوو دەیانبەخشی، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری کردبوون چاکترینیان ئەوانەن فێری قورئان دەبن و کەسانی دیکەش فێر دەکەن، سەروەرمان دەیفەرموو (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)،[2] هێندە بە گەرمیی هانی دەدان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو زانستەی کە لایانە، ڕایدەسپاردن ئەگەر کەمێکیشیان لابێت، یان بیانەوێت کەمێکیش ببەخشن، دەست نەگرنەوە، بۆیە پێی دەفەرموون (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً)،[3] (ئەوەی لە منەوە وەرتانگرتووە بیگەیەنن با تەنانەت ئایەتێکیش بێت).

هاوەڵان بەجوانی لە گرنگیی زانست و مەیدانی زانستخوازیی تێگەیشتبوون، بۆیە کە گوێ لە هەرکامیان دەگریت، پەیامێکی هاندەرانەی هەیە لەسەر زانست و زانستخوازیی، بۆ نموونە:

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٥.

[2] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب خيركم من تعلم القرآن وعلمه، الرقم ٥٠٢٧.

[3] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب ما ذكر عن بني إسرائيل، الرقم ٣٤٦١.

سەلمانی فارسیی دەڵێت: (هەتا دوو کەس مابن، یەکێکیان ئەوی تریان فێری زانست بکات، ئەوە خەڵکی چاکەیان تێدا ماوە).[1]

ئەبوودەرداء دەیوت: ساتێک سەرقاڵبوون بە زانست و کۆڕی زانستخوازییەوە زۆر باشترە لە شەوێکی سەراپا شەونوێژ).[2]

ئیبن عەبباس ئەو هاوەڵە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای زانایی و شارەزایی بۆ کرد، بە حیبری ئوممەت ناسراوە، یەکێکە لەو هاوەڵانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) تەمەنی کەم بوو، بۆیە کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد، بیری کردەوە لە ڕووی زانستیەوە هەنگاوێکی گرنگ بنێت، ئەویش کۆکردنەوەی ئەو زانستەیە کە لای هاوەڵانی دی هەیە، خۆی بەسەرهاتی ئەم ویستەی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد، بە یەکێک لە کەسە پشتیوانیەکانم وت: هۆ فڵانەکەس، وەرە با بچین و دەست بکەین بە پرسیارکردن لە هاوەڵان، چونکە ئەوان ئەمڕۆ ژمارەیان زۆرە و لە ژیاندا ماون، ئەویش پێی وتم: چەند جێی سەرسوڕمانە ئەی ئیبن عەبباس، یانی پێت وایە هەتا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) مابن ئەو خەڵکە ئیشیان ئەکەوێتە لای تۆ؟ بۆیە نەهات بەدەم داواکەمەوە، منیش وازم نەهێنا و چوم بەدەم خولیاکەمەوە، جاری وا هەبوو دەمبیست هاوەڵێک فەرموودەیەکی لایە، دەچوومە بەردەمماڵەکەی دەمبینی کاتی پشوویەتی، لەبەردەم ماڵەکەیدا پاڵم دەدایەوەو دەوەستام هەتا دەیزانی لەوێم، هاوەڵەکە پێی دەوتم: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا بۆچی هاتویت؟ با بتناردایە بە شوێنمدا من دەهاتم بۆ لات، منیش دەموت: نەخێر، لەسەر منە بێمە خزمەتت، ئینجا داوای ئەو فەرموودەم لێدەکرد و لێم وەردەگرت، ڕۆژان تێپەڕی و هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەمبوونەوە و خەڵکی ئیشیان کەوتە من،

[1] مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب في ذهاب العلم، الرقم ٢٤٨.

[2] الخطيب البغدادي: الفقيه و المتفقه الطبعة الثانية، دار ابن الجوزي، (السعودية-١٤٢١هـ)، ج١، ص ١٠٢.

کابرا پێی وتم: ئەی ئیبن عەبباس، تۆ لە من ژیرتر بوویت.[1]

جارێک عائیشەی دایکی باوەڕداران عوروەی کوڕی زوبەیری لەلابوو کە خوشکەزای بوو، بیستبووی عەبدوڵای کوڕی عەمر بەوێدا تێدەپەڕێت و بە نیازی حەج ڕووەو مەککە دەچێت، عائیشە بە عوروەی وت: خوشکەزاکەم، بیستوومە عەبدوڵا بە نیازی حەجەو بەلاماندا تێدەپەڕێت، خۆتی پێ بگەیەنە و زانستی لێ وەربگرە، چونکە ئەو زانستێکی زۆری لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەرگرت.[2]

جارێک جابیری کوڕی عەبدوڵا بیستبووی کەسێک فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، کەسەکەش ڕێی دوور بوو و لە وڵاتی شام بوو، جابیر خێرا چوو و وشترێکی کڕیی و کوڵی مانگە ڕێیەکی پێچایەوەو خۆی گەیاندە ماڵی کەسەکە، تەماشای کرد ئەو کەسە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە بە ناوی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، جابیر دەڵێت: بە دەرگاوانەکەیم وت: پێی بڵێ جابیر لەبەردەرگایە، ئەویش وتی: جابیری کوڕی عەبدوڵا؟ منیش وتم: بەڵێ، خێرا هەڵەوداوان هات بەرەوڕووم و دەستمان کردە ملی یەک، پێم وت: بیستوومە سەبارەت بە تۆڵەکردنەوە فەرموودەیەکت لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستووە، ترسام تۆ بمریت، یان من بمرم و ئەو فەرموودەت لێ نەبیستم، بۆیە خۆم گەیاندە لات، ئەویش فەرموودەکەی بۆ گێڕایەوە.[3]

ئەمە تەنها حاڵەتی ناو هاوەڵان نەبوو کە بەو چەشنە هەڵەوداوان بەدوای زانستدا بگەڕێن، بەڵکو چەندەها نموونەی دیکە هەن، لەوانەش: عەبدوڵای کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە کە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستی فوزالەی کوڕی عوبەید لە میصرە و فەرموودەی پێغەمبەری خوای

---

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب العلم - الأصل في طلب الحدیث وتوقیر المحدث، الرقم ٣٦٣ وصححه الحاکم و وافقه الذهبي و قال علی شرط البخاري.

[2] صحیح مسلم - کتاب العلم - باب رفع العلم وقبضه وظهور الجهل والفتن في آخر الزمان، الرقم ٢٦٧٣.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند المکیین(ﷺ) - حدیث عبد الله بن أنیس، الرقم ١٦٢٨٨.

لایە، لە مەدینەوە کەوتەڕێ و خۆی گەیاندە لای، فوزاڵە ویستی خزمەتی بکات، هاوەڵەکە پێی وت: نەهاتوم بۆ سەردانیکردنت، بەڵکو بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتوم بۆ لات هیوام وایە شتێکی لەبارەوە بزانیت.[1]

هاوەڵان کە دەستپەروەردەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون، بەو چەشنەی لەنێو خۆیشیاندا زانستیان دەستاودەست دەکرد و مامۆستا و خوێندکاری یەکدیی بوون، هاودەم هەموو ئەوەی پێیان بوو گەیاندیان بە نەوەکانی دوای خۆیان، دەرگایەکیان بۆ نەوەی دوای خۆیان واڵا کرد کە هیچ جۆرە پیسکەیی، یاخود بەرتەسکییەکی پێوە دیار نەبوو.

سەعیدی کوڕی موسەیب کە یەکێکە لە تابعین، دەڵێت: جارێک بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصم وت -کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)-: جاری وا هەیە دەمەوێت سەبارەت بە فەرموودەیەک پرسیارت لێ بکەم، کەچی شەرمت لێ ئەکەم، ئەویش پێی وتم: برازاگیان وا نەکەیت، ئەگەر زانیت زانستێکم لایە، لێم داوا بکە و لەبارەیەوە پرسیارم لێ بکە.[2]

ئەم ڕێڕەوە ڕاست و دروستە بە درێژایی مێژووی ئیسلامیی بەردەوام بووەو دەیان هەزار زانا بەرهەمی درێژەدانی ئەم پەیامە زانستخوازیی و زانستبەخشییە بون، ئایا تۆش دەتەوێت لەو کاروانەدا شوێن پێیەک بۆ خۆت هەڵبژێریت؟

## دەستی بەخشندەیی، نەوەك بارگرانیی

نەکەیت چاوت لە دەست و گیرفانی خەڵک بێت، چونکە هەم دەبیتە بارێک بەسەر خەڵک و کۆمەڵگەوە، هەم خۆشەویستیت لای خەڵک کەم دەکات، بەڵکو هەمیشە دەستێکی بەخشندەییت هەبێت، ئەمەش کاتێک

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - مسند فضالة بن عبيد الأنصاري، الرقم ٢٤٦٠٢.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند العشرة المبشرين بالجنة وغيرهم - مسند أبي إسحاق سعد بن أبي وقاص، الرقم ١٥٠٨.

دەکرێت، ئیشێکت هەبێت هەتا دەستکەوت و سەرمایەیەکی پێ جەموجۆر بکەیت.

پیشەی پێغەمبەران ئەوە بووە کە لەپاڵ بانگەوازەکەیاندا، ئیشیان کردووەو بژێوی ژیانی خۆیان و خاوخێزانیان دەرهێناوە، وەک لە فەرموودەدا هاتووە کە سەرجەمی پێغەمبەران شوانێتییان کردووە، (مَا بَعَثَ اللهُ نبِيًّا إلاَّ رَعَى الْغَنَمَ . فَقَالَ أَصْحَابُهُ : وَأَنْتَ ، فَقَالَ : نَعَمْ ، كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لِأَهْلِ مَكَّةَ)[1] (خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردووە، -ئەو پێغەمبەرە- شوانێتی مەڕو ماڵاتی کردووە) هاوەڵان وتیان تۆیش؟ فەرمووی (بەڵێ، من لە بەرامبەر چەند قیراتێ مەڕو ماڵاتم دەلەوەڕاند بۆ خەڵکی مەککە).

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەک پیاهەڵدانێک بۆ ئاکارێکی بەرزی پێغەمبەر داوود، دەیفەرموو (مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ ، خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ)،[2] (هیچکەس خواردنێک ناخوات چاکتر بێت لەو خواردنەی لە بەری ڕەنجی دەستی خۆی پەیدای کردبێت، پێغەمبەر داوودیش سەلامی خوای لەسەر بێت، لە بەری ڕەنجی دەستی خۆی دەخوارد).

پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی فێر دەکرد، شەرم نەکەن لە هەر ئیشێکی ڕەوا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بەری ڕەنجی خۆیان بخۆن و داوا لە خەڵک نەکەن، بۆیە ڕێنمایی دەکردن و دەیفەرموو (لَأَنْ يَحْتَطِبَ أَحَدُكُمْ حُزْمَةً عَلَى ظَهْرِهِ ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ أَحَدًا ، فَيُعْطِيَهُ أَوْ يَمْنَعَهُ)،[3] (ئەگەر یەکێکتان بنەوێت لە گوریسێک و کۆڵێک دار بدات بە کۆڵیا، زۆر بۆی باشترە لەوەی داوا لە هیچ کەسێک بکات، ئیتر ئەو کەسە یان شتێکی پێ دەدات، یان دەست بە ڕوویەوە دەنێت).

هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) بە جوانی ئەم ڕێنماییەیان وەرگرتبوو و

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الإجارة – باب رعي الغنم على قراريط، الرقم ٢٢٦٢.
[2] صحيح البخاري، كتاب البيوع، باب كسب الرجل و عمله بيده، الرقم ٢٠٧٢.
[3] صحيح البخاري، كتاب البيوع، باب كسب الرجل و عمله بيده، الرقم ٢٠٧٤.

هەرکامیان سەرقاڵ بوو بە پیشەیەکەوە، چواردەوری پێغەمبەر(ﷺ) چەندین کەسی بازرگان و دەوڵەمەندی لێ بوو کە هەرکامیان بووبوویە پاڵپشتێکی بەهێز بۆ بانگەوازەکە، لەوانەش (ئەبووبەکری صدیق، عوسمانی کوڕی عەففان، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف).

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، هاوەڵە پشتیوانیەکان ماڵ و داهاتی خۆیان برابەش دەکرد لەگەڵ هاوەڵە کۆچەرییەکاندا، هاوەڵە پشتیوانیەکان بژاردەیەکیان خستە بەردەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتیان: دارخورماکانمان لەنێوان ئێمە و برا کۆچەرییەکانماندا دابەش بکە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕازی نەبوو، چونکە هاوەڵانی خۆی لەسەر تەمبەڵی و مشەخۆریی فێر نەکردبوو، پشتیوانان لەمە تێگەیشتن و ئەمجار هەوڵیان دا هەلی کاریان بۆ بدۆزنەوە، بۆیە پێشنیاری دووەمیان کرد و وتیان: دەی لە ئیشوکاردا هاوکاریمان بکەن، ئێمەش لە بەرهەمدا بەشدارتان ئەکەین، ئینجا هاوەڵە کۆچەرییەکان بەم بژاردەیان ڕازیی بوون.[١]

لەو کاتی برایەتیەدا، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە برای سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری، سەعد کەسێکی دەوڵەمەند بوو، بە عەبدوڕەحمانی وت: ماڵ و سامانەکەم لەگەڵ جەنابتا دەکەم بە دوو بەشەوەو نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆ من، ژنت بۆ دێنم، عەبدوڕەحمان هەڵوێستی برا پشتیوانییەکەی بەرز نرخاند و فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و خێزان و سامانتەوە، ڕێی بازاڕم نیشان بدەن، کە ڕێی نیشان درا، دەستی کرد بە ئیش و بە دەستبەتاڵیی دانەنیشت،[٢] عەبدوڕەحمان هێندە دەوڵەمەند بوو هەتا بوو بە سەرمایەدارێکی گەورەی مەدینە، ئینجا بوو بە دەستبارێک بۆ خەڵکی

[١] صحيح البخاري، كتاب الحرث والمزارعة، باب إذا قال اكفني مؤونة النخل وغيره وتشركني في الثمر، الرقم ٢٣٢٥.

[٢] صحيح البخاري، كتاب البيوع ، باب ما جاء في قول الله تعالى فإذا قضيت الصلاة فانتشروا في الأرض، الرقم ٢٠٤٩.

ئەو شارە و یارمەتی دەدان و باری سەرشانی سووک دەکردن، وەک تەلحەی کوڕی دەڵێت: خەڵکی مەدینە سێ بەش بوون: بەشێکیان قەرزیان لە عەبدوڕەحمان وەردەگرت، بەشێکیان لەلایەن عەبدوڕەحمانەوە قەرزیان بۆ دەدرایەوە، خۆیشی یارمەتیی بەشێکیانی دەدا.[1]

ئەبووبەکری صدیق کە هاوەڵی دەستەڕاست و یەکەم موسڵمانبووی ناو پیاوان بوو، هێندە ڕاهاتبوو بە ئیشکردن، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و ئەویان وەک خەلیفە دەستنیشان کرد، دەستی لە ئیشکردن هەڵنەگرت، ڕۆژێک لە بازاڕ خەریکی مامەڵە بوو کە عومەری کوڕی خەططاب هات بەسەردا، دەستی گرت و وتی وەرە ئێرە .. هێندە مووچەت بۆ دەبڕینەوە کە بەشی ژیانت بکات، ئەبووبەکر ڕازیی نەبوو، وتی دەبێت هەموو موسڵمانان بەوە ڕازی بن ئینجا وازدێنم و خۆم یەکلادەکەمەوە بۆ خەلیفایەتی، ئەوەبوو خەڵکی کۆکرانەوەو ئەبووبەکر بە جوانی بابەتەکەی بۆ ڕوونکردنەوەو هەموویان وایان پێ باشتر بوو ئەبووبەکر واز لە ئیشی بازاڕ بهێنێت و سەرقاڵی ئیشوکاری موسڵمانان بێت و مووچەکەی لەسەر ئەوە بێت، ئینجا ڕازیی بوو.[2]

هاوەڵە ئافرەتەکانیش وێڕای سەرقاڵییان بە ئەرک و بەرپرسیارێتیی خێزانییەوە، لە کاروباری دەرەوەش هاوکاری هاوسەرەکانیان دەبوون، یاخود سەرمایەیەکیان بۆ خۆیان پێکەوە دەنا، جوانترین نموونەش دوو هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوون، خەدیجەی هاوسەری یەکەمی کە ئافرەتێکی سەرمایەدار و بازرگان بوو، زەینەبی هاوسەریشی لە ماڵەوە ئیشی دەستی دەکرد و دواتر لە بازاڕ دەیفرۆشتەوە و داهاتەکەشی لە ڕێی خوادا دەبەخشی.[3]

---

[1] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ط الرسالة، ج١، ص ٨٨.

[2] محب الدين الطبري: الرياض النضرة في مناقب العشرة، ج١، ص ٢٥٥.

[3] صحيح مسلم ، كتاب فضائل الصحابة ، باب من فضائل زينب، الرقم ٢٤٥٢.

خێزانەکەی عەبدوڵای کوڕی مەسعوودیش کە ناوی ڕەیتە بوو، بە هەمانشێوەی زەینەب ئیشی دەستیی دەکرد و دواتر داهاتەکەی بۆ خەرجی و پێویستیەکانی ماڵ و منداڵی بەکاردەهێنا، ئەوەبوو جارێک چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئافرەتێکم ئیش ئەکەم و لەو بەرهەمە دەستیەم دەفرۆشم، خۆم و مێرد و منداڵم تەنها ئەو دەستمایەمان هەیە، بەهۆی خەرجیی و پێویستیەکانی مێرد و منداڵەمەوە ناتوانم خێر و بەخشینێکم هەبێت، ئایا هیچ خێرێکم بۆ ئەنووسرێت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو (انْفِقِي عَلَيْهِمْ، فَانَّ لَكِ فِي ذَلِكَ اجْرَ مَا انْفَقْتِ عَلَيْهِمْ)،[1] (خەرجییان بکێشە، چونکە پاداشتی ئەو خەرجیی کێشانەی ئەوانت دەست دەکەوێت).

کەواتە، شەرم مەکە لە هیچ ئیشێکی ڕەوا، دڵنیابە ڕۆزیی لای خوایە و خوای گەورەش بەندەکانی لەبیر ناکات، بنەوە لە ئیشێک و ڕێکارەکانی بەرەکەت بگرەبەر، دڵنیابە خوا ڕۆزیت دەدات، بیرت نەچێت، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کە کۆچی کرد بۆ مەدینە، هێندە نەدار بوو کە هاوەڵان ویستیان دەستگرۆیی بکەن، بەڵام زۆری نەخایاند، کەم کەس هەبوو لە مەدینەدا لەلایەن عەبدوڕەحمانەوە هاوکاریی نەکرێت.

با هەوڵی ئیشکردنت تەنها بۆ خۆت و خاوخێزانت نەبێت، عوسمان ئاسا بیر بکەرەوە، چەندە سەرمایەت زیاتر بێت، چاکتر دەتوانیت خزمەت بە ئیسلام و موسڵمانان و مرۆڤایەتیی بکەیت، کڕینی بیری ڕوومە و پڕچەککردنی سوپای موسڵمانان لە گەرمەی دەستکورتییاندا لە غەزای تەبووک، بە دەستی بەتاڵ نەدەکرا، تۆیش هەوڵ بدە سەرمایەگوزاریی بکە و خزمەتی خۆت پێشکەش بە بانگەواز و موسڵمانان و مرۆڤایەتیی بکە، ئەگەر نەتتوانی، خزمەتی خۆت و خاوخێزانت بکە، با هیچ نەبێت نەبیتە بارێک بەسەر دەوروبەرتەوە.

[1] مسند أحمد بن حنبل، مسند المكيين(ﷺ)، حديث رائطة، الرقم ١٦٣٣٤.

هەڵەیەکی باوی ناو کۆمەڵگە ئەوەیە کە زۆرجار ئیشکردن تەنها بە ماندووبوونی جەستە دەزانن، ڕاستەکەی ئەوەیە کە هەر جووڵەیەک دەستکەوتێکی ڕەوای هەبێت بۆ خۆت و دەوروبەرت بە ئیشکردن هەژمار دەکرێت، زۆرجار بازرگانێک لەمڕۆدا هەموو ئیشەکەی بە پەیوەندی تەلەفۆنیی، یان لەڕێی ئۆنلاینەوە جێبەجێ دەکات، یان کەسێک ئیشەکەی بریتیە لە سەرپەرشتیکردن، وانەوتنەوە، گرنگ ئەوەیە لە قۆناغی یەکەمدا نەبیت بە بار بەسەر کۆمەڵگەوە، پاشان بتوانیت دەستگرۆیی دەوروبەر و نزیکانت بکەیت، دواجار بتوانیت دەستباری کۆمەڵگەیەک یان چەند کۆمەڵگەیەک بیت، ئەمە ئەو بنەما چەسپاوەی ناو فەرمایشتی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە دەفەرموێت (اليَدُ الْعُلْيَا خَيرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى ، فَاليَدُ الْعُلْيَا هِيَ الْمُنْفِقَةُ ، وَالسُّفْلَى هِيَ السَّائِلَة)،[1] (دەستی بەرز و باڵا زۆر باشترە لە دەستی نزم، جا دەستی بەرز ئەو دەستەیە کە دەبەخشێت، دەستی نزمیش ئەو دەستەیە کە داوا دەکات).

## نهێنی پارێز بە

هەر کەسێک خاوەنی بڕێک نهێنی و تایبەتمەندییە، بڕیاری داوە ئەو شتانە خەڵکی دی نەیانزانێت و لە سنوورێکی دیاریکراودا بیانپارێزێت، کاتێک لێت ڕادەبینێت و لەو نهێنیی و تایبەتمەندییانەی ئاگادارت دەکاتەوە، ئەوەی لێ چاوەڕوان کردویت وەک خۆی بیانپارێزیت، ئەمەش ئەمانەتە، ئەمانەتیش دەبێت بپارێزرێت.

لەوانەیە زۆرێکمان وا تێگەیشتبین ئەمانەت تەنها شتە فیزیکی و ماددییەکانن، وەک پارە و کتێب و شتومەک و .. هتد، بەڵام بڕوانە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن هاوەڵانی تێدەگەیاند، دەیفەرموو (إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ الْحَدِيثَ ثُمَّ

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الزكاة، باب لا صدقة إلا عن ظهر غنى، الرقم ١٤٢٩.

الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ)،[1] (ئەگەر کەسێک قسەیەکی کرد بۆ کەسێک -یان خەڵکێک- و دواتر لایەکی کردەوە بە لایەکدا، واتە سەیرێکی ئەملاولای کرد، ئیتر ئەو قسەیە ئەمانەتە).

هەروەها دەیفەرموو (إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الْأَمَانَةِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الرَّجُلَ يُفْضِي إِلَى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيْهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا)،[2] (لە گەورەترین سپاردەکان لای خوا لە ڕۆژی دواییدا، ئەوەیە کە پیاوێک بچێتە لای ژنەکەی و ژنێک بچێتە لای پیاوەکەی، دواتر نهێنی یەکدی ئاشکرا بکەن و باسی بکەن).

زۆرجار نهێنییەک کە بە لای ئێمەوە هیچ گرنگیی و تایبەتمەندییەکی نیە، ڕێڕەوی ژیانی کەسێک، خێزانێک، گرووپێک، تەنانەت کۆمەڵگەیەک دەگۆڕێت.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: جارێک خەریک بووم لەگەڵ منداڵان یاریم دەکرد کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرکەوت، کە هات، سەلامی لێکردین، ئینجا ناردمی بۆ ئیشێک، منیش دواکەوتم و درەنگ گەڕامەوە بۆ لای دایکم، کە گەیشتمەوە لای، دایکم وتی: بۆچی دواکەوتیت؟ منیش وتم: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردمی بۆ ئیشێک، دایکم وتی: ئیشەکەی چی بوو؟ وتم: ئەوە نهێنییە، دایکم کە ئەوەی بیست، پێی وتم: ئەو نهێنیەی پێغەمبەر(ﷺ) بە هیچ کەس نەڵێیت.[3]

ئەبووبەکری صدیقیش نموونەیەکی باڵای پاراستنی نهێنییەکان بوو، وەک چۆن لە مەسەلەی هاوسەرگیریی حەفصەدا ئەو وردەکارییەی بەدی دەکەین، وردەکارییەک کە لەوانەیە زۆرێک لە ئێمە بە بای خەیاڵماندا نەیەت و هیچ گرنگییەکی پێ نەدەین.

کاتێک حەفصەی کچی عومەر بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا

[1] جامع الترمذي - أبواب البر والصلة عن رسول الله، باب ما جاء أن المجالس أمانة، الرقم ١٩٥٩ و حسنه.

[2] صحيح مسلم، كتاب النكاح، باب تحريم إفشاء سر المرأة، الرقم ١٤٣٧.

[3] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أنس بن مالك، الرقم ٢٥٤٨٢.

مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عوسمان، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوەیە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێک لە بێتاقەتی ڕوی تێکرد، ئەوەبوو پاش پێغەمبەر(ﷺ) داوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی، وتی: دڵت شتێک نەکات بەرامبەرم، من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە -ئەمەشم پێ نەوتیت- وتم با نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر(ﷺ) حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.[1]

عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) باسی سەرەمەرگی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات کە چۆن لەو ساتەوەختەشدا نهێنییەکان لەبیر نەکراون، دەڵێت: فاطیمە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بەڕێدا دەتوت هەمان ڕێکردنی پێغەمبەرە(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی مەرحەبا لە کچەکەم، ئینجا لای خۆیەوە داینیشاند، دواتر چپەیەکی بۆ کرد و فاطیمە گریا، وتم بۆچی دەگریت؟ دواتر پێغەمبەر(ﷺ) چپەیەکی تری بۆ کرد و فاطیمە دەستی کرد بە پێکەنین، منیش وتم تا ئێستا نەمدیوە خەم و خۆشی ئاوا لەیەک نزیک بن، وتم چۆن بوو واگریایت و دواتر پێکەنیت؟ فاطیمەش وتی نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا ناکەم.[2]

مەرج نیە هەموو کاتێک ئەو نهێنییانەی لەلاتن، ئەوانە بن کە کەسەکان خۆیان لایان باس کردویت، جاری وا هەیە بە ئەنقەست، یان بێ مەبەست، نهێنیی کەسێکت دێتەبەردەست، لەوەدا لەخواترس بە و ئاشکرای مەکە، دڵنیابە ئەگەر وابکەیت، خوای گەورە نهێنییەکانت دەپارێزێت، وەک چۆن

[1] مسند أبي يعلى الموصلي - مسند أبي بكر الصديق، الرقم ٦.
[2] صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٦.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (لَا يسْتُرُ عَبْدٌ عَبْدًا فِي الدُّنيَا إِلَّا سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).[1] (هەرکەسێک لە دنیادا نهێنیی بەندەیەک پەردەپۆش بکات، خوای گەورەش لە ڕۆژی دواییدا نهێنییەکانی پەردەپۆش دەکات)

حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێت، دەیوت: بەشێک لە ناپاکی ئەوەیە نهێنیی براکەت ئاشکرا بکەیت.

تەنانەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) نهێنیی دووڕووەکانیشی ئاشکرا نەدەکرد، بۆیە هەتا وەفاتی کرد، لەناو هاوەڵاندا ناوی کەسە دووڕووەکانی ئاشکرا نەکرد لەکاتێکدا هەموویانی دەناسین، تەنها لەلای حوزەیفەی کوڕی یەمان ناوەکانی ئاشکرا کردن، حوزەیفەش هێندە نهێنیی پارێز بوو کە ناوی هیچکام لەوانی نەدەدرکاند مەگەر لە کاتی پێویستدا، بۆیە زۆر بە کەمی ناوی کەسە دووڕووەکانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دەزانرێن، حوزەیفە خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێک عومەری کوڕی خەططاب – کە ئەوکات خەلیفە بوو- بانگ کرا هەتا نوێژ بکات لەسەر مردوویەک، منیش خۆم گەیاندە لای و پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران دابنیشە، ئەم کابرایە یەکێکە لە دووڕووەکان، عومەریش وتی: سوێندت ئەدەم بە خوا، من لەوان نیم؟ منیش وتم: نا، بەڵام دوای تۆ هەرکەسی تر ئەو پرسیارەم لێ بکات وەڵامی نادەمەوە.[2]

حاڵەتێکی خراپتر ئەوەیە کەسانێک نهێنیی خەڵکیان لا نیە، بەڵکو بەدوای نهێنیی خەڵکدا دەگەڕێن، ئەمانە هەڕەشەیان لەسەرە ئەگەر دەستبەرداریی کردەوەی وا نەبن، خوای گەورە لە جەرگەی ماڵی خۆیاندا ئابڕوویان ببات، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (لَا تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ ، وَلَا تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ ، فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَاتِ الْمُسْلِمِينَ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ فِي بَيْتِهِ).[3] (غەیبەتی موسڵمانان مەکەن و

[1] صحيح مسلم - كتاب البر والصلة والآداب - باب بشارة من ستر الله تعالى عيبه في الدنيا بأن يستر عليه في الآخرة، الرقم ٢٥٩٠.

[2] البحر الزخار المعروف بمسند البزار - مسند حذيفة بن اليمان، الرقم ٢٨٨٥.

[3] مسند أبي يعلى الموصلي - حديث أبي برزة الأسلمي، الرقم ٧٤٢٣.

مەڕۆن بەدوای عەیب و عار و نهێنییەکانیاندا، هەرکەس بەدوای نهێنیی و عەیبوعاری موسڵماناندا بگەڕێت، خوای گەورە عەیب و عارەکانی ئاشکرا دەکات هەتا دەگاتە ئاستێک لەناو ماڵی خۆیدا ئابڕووی دەبات).

نەگبەتی گەورەی کەسانێک ئەوەیە کە نەوەک تەنها نهێنی خەڵک ناپارێزن، بەڵکو دەست دەبەن بۆ نهێنییەکانی خۆیشیان، بەتایبەت کۆمەڵە نهێنییەک کە لەنێوان خۆیان و پەروەردگاریاندایە و بەزاندنی سنووری خوایان لەخۆگرتووە، دەکرێت بە شاردنەوەیان، خوای گەورە لە هەموو ئەو تاوانانە خۆش بێت، بەڵام سەرگەردانانە، دەست دەبەن بۆ ئاشکراکردنیان.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت (كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ ، وَإِنَّ مِنَ الْمَجَانَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً ثُمَّ يُصْبِحَ وَقَدْ سَتَرَهُ اللهُ ، فَيَقُولَ: يَا فُلاَنُ ، عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا ، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللهِ عَنْهُ).[1] (هەموو ئوممەتەکەم بەر لێخۆشبوونی خوا دەکەون جگە لەوانەی ئاشکراکەرن، شێتی و نەفامی لەوەدایە کەسێک بە شەو کردەوەیەک – تاوانێک- دەکات و دواتر بۆ بەیانییەکەی کە خوای گەورە ئەو کردەوەو تاوانەی بۆ پەردەپۆش کردووە، کەچی کەسەکە دەڵێت: هۆ فڵانەکەس، دوێنێ شەو ئاوا و ئاوام کرد، پێشتر خوای گەورە پەردەپۆشی کردبوو، کەچی بۆ بەیانیەکەی خۆی ئەو پەردەیە لەسەر خۆی هەڵدەماڵێت کە خوای گەورە دابووی بەسەر کردەوەو تاوانەکەیدا).

## پێشنیارت هەبێت

زۆرن کەسانێک خاوەن بەهرە و بیرۆکەی ناوازەن، بەڵام بێ ئەوەی هیچ کەسێک لێیان سوودمەند بێت، دنیا جێدێڵن، چونکە لە ژیانیاندا ئامادە نەبون پێشنیارێک بخەنەڕوو بۆ دەوروبەریان، ئەمانە بەشێکیان چەشنی

[1] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب ستر المؤمن على نفسه، الرقم ٦٠٦٩.

سەربازانی ترسنۆکی ناو مەیدانی جەنگ، ترسنۆکن لە بەخشینی پێشنیار و ڕاوبۆچووندا، ئەمانە زۆرجار لەژێر کاریگەریی پەروەردەی ناپەسەندی کۆمەڵگە، یان ناوچە و دەسەڵاتێکدا ئەو حاڵەتی ترسەیان بۆ درووست بووە، بۆیە هەمیشە وادەزانن پێشنیارەکانی ئەوان بێسوودن، خەڵک بە گەمەیان دەگرن، یان لەلایەن دەسەڵات و جەماوەرەوە دەدرێتە بەر نەشتەری ناڕەزایی و سزادان و لێپێچینەوەی سەخت، بەشێکی تریان سیفەتی ڕژدییان هەیە، وەک چۆن کەسانێک دەستیان گرتووە بە سەرمایەکەیانەوەو وادەزانن ئەگەر ببەخشن کەم دەکات، کەسانێکیش پێیان وایە ئەگەر پێشنیارێک بخەنەڕوو بۆ دەوروبەریان، خۆیان جێدەمێنن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی خۆی وا پەروەردە کردبوو کە هەردەم پێشنیار و بیرۆکە ببەخشن بە چواردەوریان، چ لەسەر ئاستی تاک و دەوروبەر، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگە و دەوڵەت، فێری دەکردن نە ترسیان هەبێت لە خستنەڕووی پێشنیارەکانیاندا، نە ڕژدیی و چرووکی بنوێنن، بۆیە لە چەندین بابەتی گرنگ و هەستیاردا دەبینین سەروەرمان بە هاوەڵانی و دەوروبەری دەفەرموو (أشيروا علي)، (ڕای خۆتانم پێ بڵێن)، بۆ نموونە:

لە غەزای بەدردا کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی بڕیار لەسەر دیلەکان بدات، هاوەڵانی کۆکردەوەو پێی فەرموون (أشيروا علي فيهم)، (ڕای خۆتانم لەبارەیانەوە پێ بڵێن).[1]

لە دەرچوونی حودەیبییەدا کاتێک سەروەرمان زانی قورەیش سوپایان کۆکردۆتەوەو بەتەمان ڕێی عومرەی لێ بگرن، بە هاوەڵانی فەرموو (أشيروا علي)، (ڕای خۆتانم پێ بڵێن، ئەوەبوو ئەبووبەکر پێی وابوو ئەمان دەستپێشخەریی بۆ جەنگ نەکەن، چونکە بۆ عومرە هاتون نەوەک بۆ جەنگ، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕاکەی پەسەند کرد.[2]

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٠٢٨٩.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب الموادعة والمهادنة - ذكر ما يستحب للإمام استعمال المهادنة

لە ڕووداوی ئیفکدا کە بوختان بۆ دایکە عائیشە کرا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتاری دەفەرموو بۆ هاوەڵانی و فەرمووی (ڕای خۆتان پێ بڵێن لەسەر خەڵکانێک کە قسەیان لەسەر خێزانم کردووە).[1]

تەنانەت هاوەڵان هێندە دەرگای پێشنیاریان بەڕوودا واڵا کرابوو، پێشنیاری خێزانییان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، بۆ نموونە:

جارێک عومەری کوڕی خەططاب پێشنیاری کرد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمان بە خێزانەکانی بکات حیجاب بەکاربهێنن، مەبەست ئەوەبوو لەودیو پەردەوە میوانداریی میوانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەن و ڕووبەڕوو تێکەڵ بە میوانەکان نەبن، بیانوویشی بۆ ئەو پێشنیارەی ئەوەبوو کە هەمەچەشنەی خەڵک سەردانیماڵی خۆشەویستی دەکرد، ئەوەبوو خوای گەورە پشتڕاستی ئەو پێشنیارەی عومەری کردەوەو ئایەتی حیجاب دابەزی.[2]

حاڵەتی پێشنیارکردنیش تایبەت نەبوو بە هاوەڵە زۆر نزیک و دیار و گەورەکان، بەڵکو زۆرێک لە هاوەڵانی تریش کە لەبەرچاوان نەبوون و ڕۆڵی کارایان نەبوو، پێشنیاریان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەخستەڕوو و پێشنیارەکەشیان زۆرجار جێی خۆی دەگرت و پەسەند دەکرا، بۆ نموونە:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژانی هەینی بۆ وتاردان لەپەنا دارخورمایەکەوە دەوەستا و وتاری دەفەرموو، یەکێک لە ئافرەتە پشتیوانییەکان پێشنیارێکی خستەڕوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی مینبەرێکت بۆ دروست نەکەین؟ سەروەریشمان ڕازی بوو، ئەوەبوو مینبەرێکی بۆ دروست کرا.[3]

یاخود نموونەکەی ئومموسەلەمە لە ڕێککەوتنی حودەیبیەدا کە کاتێک پێغەمبەری

---

بينه وبين أعداء الله، الرقم ٤٨٧٢.

[1] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة النور - باب إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا، الرقم ٤٧٥٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة البقرة - باب واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى، الرقم ٤٤٨٣.

[3] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٥٨٤.

خوا(ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵانی دا قوربانیەکەیان بکەن و سەریان بتاشن، کەس هەڵنەسا و جێبەجێی نەکرد، چونکە زۆر بێتاقەت بوون لە ڕێککەوتنەکە و بە شکستیان دەزانی، ئوممومسەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بڕۆرە دەرەوەو لەگەڵ هیچ کەس هیچ مەفەرموو، قوربانیەکەت سەرببڕە و سەرتاشەکەت بانگ بکە و سەرت بتاشە، خۆشەویستیش پێشنیارەکەی ئوممومسەلەمەی وەرگرت و وایکرد، هاوەڵان کە ئەو حاڵەتەیان بینی، هەموو نەوینە سەربڕینی قوربانیەکانیان.[1]

ئەوەی جێی سەرنجە، هاوەڵان کاتێک پێشنیارێکیان دەخستەڕوو، بە ئەوپەڕی ڕێزەوە پێشنیاریان دەکرد، وەک بڵێیت پەیامێکیان پێیە و دەیانەوێت سوودێک بگەیەنن، نەوەک خۆیان بنوێنن، دەربڕینی پێشنیارەکانیان لە کاتی پێویستیشدا لەوپەڕی ڕێزەوە دادەڕێژران، بۆ نموونە:

لە غەزای بەدردا کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) شوێنی دابەزینی موسڵمانانی دەستنیشان کرد، یەکێک لە هاوەڵەکان بە ناوی حوبابی کوڕی مونزیر پێشنیارێکی هەبوو، بەڵام ڕاستەوخۆ دەرینەبڕی، بەڵکو بەم چەشنە دەستی پێکرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم شوێنەی کە تیایدا دابەزیوین بە فەرمانی خوایە و بۆمان نیە ئەملاولای تێدا بکەین، یان ڕاو بۆچوون و پلانی جەنگە؟ خۆشەویستمان فەرمووی (بَلْ هُوَ الرَّأْيُ وَالحَرْبُ وَالْمَكِيدَةُ)، (بەڵکو ڕاو بۆچوون و پلانی جەنگە)، حوباب ئینجا پێشنیارەکەی خۆی خستەڕوو و وتی: دەی ئەم شوێنە گونجاو نیە، ئەو خەڵکە ببەرە خوارووی ئاوەکەوە، ئینجا هەرچی ئاوی تر هەیە پڕیان بکەینەوەو خۆشمان لە خوارووی کۆتا ئاوەوە دابەزین و حەوزێکی لەسەر دروست بکەین و پڕی بکەین لە ئاو، ئەوکات جەنگی دوژمن بکەین، بەو چەشنە ئێمە ئاومان لەبەردەست دەبێت و ئەوانیش بێ ئاو دەبن، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ڕاکەی پێ جوان بوو و پێی فەرمووو (لقد أشرت بالرأي)،[2] (بەڕاستی ئاماژەت بە ڕاو پێشنیارێکی دروست دا).

[1] صحيح البخاري - كتاب الشروط - باب الشروط في الجهاد، الرقم ٢٧٣١.
[2] ابن هشام: السيرة النبوية، شركة الطباعة الفنية المتحدة، ج٢، ص ١٩٢.

ئـەم ئەزموونـە بـە جوانـی لـە سـەردەمی پێغەمبـەرەوە(ﷺ) گوازرایـەوە بۆ سـەردەمی خەلیفەکانـی ڕاشـیدین و هـاوەڵان بـە کەسـانی خـاوەن پێگـە و بەرپرسـیارێتی و هاوەڵانـی دیکەشـەوە، بـەردەوام پێشـنیاریان بـۆ یەکـدی دەبوو و لەسـەر خێر و چاکە ئامۆژگاریی یەکدییان دەکرد، هەوڵیان دەدا بە ڕایەکـی پەسـەند و گونجـاو چواردەوریـان بەرەوپێش هەنـگاو پـێ بنێـن.

کاتێـک جەنگـی یەمامـە ڕوویـدا و تیایـدا ژمارەیەکـی بەرچـاو لـەو هاوەڵانـە شـەهید بـوون کـە قورئانیـان لەبەربـوو، عومـەری کـوڕی خەططـاب ترسـی لـێ نیشـت و پێشـنیاری کۆکردنـەوەی قورئانـی بـۆ ئەبووبەکـری صدیـق خسـتەڕوو، ئەبووبەکـر ترسـی هەبـوو ئـەوە جۆرێـک لـە بیدعـە بێـت، بـەڵام دواتـر قەناعەتـی بـۆ دروسـتبوو و لەسـەر ڕاسـپاردەکەی عومـەر، داوای لـە زەیدی کوڕی ثابت کرد ئەرکی کۆکردنـەوەی قورئـان بگرێتـە ئەستۆ، چونکە زەید لـەو بوارەدا پێشـینە و تایبەتمەنـدی و ڕەزامەنـدی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) هەبـوو و کەسـێکی جێمتمانـە و گەنـج و بەتوانـاش بـوو، زەیدیـش هەرچەنـدە ئەرکەکـەی لا قـورس بـوو، بـەڵام بە بڕیارەکـە ڕازی بـوو و لـە ماوەیەکـی کەمدا ئەرکەکـەی بەجێگەیانـد،[1] بـەم چەشـنە هەتـا ئەمڕۆیـش موسـڵمانان بەرهەمـی ئـەو پێشـنیارەی هاوەڵێکـی پێغەمبـەر(ﷺ) دەخـۆن کـە نەترسـانە پێشـنیارەکەی خسـتەڕوو و ڕژدیشـی نەنوانـد لـە باسـکردنی و هاندانـی خەلیفـە بـۆی.

کاتێک ئەبووبەکری صدیق جەنگی هەڵگەڕاوەکانی دەستپێکرد، ویستی خۆی سـەرکردایەتی سـوپا بـکات و بچێتـە مەیدانـی جەنگـەوە، ئەوەبـوو عەلـی کـوڕی ئەبووطالیب پێشـنیاری بۆ خەلیفە کرد نەچێت و لـە مەدینـەوە سەرپەرشـتیی کـۆی کاروبـاری موسـڵمانان بـکات، خـۆ لەوانەیـە پێشـنیارێکی لـەو چەشـنە نەبوایـە، ڕێڕەوی ڕووداوەکان بـە ئاڕاسـتەیەکی دیکـەدا بڕۆیشـتایە.[2]

---

[1] صحيح البخاري، الرقم ٤٤١٠.

[2] ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٣٤٦.

## تەنها خۆت نا

خودگەرایی مرۆڤەکان، زۆرجار بەرەو هەڵدێر و ڕێی هەڵەیان دەبات، زۆرجار مرۆڤ وای لێ دێت، هەموو شتێکی تەنها بۆ خۆی دەوێت، واتە کاتێک چاکەیەک، یان دەستکەوتێک بەدیدەکات، یەکەمجار هەوڵ بۆ خۆی دەدات، بگرە جاری وا هەیە، هەوڵ دەدات کەسی تر بەری نەکەوێت و بۆ خۆی قۆرخ بکات، خراپتر لەوەش، جاری واهەیە، ئەو شتە مافی خۆی نیە، بەڵام هێندە خۆی لا خۆشەویست و لەپێشترە، دەست بۆ مافی دەوروبەر، یاخود بەرامبەری دەبات و مافە ڕەواکەی زەوت دەکات.

ڕەفتارێکی جوانی موسڵمانانە کە قورئانی پیرۆز فێرمان دەکات، بریتیە لە بەخشین لەو شتەی کە خۆمان زۆر لامان خۆشەویستە (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ)، (هەرگیز ناگەنە تەواوی چاکە هەتا لەوە نەبەخشن کە خۆتان حەزتان لێیەتی و لاتان خۆشەویستە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی فێری ئیسار و لەخۆبوردەیی کردبوو، واتە تاک وای لێ بێت، کاتێک دەستکەوت و چاکەیەک بەدیدەکات، حەز و هەوڵی بۆ ئەوە بێت، ئەوەی لەگەڵیدایە پێشی خۆی بخات، ئەگەر خراپە و زیانێکیش هەبێت، پێش ئەوەی لەخۆی دووربخاتەوە، لەوی دووربخاتەوە، ئەمەش لووتکەی برایەتییە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) چ بە فەرمایشت و وانەکانی، چ بە کردار و ڕەفتاری ڕۆژانەی، هاوەڵانی فێری ئەم چەشنە مامەڵەیە دەکرد، بۆیە ئەوانیش ڕەنگ و بۆی ڕەفتاری خۆشەویستیان وەردەگرت، خوای گەورەش ئەم شایەتیەی بۆ داون و دەفەرموێت (لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى

أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ).

سەهل دەڵێت: جارێک ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و عەبایەکی سەرشانی بۆ هێنا کە لاکانی چنرابوون، وتی: خۆم بۆم چنیویت هەتا بیکەیتە بەرت، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لەبەرئەوەی پێویستی پێی بوو، لێی وەرگرت، چوویە ژوورەوەو کردیە بەری و دواتر هاتە دەرەوە بۆ لامان، یەکێک لە هاوەڵان بە جوانی زانی و بە پێغەمبەری وت: بیدە بە من با بیکەمە بەرم، زۆر جوانە، پێغەمبەریش(ﷺ) داوای هەرچی لێبکرایە نەخێری نەبوو، خەڵکەکە بە کابرایان وت: ئیشێکی باشت نەکرد، خۆ دەزانیت پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە لە ئافرەتەکەی قبووڵ کرد، چونکە پێویستی پێی بوو، دەشتزانی داوای لێ بکەیت نەخێری نیە، کابراش وتی: بەخوا بۆ ئەوە داوام لێ نەکرد بیکەمە بەرم، بەڵکو بۆ ئەوە داوام لێکرد ببێت بە کفنم.[1]

میقدادی کوڕی ئەسوەد دەڵێت: جارێک من و دوو هاوڕێم لە تاو ماندوویی و برسێتی چاو و گوێمان لەدەست دابوو، چووین تا میوانی هاوەڵانێکی پێغەمبەر(ﷺ) بین، بەڵام کەس نەیبردینەوە، چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ئێمەی بردەوە ماڵەوە، سێ بزنیان هەبوو فەرمووی ئەو شیرە لە نێوانماندا دابەش بکەن، هەرکاممان بەشی خۆی دەخوارد، بەشەکەی پێغەمبەریشمان(ﷺ) برد بۆی، چەند جار ئاوامان دەکرد، شەو دەهاتەوەو سەلامێکی دەکرد کە خەوتووی بێدار نەدەکردەوەو بێداریش دەیبیست، ئینجا دەچوویە مزگەوت و نوێژی دەکرد و دواتر دەهاتەوە شیرەکەی دەخواردەوە، شەوێک شەیتان هاتە بنکلێشەم و کە بەشەکەی خۆمم خواردەوە پێی دەوتم موحەممەد دەچێت بۆ لای پشتیوانان و ئەوانیش زۆر ڕێزی دەگرن و چی پێویست بێت پێی دەبەخشن، بۆیە چووم بەشەکەی پێغەمبەریشم(ﷺ) خواردەوە، جا کە شیرەکە گەیشتە ناو گەدەم و دڵنیا بوومەوە کە هیچ ڕێیەکی گەڕانەوەی نیە، پەشیمان بوومەوەو شەیتانیش

[1] صحيح البخاري – كتاب الجنائز – باب من استعد الكفن في زمن النبي، الرقم ١٢٧٧.

ڕێی پەشیمانی دەخستە بەرم، پێی دەوتم ماڵوێران چیت کرد؟ شیرەکەی موحەممەدت خواردەوە؟ جا خۆ ئێستە دێتەوەو دەبینێت شیرەکەی نەماوە نزات لێ دەکات و دنیا و ئاخیرەتیشت دەفەوتێت، منیش بەرگێکم دەدا بەخۆمدا، کە بمدایە بەسەر سەرمدا قاچم دەردەکەوت و ئەگەر بمدایە بەسەر قاچمدا سەرم دەردەکەوت، خەویش لە چاوانم تۆرابوو، بەڵام دوو هاوڕێکەی ترم خەوتن و ئەوەی من کردم ئەوان نەیانکرد، پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوەو وەک جاران سەلامێکی نەرمی کرد، ئینجا چوویە مزگەوت و نوێژی کرد و دواتر هات تا شیرەکەی بخواتەوە، کەچی بینی نەماوە، سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە، وتم بەخوا ئێستا نزام لێ دەکات و ماڵ وێران دەبم، ئینجا فەرمووی (خوایە ئەوەی خواردنم پێ دەدات خواردنی پێ بدەیت، ئەوەی خواردنەوەم پێ دەدات خواردنەوەی نۆش بکەیت)، منیش تووند بەرگەکەم دا بەسەر خۆمدا و چەقۆیەکم هەڵگرت و چووم بۆ لای بزنەکان تا بزانم کامیان قەڵەوترە سەری ببڕم بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، دەبینم هەر سێ بزنەکە گوانیان پڕە لە شیر، چووم قاپێکی ماڵی پێغەمبەرم(ﷺ) هێنا و پڕم کرد لە شیر، بردم بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ئەمشەو شیرەکەی خۆتان خواردەوە؟)، وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی بخۆرەوە، ئەویش شیرەکەی خواردەوە، دواتر هەندێکی هێشتەوەو دای بە من، وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بخۆرەوە، ئەویش هەمدی لێی خواردەوەو هەندێکی مابوو دای بە من، کە زانیم پێغەمبەر(ﷺ) تێری خواردەوەو نزاکەی منی گرتەوە، ئەوەندە پێکەنیم تا کەوتمە سەر زەویەکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (خەریکە داوێنت دەرکەوێت ئەی میقداد)، وتم ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بارو مەسەلەکە ئاوەها بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ئەوە تەنها ڕەحمەتێ بوو لە خواوە، بۆچی پێت نەوتم تا دوو هاوڕێکەی تریشمان بێدار بکردایەتەوەو ئەوانیش لێیان بخواردایەتەوە).[1]

[1] صحيح مسلم، الرقم ٣٩٢٤.

هـاوەڵان کـە بـەم چەشـنە لـە خزمەتـی پێغەمبـەردا(ﷺ) پەروەردەیـان وەرگرتبوو، ڕەنگدانـەوەی ڕەفتـاری پێغەمبـەر(ﷺ) بـوون لـە واقیعـی ژیانـی ڕۆژانەیانـدا، ئەمـەش لـە دەیـان نموونـەی نـاو ژیانیانـدا بەدیدەکرێت.

جارێک کابرایەک ویستی لە ماڵی پێغەمبـەر(ﷺ) بمێنێتـەوە، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کەسـێکی نـارد بـۆ ماڵـی یەکـە یەکـەی خێزانەکانـی، لـە ماڵـی هیچکامیانـدا خواردنێـک نەبـوو کـە بتوانـن میواندریـی ئـەو کابرایـەی پـێ بکـەن، بۆیـە بـە هاوەڵانـی فەرمـوو: ڕەحمـەت لـەو کەسـەی میوانداری ئـەم کەسـە دەکات، ئەبووطەلحـە هەسـتاو وتـی مـن،[1] کابـرای بـردەوە ماڵـەوە، بـە ژنەکـەی وت ڕێـزی میوانـی پێغەمبـەر(ﷺ) بگـرە، ژنەکـەی وتـی تەنهـا خواردنـی منداڵەکانمـان هەیـە، ئەبووطەلحـە وتـی: دەی خواردنەکـە ئامـادە بکـەو چراکـە بکوژێنـەرەوەو منداڵـەکان بخەوێنـە، ئەویـش نانەکـەی ئامـادە کرد و منداڵەکانی خەواند و چوو دەستکاری چراکەی کرد بـەو بیانووەی چاکـی دەکات و کوژاندیـەوە، بەوجـۆرە وایـان لـە میوانەکـە تێگەیانـد کـە ئەوانیـش نـان دەخـۆن، بـۆ بەیانـی کـە چوویـەوە بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمـووی: (ضَحكَ اللهُ الليلةَ أو عجب- مِن فعلِكُما)، (خـوا ئەمشـەو پێکەنـی –یـان خـوا ئەمشـەو سەرسـام بـوو- لـە کـردەوەی ئـەو دوانەتـان).[2]

نافیع دەڵێت: جارێک ئیبن عومـەر نەخۆش کەوت، ئارەزووی ترێی کرد، (وەرز)یش سـەرەتای پێگەیشتنی ترێ بوو، صەفییـەی خێزانی درهەمێکی دا بـە کەسێک و ئەویش چـوو هێشـوویەک ترێی هێنـا، سواڵکەرێکیش کەوتە شـوێن کابرا، کە ترێکەیـان هێنا بۆ ئیبن عومـەر، کابـرای سواڵکەر لەولاوە داوای ترێکـەی کـرد، ئیبـن عومـەر وازی لـە حـەزی خـۆی هێنـا و وتـی:

---

[1] صحيح مسلم، الرقم ٢٠٥٤.

[2] صحيح البخاري، كتاب مناقب الأنصار ، الرقم ٣٧٩٨.

بیدەن بەو، پێیان دا، ئینجا صەفییە درهەمێکی تری دا بە کابرا و چوو هێشوویەکی تری کڕی، کابرای سواڵکەر هەمدی کەوتەوە شوێنی کابرا هەتا گەیشتنە لای ئیبن عومەر و داوای ئەو هێشووەشی کرد، ئەویش وتی: بیدەن بەو، هێشووە ترێکەیان پێ دا، صەفییە هەواڵی نارد بۆ کابرای سواڵکەر و پێی وت: ئەمجارە بێیتەوە هەتا ماوی خێر لەدەستم نابینیت، ئینجا درهەمێکی تری نارد و هێشووە ترێیەکی تریان بۆ کڕی.[1]

لە خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا، جارێک خەلیفە چوارسەد دیناری دا بە مێردمنداڵێک و پێی وت: ئەوە ببە بۆ ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەڕاح و ماوەیەک لەلای بمێنەرەوە و بزانە چی بەم پارەیە دەکات، مێردمنداڵەکە بۆی برد و پێی وت: ئەمیری باوەڕداران پێت دەڵێت: ئەمە بۆ هەندێک پێویستیی خۆت بەکاربهێنە، ئەویش نزای خێری بۆ خەلیفە کرد، کە پارەکەی وەرگرت، بە خزمەتکارەکەی خۆی وت: ئەم حەوتە ببە بۆ فلانە کەس، ئەم پێنجەش بۆ فلانەکەس، بەو چەشنە هەمووی بەخشیەوە، مێردمنداڵەکە گەڕایەوەو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، خەلیفە هەمان بڕی پێدا نارد بۆ موعازی کوڕی جەبەل و داوای لێکرد لای ئەویش بمێنێتەوە و بزانێت چی بە پارەکە دەکات، ئەویش چەشنی ئەبووعوبەیدە دەستی کرد بە بەخشینەوەی هەتا هیچی لێ نەهێشتەوە دوو دینار نەبێت، لەو کاتەدا ژنەکەی موعاز هاتە ئەمدیو و وتی: بەخوا ئێمەیش هەژارین، شتێک بۆ ئێمەش بهێڵەوە، موعازیش ئەو دوو دینارەی پێ دا، مێردمنداڵەکە گەڕایەوە بەسەرهاتەکەی بۆ عومەر گێڕایەوە، ئەویش زۆر دڵخۆش بوو بەو ئیسار و لەخۆبوردەییەی هاوەڵان و فەرمووی (ئەوانە برای یەکدین و دەڵێیت بەشێکن لە یەکتر).[2]

---

[1] السنن الكبرى للبيهقي، كتاب الزكاة، جماع أبواب صدقة التطوع، الرقم ٧٨٩٧.

[2] تاريخ دمشق لابن عساكر، ج٥٨، ص ٤٣٦.

## قسەی ناخت بکە

ئەگەرچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی لەسەر ئەوپەڕی شەرم و حەیا پەروەردە کردبوو، بەڵام ئەمە ڕێگر نەبوو لە دیوێکی تری پەروەردەی هاوەڵان کە ئەویش بریتی بوو لەوەی قسەی دڵی خۆیان بکەن، چونکە زۆرجار شاردنەوەی قسەی ناو ناخی مرۆڤەکان، پاڵنەرێکی سەرەکییە بۆ هەنگاونان بەرەو ڕێی چەوت، شەیتان زەفەر بە کەسەکە دەبات و لەلای خۆیەوە سەد جۆر لێکدانەوە دەکات بۆ ئەوەی لە ناخیدایە و ئامادە نیە دەریببڕێت، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆرجار خۆی هەوڵی دەدا ئەوەی لە ناخی هاوەڵانیدایە، بیخاتە سەر زاریان، ئەم پەروەردەش بە جوانی لەنێویاندا ڕەنگی دایەوەو شوێنەوارێکی زۆر چاکیشی جێهێشت.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرمووم (إِنِّي لَأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى)، (من چاک ئەزانم چ کاتێک لێم ڕازیت و کەی لە دەستم زویریت)، منیش وتم: چۆن ئەوە دەزانیت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لَا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ ، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى قُلْتِ: لَا وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ)، (ئەو کاتەی لێم ڕازیت، کە سوێند دەخۆیت، دەڵێیت: نا، بە پەروەردگاری موحەممەد، کاتێکیش لەدەستم زویریت، دەڵێیت: نا، سوێند بە پەروەردگاری ئیبراهیم)، عائیشە دەڵێت: وتم، بەڵێ بەخوا وایە ئەی پێغەمبەری خوا.[1]

با پێکەوە تەماشای هەڵوێستێکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پشتیوانان بکەین لەکاتی دابەشکردنی دەستکەوتەکانی حونەیندا:

کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش کرد، هەمووی بەخشیەوە بەسەر قورەیشیەکان و هۆزەکانی تردا و بەشی پشتیوانانی نەدا، ئیتر قسەو

---

[1] صحيح البخاري، كتاب النكاح، باب غيرة النساء ووجدهن، الرقم ٥٢٢٨.

بۆڵەیەک لەناو پشتیواناندا دروست بوو تا ئەوەی یەکێک وتی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی بەخشیوە بە هۆزەکەی خۆی، سەعدی کوڕی عوبادە بڕیاری دا مەسەلەکە بباتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، چوویە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دەستەی پشتیوانان گلەییەک لە ناخیاندا دروست بووە بەرامبەر بەو دابەشکردنەت و دەڵێن هەموویت بەخشیوە بە هۆز و قەومەکەی خۆت و پشتیوانان هیچ پشکێکیان نەبووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەی سەعد ئەی تۆ لەو نێوەندەدا ڕات چۆنە؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) منیش ئەندامێکی قەومەکەمم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ قەومەکەتم بۆ کۆبکەرەوە، سەعد چوو و پشتیوانانی کۆکردەوە، هەندێک لە کۆچەران هاتن و هەموویانی گێڕایەوە، کاتێک هەموو پشتیوانان کۆبوونەوە سەعد هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت کە هەموو کۆبوونەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) چو بۆ لایان و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی:

(يَا مَعْشرَ الْأَنْصَارِ مَا قَالَةٌ بَلَغَتْنِي عَنْكُمْ وَجِدَةٌ وَجَدْتُمُوهَا فِي أَنْفُسِكُمْ ، أَلَمْ آتِكُمْ ضُلَّالًا فَهَدَاكُمُ اللهُ ، وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ اللهُ ، وَأَعْدَاءً فَأَلَّفَ اللهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ)

(ئەی گرۆی پشتیوانان وتەیەکم بیستووەتەوە لە ئێوەوە کە لە ناختاندا دروست بووە، مەگەر من هاتم بۆ لاتان گومڕا نەبوون و خوا ڕێنموونی کردن؟ مەگەر هەژار نەبوون و خوا دەوڵەمەندی کردن؟ مەگەر دوژمن نەبوون و خوا نێوانی دڵەکانی یەکخستن؟) وتیان با ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) منەت و فەزڵ بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ئەی گرۆی پشتیوانان ئایا وەڵامم نادەنەوە؟) وتیان چۆن وەڵامت بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا فەزڵ و منەت بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی؟ فەرمووی:

(أَمَا وَاللهِ لَوْ شِئْتُمْ لَقُلْتُمْ فَلَصَدَقْتُمْ وَلَصُدِّقْتُمْ أَتَيْتَنَا مُكَذَّبًا فَصَدَّقْنَاكَ ، وَمَخْذُولًا فَنَصَرْنَاكَ ، وَطَرِيدًا فَآوَيْنَاكَ ، وَعَائِلًا فَآسَيْنَاكَ ، أَوَجَدْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ يَا مَعْشرَ الْأَنْصَارِ فِي لُعَاعَةٍ مِنَ الدُّنْيَا

تَأَلَّفْتُ بِهَا قَوْمًا لِيُسْلِمُوا وَوَكَلْتُكُمْ إِلَى إِسْلاَمِكُمْ ، أَفَلاَ تَرْضَوْنَ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالبَعِيرِ ، وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللهِ فِي رِحَالِكُمْ ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الْأَنْصَارِ ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ شِعْبًا وَسَلَكَتِ الْأَنْصَارُ شِعْبًا لسَلَكْتُ شِعْبَ الْأَنْصَارِ ، اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْأَنْصَارَ وَأَبْنَاءَ الْأَنْصَارِ وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ)

(ئا سوێند بەخوا ئەگەر بتانەوێت دەڵێن و ڕاست دەڵێن و بە ڕاستیش دەزانرێن، بڵێن تۆ هاتیت بۆ لامان بەدرۆخرابوویتەوەو ئێمە بەڕاستمان زانیت، پشتت بەردرابوو و ئێمە سەرمان خستیت، دەرکرابویت و ئێمە پەنامان دایت، بێناز بوویت و ئێمە دڵنەواییمان کردی، ئەی گرۆی پشتیوانان خەمی ناختان بۆ بڕێ پاشماوەی کەمی دنیایە کە بۆ دڵڕاکێشانی خەڵکێ بەکارم هێناوە تا موسڵمان بن و ئێوەشم ڕاسپاردووە بۆ ئیسلامەکەتان؟ ئەی گرۆی پشتیوانان ئایا ڕازی نابن خەڵکی بە مەڕ و وشترەوە بچنەوەو ئێوەش لە کاروانەکەتاندا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ خۆتان ببەنەوە؟ سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر هیجرەت نەبوایە ئەوە من یەکێک دەبووم لە پشتیوانان، ئەگەر هەموو خەڵکی شیوێک بگرن و پشتیوانان شیوێکی تر بگرنەبەر، ئەوە من بە دڵنیاییەوە شیوەکەی پشتیوانان دەگرمەبەر، خوایە ڕەحم بکە بە پشتیوانان و منداڵانی پشتیوانان و منداڵەکانی منداڵانی پشتیوانان)، ئیتر هەموو پشتیوانان دەستیان کرد بە گریان تا ئەوەی ڕیشیان تەڕ بوو و دەیانوت ڕازین پێغەمبەری خوا(ﷺ) پشک و بەختمان بێت.[1]

ئەگەر گلەیی و گومانی ناو ناخی هاوەڵە پشتیوانییەکان، بە پەنهانی بمایەتەوەو نەگەیشتایە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سەروەریشمان ئەو ڕوونکردنەوەو نیەتە چاکەی خۆی بەرامبەر بەوان نەخستایەتەڕوو، چاوەڕوان دەکرا چ ساردبوونەوەو بەدبینییەک بە دەستی شەیتان لە ناخی هاوەڵە پشتیوانییەکاندا چەکەرەی بکردایە؟

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٩٠٩، حسنه شعيب الأرناؤوط.

زۆرجار بەناوی ڕێز و شەرمەوە، دەرفەت دەدەین ئەوەی لەناخماندایە شاراوە بێت بۆ کەسێک کە پێویستە ئەو پەیامەی پێ بگات، ئەگەر پەیامەکەی پێ گەیشت، لە چەند ئەگەرێک زیاتر تێپەڕ ناکات:

دان دەنێت بە ڕاستی پەیامەکەدا و هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێت.

ڕوونکردنەوەت پێ دەدات و قەناعەتت پێ دێنێت کە دەکرێت لەم دیوەی تریشەوە تەماشای بابەتەکە بکەیت.

یاخی دەبێت و ئامادەیی نابێت دانی پێدا بنێت و ڕق هەڵدەگرێت، یاخود بە پێچەوانەوە تۆ هەڵوێستێکی وا هەڵدەگریت.

لە حاڵەتی یەکەم و دووەمدا هەردوولا سوودمەند دەبن، لە حاڵەتی سێیەمیشدا خەتا و تاوانەکە بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە دان بە حەقدا نانێت، هۆکارەکەشی ئەو هەمووە دڵناسکییەیە کە لەنێوماندا هەیە و زۆرجار بووەتە سەرچاوەیەکی گەورەی غەیبەتکردن، چونکە ئەگەر ئەوەی لەناخی هەرکاممان‌دا هەیە، بە دڵێکی ساف و سنگێکی فراوانەوە بە یەکدی بڵێین، دەرچەیەک ناهێڵینەوە بۆ غەیبەت و پاشملە باسکردنی یەکدی.

کاتێک ئەبووبەکری صدیق بوو بە خەلیفە، پێشتر هەرچی ماڵ و سامانی خۆی هەبوو لە خزمەتی موسڵماناندا و بۆ بەرژەوەندی ئوممەت بەکاریهێنابوو، بۆیە مووچەیەکی دیاریکراوی بۆ بڕایەوە هەتا سەرقاڵ نەبێت بە ئیشوکاری ترەوەو خۆی یەکلا بکاتەوە بۆ کاروباری موسڵمانان، بەڵام ئەو مووچەی هەیبوو بەشی ژیانی نەدەکرد، ناچار ڕۆژێک چوویە ناوبازاڕ و دەستی دایە ئیشکردن، کۆمەڵێک ئافرەتیش لە چاوەڕوانی خەلیفەدا بوون، عومەری کوڕی خەططاب کە ئەوانی بینی، وتی: خێرە؟ چی ئەکەن؟ وتیان: چاوەڕوانی خەلیفەی پێغەمبەری خواین هەتا بێت و دادوەری نێوانمان بکات، عومەریش گەڕا بە دوای ئەبووبەکردا، بینی لە بازاڕە و خەریکی کاسپیە، دەستی گرت و وتی: وەرە ئەملاوە، ئەبووبەکریش وتی: پێویستیم

بەو پۆستە نیە پێتان داوم، بڕێک موچەتان بۆ بڕیومەتەوە کە بەشی خۆم و خاوخێزانم ناکات، عومەریش وتی: دەی بۆت زیاد دەکەین، ئەبووبەکر پێی وت: بڕی ئەوەندە ئینجا بەشم ئەکات، عومەر وتی: ئەوەی وتت کەمێک زیادە، لەو سەروبەندەدا عەلی هات، کە گوێی لێگرتن، بە عومەری وت: ئەوەی داوای کردووە، بۆی دابنێ، عومەر وتی: پێت وایە زیاد نەبێت؟ عەلی وتی: بەڵێ، بەم چەشنە بڕیار درا ئەوەی ئەبووبەکر داوای کردبوو، مووچەکەی بکرێت بە ئەوەندە.[1]

ئەم بەسەرهاتە لەوێدا کۆتایی پێ هات و ئیشەکە بە جوانی بەڕێوە چوو، ئیتر قسەی تری بەدوادا نەهات، مادەم ئەبووبەکر داوای پارەی زیاتر دەکات، عومەر تۆمەتباری بکات، مادەم مەسەلەکە داوای پارەی زیاترە، ئەبووبەکر قسەی دڵی نەکات و هەروا لە ناخیدا بیهێڵێتەوەو گلەییەکی نەدرکێنراو بێت، مادەم عومەر مشتومڕی لەگەڵ کرد لەسەر بڕەکەی، ئەبووبەکر ڕقی لێ هەڵبگرێت و بە چرووک و نەیاری خۆی و چەندین سیفەتی تری ناشیرین، ناوزدەی بکات.

## ڕێزی کەمتەمەنان بگرن

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ژیانی واقیعیی خۆیدا ڕێزێکی زۆری منداڵان و هەرزەکارانی دەگرت، دڵی ڕاگیر دەکردن، هەستی بریندار نەدەکردن، سنووری مافی ئەوانی نەدەبەزاند، ڕۆژانەش مامەڵەی لەگەڵ منداڵان و هەرزەکاراندا هەبوو، چونکە هەتا لە مەککە بوو، عەلی کوڕی ئەبووطالیب و کچەکانی خۆی لە دەوری بوون، لە مەدینەش، ئەنەسی کوڕی مالیک زۆربەی کات بۆ ماوەی دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد، وەک خۆی دەڵێت: ماوەی دە ساڵ چ لەماڵەوەو چ لە سەفەر و دەرچووندا،

[1] الرياض النضرة في مناقب العشرة، ج١، ص ٢٥٥.

خزمەتی پێغەمبەری خوام(ﷺ) کرد، یەکجاریش نەبوو شتێکم کردبێت و پێی وتبم، بۆچی واتکرد، یان شتێکم نەکردبێت و پێی وتبم، خۆزگە وات بکردایە.[1]

تەنانەت سەردانی تایبەتی هەبوو بۆ لای منداڵ و هەرزەکاران، بێ ئەوەی جیاوازیی ئایینیش لێک بداتەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێکەڵیی و سەردانی دەکردین، هێندە تێکەڵمان دەبوو هەتا جاری وا هەبوو، برایەکی بچووکم هەبوو کە باڵندەیەکی هەبوو و ناوی نابوو نوغەیر، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (ئەبووعومەیر، ئەوە نوغەیر چی ئەکات؟).[2]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: مێردمنداڵێکی جوولەکە هەبوو کە خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەکرد، ئەوەبوو نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) چوو بۆ سەردانی، لەلای سەری مێردمنداڵەکەوە دانیشت، پێی فەرموو: موسڵمان بە، ئەویش تەماشایەکی باوکی کرد، باوکیشی پێی وت: بە گوێی بکە، مێردمنداڵەکەش موسڵمان بوو، دواتر کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چوویەدەرەوە، دەیفەرموو (الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ).[3] (سوپاس بۆ خوا کە لە دۆزەخ دەربازی کرد).

بەبەرچاوی هاوەڵانەوە، ڕێزی تەواوەتی نیشاندەدا بۆیان هەتا هاوەڵانیش لێیەوە فێرببن چۆن ڕێزی کەمتەمەنەکانیان بگرن، وەک سەهلی کوڕی سەعد بەسەرهاتێکی زۆر ناوازەی پێغەمبەری خوامان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

جارێک ژمارەیەک لە هاوەڵان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دانیشتبوون، پاش ماوەیەک بڕێک ئاویان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش لە ئاوەکەی نۆشکرد، ئینجا سەیری کرد لەلای ڕاستیەوە مێردمنداڵێک دانیشتبوو، لای

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الوصايا، الرقم ٢٧٦٨.

[2] صحيح البخاري، كتاب الادب، الرقم ٦١٢٩.

[3] صحيح البخاري، كتاب الجنائز، الرقم ١٣٥٦.

چەپیشیەوە کۆمەڵێک پیاوی بەتەمەن دانیشتبوون، بەپێی ئەو سوننەتەش کە پێغەمبەری خوا هاوەڵانی فێرکردبوو، مافی کەسی دەستەڕاستە سەرەتا ئاوی بۆ ببرێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی خۆش بوو بەتەمەنەکان پێش بخات، لەگەڵ ئەوەشدا شکۆی کەسێتی ئەو مێردمنداڵەی لەبیر نەکرد و پێی فەرموو: (يَا غُلَامُ ، أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ الْأَشْيَاخَ)، (ئایا مۆڵەتم دەدەیت ئاوەکە بدەم بەو پیاوە بەتەمەنانە؟)، مێردمنداڵەکەش بێ ترس وەڵامی دایەوە (ئەی پێغەمبەری خوا ئامادە نیم لەو ئاوەی تۆ لێت نۆشکردووە بەش و سەرەی خۆم واز لێبهێنم و بیدەم بە هیچ کەسێکی تر)، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بێ ئەوەی هیچ سەرکۆنەیەکی بکات، ئاوەکەی پێدا.[1]

ئەم ڕێزەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە منداڵان، وای لە هاوەڵان دەکرد مامەڵەیەکی تایبەتیان هەبێت لەگەڵ منداڵەکانیاندا، هەمان ئەو عومەری کوڕی خەططابەی پێشتر منداڵی زیندەبەچاڵ دەکرد، لە مەدینەدا کە دەچوویە نێو کۆڕی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، عەبدوڵای کوڕی لەگەڵ خۆیدا دەبردە نێو دانیشتنی پێغەمبەر و گەورە هاوەڵانەوە.

کاتێک عومەری کوڕی خەططاب خەلیفە بوو، جارێک لەماڵەوە بوو کە یەکێک لە کاربەدەستەکانی ناو خیلافەتەکەی هات بۆ لای، تەماشای کرد عومەر ڕاکشاوەو منداڵەکانی چوونەتە سەر سکی و خەریکی گەمەن، کابرا ئەوەی پێ ناخۆش بوو، عومەریش سەری سوڕما لەو هەڵوێستەی کابرا و لێی پرسی: بۆچی تۆ لە ماڵەوە چۆنیت؟ ئەویش وتی: کە چوومەوە ماڵەوە کەس نوتقی لێوە نایەت، عومەر دەستبەجێ بڕیاری دا کابرا لە پۆستەکەی لاببات و پێی وت: تۆ بەرامبەر بە ژن و منداڵەکانت میهرەبان نەبیت، چۆن بەرامبەر بە ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) میهرەبان دەبیت![2]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الشرب والمساقاة - باب من رأى أن صاحب الحوض والقربة أحق بمائه، الرقم ٢٣٦٦.

[2] المستطرف في كل من مستطرف، ص ١٣٧.

ئەم هەڵوێستەش بۆ عومەری کوڕی خەططاب شتێکی نامۆ نەبوو، چونکە ئەو وێڕای ئەوەی خەلیفەی موسڵمانان بوو و سەرقاڵ بوو بە جەنگی دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی ڕۆم و فارسەکانەوە، کەچی کاتێک کێشەیەکی دەهاتەڕێ، یان پرسێک بخرایەتە بەرباس، گەنجەکانی کۆدەکردەوەو ڕاوێژی پێ دەکردن،[1] چونکە دەیزانی ئەو گەنجانە چۆن بە منداڵیی پەروەردە کراون و لەوانەیە کۆمەڵێک پێشنیار و ڕاوبۆچوونیان هەبێت کە هیچکات لای گەورەکان دەست نەکەوێت.

ئەم جۆرە بایەخدانە بە کەمتەمەنان و ڕێزگرتنەیان لەلایەن پێغەمبەری خوا و هاوەڵانیەوە، ڕەنگدانەوەی هەبووە بەسەر مێژووی ئیسلامیدا و بە هەزاران نموونەی ناوازە لەو بارەوە لە ناوچە و نەتەوەو کاتە جیاوازەکاندا بەدیدەکەین، تەنها بۆ نموونە:

ئیمامی بوخاری نەگەیشتبوویە دە ساڵان ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی لەبەر کردبوو. لە شانزە ساڵیدا دەیان کتێبی لەبەر کردبوو.

ئیبن مەندە لە هەشت ساڵیدا فەرموودەی وەرگرتووەو گێڕاویەتیەوە.

ئیبن ئەبیلفەروارسی فەرموودەناس لە هەشت ساڵیدا فەرموودەی وەرگرتووە.

ئیبنونەججار لە دە ساڵیدا فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ئیمامی بیرزالی فەرموودەناس لە هەشت ساڵیەوە فەرموودەی وەرگرتووە.

ئەبوونوعەیم لە تەمەنی هەشت ساڵیدا فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

ئیبن حەجەر لە نۆ ساڵیدا هەموو قورئانی لەبەرکردووە.

ئیبن عەبدولبەر لە پانزە ساڵیەوە فەرموودەی وەرگرتووەو گێڕاوەتەوە.

بۆیە جێی خۆیەتی ئێمەش ڕێزی کەمتەمەنەکانمان بگرین و بە چاوی کەم تەماشایان نەکەین، گوێیان بۆ بگرین، تەنانەت زۆرجار گوێیان لێبگرین، نەوەک بێباکانە گوێیان بگرین و بیانشکێنین.

[1] سیر أعلام النبلاء، ج٨، ص ٣٧٣.

## دەست بە دینەکەتەوە بگرە

گرنگترین شتێک کە مرۆڤ پێویستە لە ژیانیدا دەستی پێوەبگرێت، پاراستنی دینەکەیەتی، جەستەیەکی ساغ و سکێکی تێر و گیرفانێکی پڕ، چ بەهایەکی هەیە ئەگەر لەسەر حسابی لەدەستدان، یان کەلێنخستنە ناو دینەکەت بێت.

دین، واتە پەیامی خوا، مرۆڤیش ڕاسپێردراوە بە جێبەجێکردنی پەیامی خوا -بە فەرمان و ڕێگرییەکانیەوە- واتە دین دەبێت هەموو جومگەکانی ژیانت بگرێتەوە، ژیان و مردن بۆ خوا و بەو چەشنەی خوا دەیەوێت، ڕێنماییەکە کە خوای گەورە ئاراستەی بەندەکانی کردووە (قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنسُكِي وَمحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ).

شوێنکەوتوانی ئایینی خوا بە درێژایی مێژوو، لەپێناو دەستگرتنیان بە ئایینەکەیانەوە، نارەحەتی و ئەشکەنجەی هەمەچەشنەیان هاتوتەڕێ، بەڵام لە هەموو ئەوانە گرنگتر لەلایان، دەستبەرنەدان بووە لە پەیامی خوا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ڕوونی ڕێڕەوی خواناسانی پێشینمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: (كَانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يحْفَرُ لَهُ فِي الْأَرْضِ فَيُجْعَلُ فِيهِ فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ . وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ لحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ أَوْ عَصَبٍ وَمَا يَصُدُّهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ).[1] (کەسانی پێش ئێوە وابوون، کەسی وایان دەبرا چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنرا و دەخرایە ناویەوە، ئینجا مشاریان دەهێنا و لە سەریەوە بۆ خوارەوە دەیانکرد بە دوو لەتەوە، تووڵە ئاسن دەکرا بە نێوان گۆشت و ئێسقانیدا، کەچی ئەوە نەدەبوویە هۆی وازهێنانی لە ئایینەکەی).

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەپێناو دینەکەیاندا، ئامادە بون هەموو قوربانییەک

---

[1] صحيح البخاري، كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦١٢.

بدەن، دەستبەرداری داهات و سامان و خاک و شار و کەسوکاری خۆیان بن، ئەگەر بێتو هەریەک لەوانە ڕێگر بن لە پابەندبوون بە دینەکەیان.

کاتێک ژیانی هاوەڵان دەخوێنیتەوە، ئینجا جوان تێدەگەیت لەپێناو پاراستنی دینەکەیاندا چ قوربانیەکیان داوە، لە قۆناغی مەککەدا، دەیان بەسەرهاتی ئازار و ناڕەحەتییان کتێبەکانی مێژووی داگیرکردووە، چ وەک تاکە تاکەی هاوەڵان، چ وەک کۆی هاوەڵان بە جارێک کە خۆی دەبینیەوە لە گەمارۆی شیوی ئەبووطالیب.

بڕوانە نموونەی چەند هاوەڵێک کە لەسەر دینەکەیان ئازار دران، بەڵام ئامادە نەبوون دەستبەرداریی بن:

خەبابی کوڕی ئەرەت کاتێک موسڵمان بوو، بێباوەڕان زۆریان لێدەکرد وازبهێنێت لە دینەکەی، کەچی ئەو ئامادەیی ئەوەی نەبوو، جار هەبوو جلی ئاسنینیان دەکردە بەری و بە گەرمای مەککەدا دەیانبرد و لەبەر خۆر دایاندەنا، ئیتر گەرمای خۆر و گەرمبوونی ئاسن یەکیان دەگرت بۆ برژاندنی جەستەی.[1]

ئەو ژنەی کە خەببابی کڕیبوو ئاسنی گەرم دەکرد و سەری خەببابی پێ داخ دەکرد.[2]

جارێک عومەری کوڕی خەططاب خەببابی دانیشاند و وتی: لەم کۆڕەدا تەنها یەک کەس هەیە لە تۆ زیاتر شیاوی ئەم شوێنە بێت، خەبباب وتی: کێیە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ خەلیفە وتی: بیلال، خەبباب وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بیلالیش لە من لەپێشتر نیە، بیلال لەناو بێباوەڕاندا کەسێکی هەبوو کە بەرگرییەکی لێ بکات، بەڵام من کەسم نەبوو، ڕۆژێک منیان برد و ئاگرێکیان بۆ کردمەوەو لەناویدا تلیان دام، دواتر کەسێکیان قاچی خستە سەر سنگم، ئیتر ئەو زەوییەی بەو ئاگرە گەرم بووبوو بە

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.
[2] أسد الغابة، ج٢، ص ١٤١.

پشتی من سارد بوویەوە، ئینجا خەبباب پشتی خۆی هەڵکرد هەموو پێستی پشتی پەڵە و شوێن سووتاویی بوو.[1]

سومەییەش یەکێک بوو لەو ژنە هاوەڵانەی لەپێناو پاراستنی دینەکەی، گیانی خۆی بەخت کرد، ئەوەبوو کاتێک موسڵمان بوو، ئەبووجەهل لەسەر موسڵمانبوونەکەی زۆر ئازاری دەدا، جلی ئاسنینی دەکردە بەری و لەبەر گەرمای مەککەدا سزای دەدا، لەکاتێکدا سومەییە ئافرەتێکی پیری بە تەمەنی لاواز بوو.[2]

عوثمانی کوڕی عەففان دەڵێت: ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتبووم و دەچووین بەڕێدا، گەیشتینە لای عەممار و دایک و باوکی کە سزا دەدران، باوکی عەممار وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژگار ئاوایە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (خۆڕاگر بە)، پاشان فەرمووی (خوایە لە بنەماڵەی یاسیر خۆش بە).[3]

کاتێک یاسر و سومەییە و عەممار لەسەر ئیسلامەتییان سزا دەدران، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (صبرا یا آل یاسر، موعدكم الجنة).[4] (خۆڕاگر بن ئەی خێزانی یاسر، وادەتان بەهەشتە).

جارێک ئەبووجەهل کە سزای سومەییەی دەدا، هات و بە خەنجەرێک دای لە سکی و شەهیدی کرد.[5]

با تەماشایەکی بەسەرهاتی صوهەیبی ڕۆمیش بکەین:

کاتێک صوهەیب کۆچی کرد بۆ مەدینە، قورەیشییەکان کەوتنە شوێنی و ڕێیان پێگرت، ئەویش کەوانەکەی گرتەدەستی و وتی ئێوە دەزانن من لە تیرهاوێژیدا لە هەمووتان بەهێزترم، بەخوا تا خۆتان دەگەیەننە لام هەموو

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٦٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧١٢.
[3] مسند احمد بن حنبل، الرقم ٤٢٧، ضعفه أحمد شاكر، كما ضعفه شعيب الأرناؤوط.
[4] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٦٢٦، قال الألباني في فقه السيرة (١١١/١) حديث حسن صحيح.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧،ص ٧١٢.

ئەم تیرانەم تێدا تەواو کردون، دواتریش تا دەستم مابێت بەم شمشێرەی دەستم لەگەڵتان دەجەنگم، ئەگەر سامانەکەی منتان دەوێت، پێتان دەڵێم لە کوێیە، ئەوانیش وتیان دەی سامان و باخەکەت بدە بە ئێمە ئیتر وازت لێدێنین، صوهەیب بەڵێنی لێ وەرگرتن، ئینجا پێی وتن سامانەکەی لەکوێیەو خۆی چوو خۆی گەیاند بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) کە صوهەیبی بینی فەرمووی (مامەڵەکەت بردەوە ئەی ئەبوو یەحیا)، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضات الله و الله رؤوف بالعباد).[1]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا عەبدوڵای کوڕی حوزافە بەشداری هێرشێک بوو بۆ سەر ڕۆمەکان، بەڵام لە جەنگەکەدا بەدیل گیرا، ئینجا برا بۆ لای پاشاکەیان، وتیان ئەمە لە هاوەڵانی موحەممەدە، ئەویش وتی دەبیت بە مەسیحی و نیوەی سامانی خۆم بدەم بە تۆ؟ عەبدوڵا وتی ئەگەر چیت هەیە و چی موڵکی هەموو پاشایانی عەرەب هەیە بیدەیت بە من، هێندەی چاوتروکانێ وازناهێنم لە ئایینەکەی موحەممەد، پاشاکە وتی دەی دەتکوژم، ئەویش وتی چی دەکەیت بیکە، ئەوەبوو فەرمانی کرد و لەخاچ درا، پاشان بە تیرهاوێژەکانی وت تیرەکە بدەن لە نزیکی جەستەی و مەیکوژن، زوو زوو پێی دەوت دەبیت بە مەسیحی؟ ئەویش ڕازی نەدەبوو، ئینجا لەسەر خاچەکە دایانگرت و مەنجەڵێکی گەورە ئاوی کوڵاویان هێنا، دوو دیلی موسڵمانانی بانگ کرد و هێنران، فەرمانی کردو یەکێکیان خرایە ناو مەنجەڵەکەوە، ئینجا بە عەبدوڵای وت: دەبیت بە مەسیحی؟ ئەویش وتی: نابم، هاوکات دەگریا، بە پاشا وترا ئەو گریا، بۆیە وایزانی ترساوە، وتی بۆچی دەگریت، عەبدوڵا وتی: من یەک گیانم هەیە دەرچێ، خۆزگە هێندەی تاڵەکانی سەرم گیانم هەبوایەو هەموویان لەپێناو خوادا دەخرانە ناو ئاگر، پاشا وتی: ئامادەیت سەرم ماچ بکەیت و ئازادت بکەم؟ عەبدوڵا وتی: ئەگەر

[1] المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٣٦١٤.

هەموو دیلەکان ئازاد بکەیت بەڵێ، پاشا وتی بەڵێ، ئەویش سەری ماچ کرد و دیلەکانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ لای عومەر و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد، خەلیفەش وتی: ئەرکی سەرشانی هەر موسڵمانێکە سەری عەبدوڵا ماچ بکات و وا منیش خۆم دەست پێدەکەم، ئەوەبوو سەری عەبدوڵای ماچ کرد.[1]

ئەمانەی باسکران، مەبەست پێیان ئەوەیە نیە موسڵمان خۆی بخاتە بەر ناڕەحەتی و چەرمەسەریی، چونکە هەڵەتێگەیشتنێک لای هەندێک موسڵمان پەیدابووە، پێی وایە دەبێت موسڵمان لە ناڕەحەتی و ناخۆشیدا بژی، نەخێر، پێشەوامان ڕێنموونی کردوین، ئاوات بە سەختی و ناڕەحەتی و بەرەنگاربوونەوەی دوژمن نەخوازین (لَا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَسَلُوا اللهَ الْعَافِيَةَ فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا)،[2] (ئاوات بەوە مەخوازن بەرەورووی دوژمن ببنەوەو داوای سەلامەتی لە خوا بکەن، بەڵام ئەگەر بەرەورووی دوژمن بوونەوە، خۆڕاگر بن و پشت هەڵمەکەن).

## ملکەچی حەق بە

حەق و ڕاستی، ئەو مەبەستەیە کە موسڵمان دەبێت بەدوایدا بگەڕێت، هەوڵ بدات بەدەستی بهێنێت و هەر هۆکارێکیش لەخۆی دووربخاتەوە کە دەبێتە مایەی ئەوەی لە حەق کلای بکات، تەنانەت ئەگەر بە ڕووکەش بە زیانی خۆیشی شکایەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ)، (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، بە دادپەروەری هەستن بۆ ئەنجامدانی کاری مەردوم، هەمیشەش شایەتی لەسەر حەق بدەن بۆ خوا، ئەگەرچی ئەو شایەتیەش بە زیانی خۆتان و دایک و باوک و خزمانیشتان بێت).

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٤.

[2] صحيح البخاري، كتاب الجهاد والسير - باب كان النبي إذا لم يقاتل أول النهار أخر، الرقم ٢٩٦٦.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرمەشقێکی باش بوو بۆ هاوەڵان لە نموونەی واقیعیی ملکەچبوونی بۆ حەق، بە چەشنێک سوێندی دەخوارد ئەگەر فاطیمەی کچی خۆیشی دزی بکات، دەستی دەبڕێت و چاوپۆشیی لێ ناکات.[1]

زەیدی کوڕی حەسنە دەڵێت: کاتێک سەیری موحەممەدم کرد، چی ئاماژەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەبوو لە دەموچاوی موحەممەددا بەدیم کرد، تەنها دوو نیشانە نەبێت، ئەوانیش بریتی بوون لەوەی کە دەبوو لەسەرخۆیی و داناییەکەی پێش نەزانی بکەوێت و نەفامی نواندن بەرامبەری دانایی و نەرمونیانی ئەو زیاتر بکات، منیش نەرمیم لەگەڵ دەنواند و خۆم لێ نزیک دەکردەوە بۆ ئەوەی تێکەڵیی بکەم و بزانم ئەو نیشانەی تێدایە، ئەوەبوو جارێک پێغەمبەر(ﷺ) لە ژوورەکەی دەرچوو و عەلی کوڕی ئەبووطالیبیشی لەگەڵدا بوو، کابرایەکی دەشتەکی هات بۆ لای و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەڵکی فڵانە گوند موسڵمان بوون و منیش وتوومە ئەگەر موسڵمان بن بەردەوام ڕۆزییان بۆ دێت، کەچی لەو کاتەوەی موسڵمان بوون قات و قڕی و نەبوونی ڕووی تێکردون و باران نابارێت بۆیان، منیش ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەترسم بەو بۆنەیەوە واز لە ئیسلام بهێنن، بەڵکو کەسێک بنێریت فریایان بکەوێت، پێغەمبەریش(ﷺ) تەماشای کابرایەکی کرد کە لەوێدا بوو وابزانم عومەر بوو، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ شتێکی لێ نەماوە، منیش لێی نزیک بوومەوەو وتم ئەی موحەممەد پێت چۆنە بڕێ خورمای باخی فڵانە کەسم لێ بکڕیت تا فڵانە ڕۆژ ئینجا بەهاکەی وەرگرم لێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نا ئەی کابرای جوولەکە، من بڕێ خورمای دیاریکراوت لێ دەکڕم تا فڵانە کات و ناوی باخی فڵانە کەس نابەم)، منیش وتم باشە، پێغەمبەر(ﷺ) خورماکەی لێ کڕیم و ناردی بۆ ئەو خەڵکەو فەرمووی (خێرا بڕۆ بۆ لایان و بەوە فریایان بکەوە)، هێشتا چەند ڕۆژێک مابوو بۆ

[1] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب حدثنا أبو اليمان، الرقم ٣٤٧٥.

ماوەکە، دوو یان سێ ڕۆژ مابوو، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەسپەردەکردنی تەرمی کابرایەکی پشتیوانی هاودەم بە ئەبووبەکرو عومەر و عوثمان و دەستەیەکی تر لە هاوەڵانی دەرچوو، دوای ئەوەی نوێژی لەسەر تەرمەکە کرد، لە دیوارێک نزیک بوویەوەو پاڵی پێوەدایەوە، منیش جلەکانم کۆکردەوەو بە دەموچاوێکی گرژەوە تەماشام دەکرد، دواتر وتم ئەی موحەممەد ئەرێ مافەکەی خۆمم نادەیتەوە؟ من پێشتر تێکەڵی بنەماڵەی ئێوەم کردووەو نەمدیوە ئاوا دەستخەڕۆی کەس بکەن، ئینجا تەماشای عومەری کوڕی خەططابم کرد بینیم چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسک و فرمێسک بەسەر کولْمیەوەیەتی، بە خیسەیەکەوە تەماشای کردم و وتی ئەی دوژمنی خوا چۆن قسەی وا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڵێیت؟ سوێند بەوەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە حەق ناردووە ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە بەم شمشێرەم دەمدا لە گەردنت، پێغەمبەریش(ﷺ) بە هێوری تەماشایەکی عومەری کرد و فەرمووی: (إِنَّا كُنَّا أَحْوَجَ إِلَى غَيْرِ هَذَا مِنْكَ يَا عُمَرُ : أَنْ تَأْمُرَنِي بِحُسْنِ الْأَدَاءِ ، وَتَأْمُرَهُ بِحُسْنِ التِّبَاعَةِ ، اذْهَبْ بِهِ يَا عُمَرُ فَاقْضِهِ حَقَّهُ ، وَزِدْهُ عِشْرِينَ صَاعًا مِنْ غَيْرِهِ مَكَانَ مَا رُعْتَهُ)، (ئەی عومەر ئێمە پێویستمان بە هەڵوێستی تری تۆ هەیە، دەبێت فەرمانم پێبکەیت چاک قەرزەکەم بدەمەوەو فەرمان بەویش بکەیت بە جوانی داوای قەرزەکەی بکاتەوە، ئەی عومەر بیبە و مافەکەی بدەرەوە و بیست صاعیش زیاد لەوەی بدەرێ لەبەرامبەر ئەوەی وا ترساندت)، ئینجا عومەر منی برد و قەرزەکەی دامەوەو بیست صاعیش زیادەی پێدام، منیش وتم ئەو زیادەیە چیە؟ وتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردم تا بەرامبەر بەوەی تۆم ترساند ئەم زیادەت بدەمێ، منیش وتم ئەی عومەر من دەناسیت؟ وتی نا، تۆ کێیت؟ وتم من زەیدی کوڕی سەعنەم، وتی: زانا جوولەکەکە؟ وتم بەڵێ، وتی ئەی بۆچی وات وت بە پێغەمبەر(ﷺ) و وا لەگەڵیدا هەڵوێستت نواند؟ وتم: ئەی عومەر من چی ئاماژەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەبوو لە

دەموچاوی موحەممەددا بەدیم کرد، تەنها دوو نیشانە مابوو، ئەوانیش بریتی بوون لەوەی کە دەبوو لەسەرخۆیی و داناییەکەی پێش نەزانی بکەوێت و نەفامی نواندن بەرامبەری دانایی و نەرمونیانی ئەو زیاتر بکات، بۆیە بۆ ئەو دوانە هەوڵمدا تا بزانم ئەوانەشی هەیە؟ دەی عومەر تۆ بەشایەت دەگرم وا من ڕازیم خوا پەروەردگارمەو ئیسلام ئایینمەو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، بەشایەتت دەگرم نیوەی سامانەکەم دەکەم بە خێر بۆ ئوممەتی موحەممەد(ﷺ)، عومەر وتی بڵێ بۆ بەشێک لەو ئوممەتە چونکە فریای هەموو ئەو ئوممەتە ناکەویت، منیش وتم بەشێک لەم ئوممەتە، ئینجا عومەر و زەید پێکەوە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر خوا(ﷺ) و زەید لە خزمەتیدا شایەتومانی هێنا، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و بەشداری چەندین غەزای کرد، دواجار لە غەزای تەبووکدا لە ڕێی هاتنەوەیاندا کۆچی دوایی کرد.[1]

ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرفەتی ئەو پیاوەی نەدایە قسەی دڵی بکات و بە زبریی وەڵامی بدایەتەوەو بیفەرموایە من پێغەمبەری خوام و هەتا ئێستا جگە لە حەق هیچم لێ نەبینراوە، ئەمەی تۆ ناوزڕاندنە، بوختان و سووکایەتییە، سنووربەزاندنە .. هتد، ئەم جۆرە دەستەواژانەی کە هەرکام لە ئێمە لەوکاتەی خۆمان بە حەق دەزانین، لە هەڵوێستێکی لەو چەشنەدا پەنایان بۆ دەبەین، دەبوو چی ڕوویبدایە؟

هیچکات هەوڵ مەدە بڕیار لەسەر حەقبوون و ناحەقبوون بدەیت، هەتا جوان لێی نەکۆڵیتەوەو نەگەیتە ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە، چونکە زۆرجار هەڵچوون و هەڵەشەیی مرۆڤ دووچاری بڕیاری هەڵە و پێچەوانە بە حەق دەکات، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ

[1] صحيح ابن حبان، الرقم ٢٨٧، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٥٨٨، قال الحافظ ابن حجر في الإصابة: رجال الإسناد موثوقون.

الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ)،[1] (ئازایەتی و پاڵەوانێتیی بە هێزی بازوو و بردنەوەی زۆرانبازیی نیە، بەڵکو بەهێز و پاڵەوان ئەو کەسەیە کە لە کاتی توورەییدا جڵەوی خۆی لەدەست دەمێنێت).

دەزانیت لای خوا چەند بێزراون ئەو کەسانەی کە لە کاتی ناکۆکیی و کێشە و گرفتدا، نکوولیی لە حەق دەکەن؟ دایکی باوەڕداران عائیشە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الْأَلَدُّ الْخَصِمُ)،[2] (بێزراوترینی خەڵک لای خوا ئەو کەسەیە کە لە کاتی ناکۆکیی و کێشە و گرفتدا مل بۆ حەق نادات و ملەجیرە و نکوولی دەکات).

هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە بون هەرکات کێشەیەکیان هەبووبێت، ملکەچیی خۆیان بۆ حەق نیشان بدەن و بچنە بەردەم دادگای شەرعیی، بڕیاری دادگا هەرچییەک بووبێت پێوەی پابەند بون، ئەمە تەنها نموونەی هاوەڵانێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو گەورە هاوەڵانیش کە لە لووتکەی دەسەڵاتدا بون، ئەمەیان جێبەجێ کردووە، لەوانەش (ئەبووبەکری صدیق، عومەری کوڕی خەططاب، عەلی کوڕی ئەبووطالیب، عەمری کوڕی عاص، موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان).

شەعبی دەڵێت: جارێک ئوبەی لەگەڵ عومەری کوڕی خەططابدا کێشەیەکی هەبوو، ئەوکات عومەر خەلیفە بوو، ئوبەی وتی: عومەر جا تۆ خۆت دەسەڵاتداریت، عومەر وتی: دەی با کەسێک ببێتە دادوەری نێوانمان، ئوبەی وتی: با زەید بێت، ئەوەبوو چوون بۆ لای زەید و ئەویش دادوەری لەنێوانیاندا کرد، زەید وتی: ئەی ئوبەی بەڵگەت چیە؟ ئەویش وتی هیچ بەڵگەیەکم پێ نیە، زەید وتی دەی دەرفەت بدە با ئەمیری باوەڕداران سوێند نەدەم، عومەر وتی: ئەگەر بە پێویستی دەزانیت، ڕێ مەدە ئەمیری باوەڕداران ئەو سوێندە نەخوات.[3]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الأدب - باب الحذر من الغضب، الرقم ٦١١٤.

[2] صحيح البخاري - كتاب المظالم - باب قول الله تعالى وهو ألد الخصام، الرقم ٢٤٥٧.

[3] الذهبي: سير أعلام النبلاء، ط الحديث، ج٤، ص ٧١.

عوسمانی کوڕی عەففان دەیوت: (ئەگەر بینیتان لە کتێبی خوادا وا هاتووە کە کۆت بکەنە قاچەکانم، ئەوە بیکەن).[1]

عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە خەلیفە بوو، جارێک چوویە بازاڕ و بینی کابرایەکی جوولەکە قەڵغانێک دەفرۆشێت، قەڵغانەکەی ناسیەوەو زانی ئەوەی خۆیەتی، پێی وت: ئەوە قەڵغانەکەی منە، ئەوەبوو ڕێک نەکەوتن هەتا دواجار خەلیفە پێشنیاری کرد بچن بۆ دادگا و دادوەر مەسەلەکەیان بۆ یەکلا بکاتەوە.[2]

مەرج نیە هەرکات حەق بوویت، دەرفەت بە بەرامبەر نەدەیت قسەی خۆی بکات، یان بڕیاری خۆی بدات، نەکەیت کەشێکی وا بڕەخسێنیت کە بەرامبەر دەمکوت بکەیت و لە ترسی پەرچەکرداریی تۆ، نەتوانێت قسەی دڵی بکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێندە کەشی بۆ هاوەڵانی ڕەخساندبوو قسەی دڵی خۆیان بکەن، هەیانبوو داوای تۆڵەسەندنەوەی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد بەرامبەر بە قامچیەک کە بەر سکی کەوتووە، تەنانەت جار هەبوو بە کۆمەڵ گومانێکیان بۆ دروست دەبوو، بەڵام ترسیان نەبوو ئەگەر بیدرکێنن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆمەتباریان بکات بە دووڕوویی، ئیمان لاوازیی، خراپی، جوانترین نموونەش گلەیی پشتیوانان بوو لە دابەشکردنی دەستکەوتەکانی حونەیندا کە ڕاشکاوانە قسەی دڵیان کرد، کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) بابەتەکەی بۆ ڕوونکردنەوە، ڕازیی بوون.

مل نەدان بۆ حەق، چەند ئەنجامێکی خراپی لێدەکەوێتەوە، لەوانەش:

خۆبەزلزانین و سەرسام بوون بە عەقڵ و بڕیار و بیرکردنەوەی خۆت.

نەشونماکردنی بەدگومانی نێوان کەسەکان و بڕیاردانی یەکلایەنە لەسەر یەک بە دیوە نەرێنییەکەی.

دروستبوونی ڕق و یەکتر نەخوێندنەوەو لێکترازانی برایەتیی و خۆشەویستیی.

---

[1] مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٠٨.

[2] السنن الكبرى للبيهقي، كتاب آداب القاضي - باب إنصاف الخصمين، الرقم ٢٠٥٢٨.

بێزراوبوونی کەسەکە لای خوا و تاوانباربوونی و هەنگاونانی بەرەو ڕێی دۆزەخ.

دواجار هەرکات لە پرس و بابەتێکدا لەگەڵ کەسێک تێکگیرایت، ئەو وتەی عەلی کوڕی ئەبووطالیب لەبیر مەکە کە دەیوت (لە بوغزاندنی بەرامبەردا سنووریک زۆر مەڕۆ، چونکە لەوانەیە ڕۆژێک بێت ببێتە خۆشەویستێکت).[1]

## دەروونبەزیو مەبن

ئەمڕۆ کە ئوممەتی ئیسلامیی لە ڕووی هێز و دەسەڵاتی سیاسیی و سەربازیی و ئابوورییەوە لاوازە، موسڵمانانێکی زۆر دەبینین بەهۆی ئەم کەلێن و شکستانەوە، دەروونبەزیوانە مامەڵە دەکەن، هەردەم خۆیان پێ کەم و بەرامبەرەکانیان پێ گەورە و پێشڕەوە، لە ئاست فشە و بریق و باقی نەیارانی ئیسلام، یاخود ناموسڵماناندا، هەست بە کەمیی خۆیان دەکەن، بەوەشەوە ناوەستن، بەڵکو زۆرجار بەناوی دڵسۆزیی بۆ ئیسلام و موسڵمانان، دەکەونە وێزەی موسڵمانان و تانەدان لەم ئوممەتە و ناساندنی وەک ئوممەتێکی دۆڕاو و دواکەوتوو، بەناوی دادپەروەرییەوە، بە شان و باڵی بەرامبەردا هەڵدەدەن، چاو لە خراپەکانیان دادەخەن، یان زۆر بڕۆن، ئەوەیە کە هەڵە و پەڵەکانیان بە بچووک و لاوەکیی تەماشا دەکەن، وای وێنا دەکەن کەلێن و کەموکورتییەکانیان لە چاو دەستکەوت و جوانییەکانیاندا پەڵەی ڕەشی سەر دیواری سپین، بە پێچەوانەوە، هەڵە و کەموکورتییەکانی موسڵمانان، وەک کەفی دەریا زۆر و بەرچاو نیشان دەدەن و جوانی و تایبەتمەندییەکانیشان بە بچووک وێنا دەکەن، یاخود جاری وا هەیە گومان دەخەنە سەر ئەو تایبەتمەندییانەش، بە بەسەرچوو، یان بابەتگەلێک وێنایان دەکەن کە بەدیلیان هەبێت، ئا ئەم جۆرە کەسانە دەروون بەزیون.

---

[1] جامع الترمذي – باب ما جاء في الاقتصاد في الحب والبغض، الرقم ١٩٩٧.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی بەم چەشنە پەروەردە نەدەکرد، ئەگەر هەر هاوەڵێکیش پێشرەویی ماددی و ڕووکەش و خۆشییەکانی دنیای بە پێوەری پێشکەوتن و سەروەریی تەماشا بکردایە، خێرا پێغەمبەر(ﷺ) تێڕوانینەکەی بۆ ڕاست دەکردەوە، تێیدەگەیاند بالاترین شت ئازادی و سەربەستیی عەقڵ و هۆشە، بوونی بیروباوەڕێکی دروستە، تێگەیشتنە لە واتا و مەبەستی ژیان و مردن، کەرەستە و بەردەستییەکانی ئەم ژیانەش کاتێک بەهایان هەیە کە مرۆڤ بێبەش نەکەن لە هۆش و ئاوەزی دروست.

عومەری کوڕی خەططاب دەڵێت: جارێک چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لە ژوورە بچووکەکەیدا بوو، ژوورێک کە بە پلیکانەیەک بۆی سەردەکەوتیت، بینیم لەسەر حەسیرێک ڕاکشابوو، سەرینێکی لە پێستەخۆشکراوی لەژێر سەری دانابوو، دەمبینی حەسیرەکە بەسەر جەستەیەوە شوێنەواری جێهێشتبوو، ئیتر چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بۆچی دەگریت؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن نەگریم کە ئاوا دەتبینم، لەولاشەوە قەیسەرو کیسرا دەبینم چییان هەیە، تۆش پێغەمبەر و هەڵبژێردراوی خوایت و ئەوەش حاڵتە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمَا الدُّنيَا ، وَلَكَ الْآخِرَةُ) (یانی بەوە ڕازیی نابیت ئەم دنیایە بۆ ئەوان بێت و ئاخیرەتیش بۆ ئێمە بێت؟).[1]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لە مەککەدا بانگەوازیی دەکرد، هاوەڵانی وا فێردەکرد کە ئەوان لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی هەنگاویان هەڵناوە، لە نەزانییەوە ڕووەو زانایی چون، لە خراپەوە دەستیان داوەتە چاکە، ئەوان دەستیان لە بت و داروبەرد هەڵگرتووەو ئێستا الله ئەپەرستن و ئەدوێنن، پشت بەو دەبەستن و مامەڵەیان لەگەڵ ئەوە، ئەوان عەیبەیەکیان بەسەردا نەهاتووەو بە ناچاریی بەرگەی تانەوتەشەری خەڵک بگرن، بەڵکو ئەرکی سەرشانیانە هەموو مرۆڤایەتیی لە گومڕاییەوە بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنموونی

[1] صحيح البخاري، كتاب تفسير القرآن - سورة المتحرم - باب تبتغي مرضاة أزواجك، الرقم ٤٧١٤.

بکەن، بە چاوی ڕەحم و بەزەییەوە بڕواننە جگە لە خۆیان، وەک چۆن کەسێک دەبینێت خەڵکێک بەرەو چاڵاوێکی ئاگرین هەنگاو هەڵدەنێن و چاویان لە چاڵاوەکە نیە، ئەمیش بینا و بەرچاوڕوونە، سەربەرزانە هەوڵ دەدات ئەوانی دی ڕزگار بکات، ئەم متمانەبوونە بە خود، پاڵنەری هاوەڵان بوو هەتا بێ دوودڵیی بانگەواز بۆ پەیامەکەیان بکەن و لە ماوەی کەمتر لە سێ دەیەدا دوو ئیمپراتۆریەتی ساسانی و بیزەنتیی بەچۆکدا بهێنن.

کاتێک لە خیلافەتی ڕاشیدیندا موسڵمانان لە جەنگدا بوون لەگەڵ ساسانییەکاندا، سەعدی سەرکردەی سوپای موسڵمانان ناردی بە شوێن چەند هاوەڵ و کەسایەتییەکی ناو موسڵماناندا، کە هاتن، پێی وتن: دەمەوێت بتاننێرم بۆ لای ئەو خەڵکە -ساسانییەکان-، ئەمەوێ هەڵوێستتان بزانم، ئەوانیش یەکدەنگ وتیان: چ فەرمانێکمان پێ بکەیت جێبەجێی دەکەین .. سەعدیش وتی: دەی بڕۆن و خۆتان ئامادە بکەن، ربعی کوڕی عامیر کە هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، وتی: عەجەمەکان داب و دەستوورێکی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەگەر ئەو هەمووە پێکەوە بچین، وادەزانن ئێمە بە گەورە تەماشایان دەکەین و بایەخی زۆریان بۆ دادەنێین، پێم باشە تەنها یەک کەس بنێریت بۆ لایان، ڕێ بدەن با تەنها من بچم، ئەوەبوو ڕۆیشت و گەیشتە لای سەربازگەکەی ڕۆستەمی سەرکردەی سوپای ساسانی، پاسەوانەکانی سەر پردەکە ڕایانگرت و هەواڵیان نارد بۆ ڕۆستەم، ئەویش ڕاوێژی کرد بە گەورە سەرکردەکانی دەوری خۆی، پێی وتن: پێتان وایە هاتنەکەی بە کەم بگرین یاخود شکۆ و گەورەیی خۆمان لەبەرچاوی نیشان بدەین؟ ئەوانیش پێشنیاری دووەمیان پەسەند کرد، شوێنەکەیان بە جوانترین شێوە ڕازاندەوە، ڕاخەری زێڕینیان بۆ ڕۆستەم دانا، پشتیەکەشی زێڕ بوو، ئینجا ڕێیان دا بچێتە ژوورەوە، ربعیش بە شمشێرێک و جلێکی پینەکراو و

سەروسیمایەکی هەژارانەوە چوویە ژوورەوەو لەسەر زەوییەکە دانیشت، پێی وتن: ئێمەو مانان پێمان خۆش نیە لەسەر ئەو جێ و بانە ڕازاوەی ئێوە دانیشین، خێرا بردنیە ناو ئەسڵی مەسەلەکەوە، ڕۆستەم پێی وت: بۆچی هاتون؟ ئەویش وتی: خوای گەورە ئێمەی ناردووە هەتا بەندەکان لە بەندەپەرستییەوە دەربکەین و بەرەو خواپەرستییان بەرین، لە ستەمی ئایینەکانی ترەوە بیانبەینە ناو دادپەروەریی ئیسلامەوە، هەرکەس ئەمەمان لێ قبووڵ بکات، پەسەندە، هەرکەسیش ڕێگر بێت جەنگی لەگەڵ دەکەین هەتا ئەگەینە ئەوەی خوا بڕیاری لەسەرداوە، ڕۆستەم وتی: بەڵێنی بڕیاردراوی خوا چیە؟ ئەویش وتی: بەهەشت بۆ ئەو موسڵمانەی لەو جەنگەدا دەکوژرێت و سەرکەوتنیش بۆ ئەو موسڵمانەی لە جەنگەکەدا سەردەکەوێت، ڕۆستەم هەڵوێستەیەکی کرد و وتی: ئەتوانن کەمێک بوەستن هەتا هەردوولامان بیرێکی زیاتری لێ بکەینەوە؟ ربعی وتی: ئێمە سێ ڕۆژ زیاتر چاوەڕێ ناکەین، ئینجا ربعی ڕۆیشت و ڕۆستەم کۆبوونەوەیەکی تایبەتی بە سەرکردەکان ئەنجامدا و پێی وتن: هەرگیز قسەیەکی لەمە ڕوونتر و عیزەتمەندانەترتان بیستووە؟ ئەوانیش وتیان: پەنا بەخوا ئەگەر بەتەما بیت بابدەیتەوە بەلای شتی وادا و دەست لە ئایینی خۆت هەڵبگریت بۆ ئەو سەگە، بۆ جلوبەرگەکەیت نەبینی؟ ڕۆستەمیش وتی: ماڵوێرانینە، چاو مەبڕنە جلەکانی، چاوتان لە ڕاوبۆچوون و قسەکانی بێت، ئەمجار ڕۆستەم هەوڵیدا نوێنەرێکی تری موسڵمانان تاقی بکاتەوە، سەعد ئەمجارەیان حوزەیفەی کوڕی محصنی نارد، ئەویش هەمان قسە و هەڵوێستی ربعی هەبوو، ڕۆستەم وازی نەهێنا و داوای نوێنەرێکی تری کرد، سەعد ئەمجارەیان موغیرەی کوڕی شوعبەی نارد، ڕۆستەم کەوتە وەسفی پێشکەوتنی ماددی و سەربازیی خۆیان و بەکەم باسکردنی موسڵمانان لەو ڕوانگانەوە، کە

لە قسەکانی لێبوویەوە، ئینجا موغیرە قسەی کرد و وتی: نکووڵی لەو قسانەی تۆ ناکەین کە خۆت و خەڵکی وڵاتەکەت لە چ پێشڕەوییەکدان و وڵاتتان لە چ ئاستێکدایە، نکووڵی لە وەزعی خۆشمان ناکەین، بەڵام بابەتەکە بەو چەشنە نیە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە، بەڵکو خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین هەتا بەندەکان لە بەندەپەرستییەوە دەربکەین و بەرەو خواپەرستییان بەرین، لە ستەمی ئایینەکانی ترەوە بیانبەینە ناو دادپەروەریی ئیسلامەوە، هەرکەس ئەمەمان لێ قبووڵ بکات، پەسەندە، هەرکەسیش ڕێگر بێت جەنگی لەگەڵ دەکەین هەتا ئەگەینە ئەوەی خوا بڕیاری لەسەرداوە، جا ئەتوانیت ببیتە کۆیلەیەکمان و سەرکزانە سەرانە بدەیت، ئەگەرنا ئەوە شمشێر یەکلای دەکاتەوە.[1]

کاتی خۆی بێباوەڕان هەموو شانازیی خۆیان بەرتەسککردبوویەوە لە پێشڕەویی ماددی و بوارە فیزیکیەکانی ژیاندا، هاوەڵانیش شانازیی خۆیان خستبوویە ئایین و بیروباوەڕەکەیانەوە، کاتێک بەریەککەوتن لەنێوانیاندا ڕوویدا، بێباوەڕان بە کەرەستە و هێزی بەردەستیانەوە لەبەردەم ئایین و بیروباوەڕی هاوەڵاندا شکستیان خوارد و ئەوەشی هەیانبوو لەدەستیاندا، هاوەڵانیش هەم بیروباوەڕ و ئایینەکەیان بۆ مایەوە، هەم پێشڕەوییە دنیاییەکەشیان بەدەستهێنا و برەوی زیاتریان پێدا هەتا جڵەوی پێشڕەویی زانستیی و دنیای فیزیکیش کەوتە دەست موسڵمانان، ئەمڕۆ هەمان حاڵەت لای بێباوەڕان هەیە، بەڵام گرفتەکە لای موسڵمانانە کە زۆر سەرکزانە و دوورلەمتمانەبەخۆبوون و شەرمنانە دەستیان داوەتە دینەکەیان، هەڵوەدای ئەوەیانە بێباوەڕان لە خۆیان ڕازیی بکەن، شاگەشکە ئەبن تەنها بەوەی بەرامبەرەکەیان دینەکەیان بە سووک و ئەفسانە و دواکەوتوویی وەسف نەکات، بۆیە هەمان ئەنجامی پێشوو نایەتەوە دەست.

[1] المنتظم في تأريخ الملوك و الأمم، ج٤، ص ١٦٨-١٦٩.

## سەربەرزانە بمرە

هیچ مرۆڤێک بۆ هەمیشە لەم دنیایەدا ناژی، هەموان دەبێت مەرگێک بچێژین کە خوای گەورە بەڵێنی لەسەر داوە، وەک دەفەرموێت (كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ)، جا هەوڵ بدە سەرڕاستانە بژیت و دروست هەنگاوەکانی ژیانت هەڵنێ هەتا سەربەرزانە بمریت، چونکە یەکەم قۆناغی پێخستنە نێو ژیانی ئاخیرەتت لە مەرگتەوە دەست پێ دەکات، ئیدی دەرگای کردەوەکانت دادەخرێن و بەو تۆمارەی ژیانی دنیات، بڕیار لەسەر ژیانی هەتاهەتاییت دەدرێت، بەهەشت یان دۆزەخ، دوو شوێنن کە چاوەڕوانیت دەکەن.

هەرکەس خواناسانە ژیابێت، سەرەمەرگێکی باشی بەنسیب دەبێت، هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) لەم بوارەدا نموونەی باڵان، ئەوان بەو چەشنە ژیان خوایان لە خۆیان ڕازیی کرد، بۆیە بێ ترس و سەربەرزانە ساتەوەختی گەڕانەوەیان بۆ لای خوای گەورە بەڕێکرد، بۆ ئەمەش لەبری ئەوەی قسەی خۆمتان بۆ بکەم، پێم خۆشە بچینە خزمەت ساتەوەختی سەرەمەرگی چەند هاوەڵێک.

فاطیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) پێش مردنی تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو، لەو کاتەشدا خەمی ئەوەی بوو کە چۆن ببرێت بەرەو گۆڕستان و جەستەی نەکەوێتە بەرچاوی خەڵکانی نامەحرەم، ئەوەبوو کاتێک ئەسمائی کچی عومەیسی لابوو، بە ئەسمائی وت چەندە پێی ناخۆشە بە قوماشێکەوە ببرێت و جەستەی دەربکەوێت؟ ئەسمائیش وتی: بەخوا دارەمەیتێکت بۆ دروست دەکەم وەک ئەوەی کە بینیم لە حەبەشە دروست دەکرا، فاطیمەش وتی ئادەی نیشانم بدە چۆنە، ئەویش بۆی دروست کرد، فاطیمەش پێکەنی، ئەوەش تاکە پێکەنینی بوو پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ).[1]

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٤٧١٢،

حەسەنی کوڕی عەلی لە سەرەمەرگیدا وتی بمبەنە دەرەوە با ئاسمانم لێوە دیار بێت، بردیانە دەرەوە، سەیرێکی ئاسمانی کرد و وتی: خوایە من لای تۆ چاوەڕێی پاداشتم.[1]

حوسەینی برای بەسەرسەریەوە بوو، حوسەینیش بە دڵگرانیەوە ئەیوت برا ئازیزەکەم خۆ تۆ وا دەچیت بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ)-باپیرەمان- و عەلی -باوکمان- و خەدیجە-ی داپیرەمان- و فاتیمە-ی دایکمان- و قاسم و طاهیری خاڵوانت و حەمزەو جەعفەری مامت، حەسەنیش پێی وت ئاای برا ئازیزەکەم، وا دەچمە حاڵێکەوە کە خوا داینـاوە هیچکات حاڵی لەو جۆرەم نەدیوە، بڕێ دروستکراوی خوا ئەبینم کە هیچکات شێوەی وەک ئەوانەم نەدیوە، ئیتر حوسەین خۆی پێ ڕانەگیرا و دەستی کرد بە گریان.[2]

سەلمانی فارسی لە سەرەمەرگیدا بوو کە ژنەکەی خۆی بانگ کردە ژوورەکەی، ژوورەکەی لە بەرزاییەکەوە بوو و چوار دەرگای هەبوو، وتی ئەو دەرگایانە بکەرەوە، چونکە ئەمڕۆ میوانم دێت، نازانم لە کام دەرگاوە دێن، ئینجا داوای میسکی کرد و وتی بیکەرە کەمێک ئاو و بیڕژە بە دەوری جێگەکەمدا، ژنەکەی دەڵێت: دواتر چوومەوە بۆ لای دەبینم گیانی سپاردبوو.[3]

سەلمان ئەو بۆنی میسکەی بە دەستکەوتی غەزا دەستکەوتبوو و هەڵیگرتبوو بۆ کاتی مەرگی، دەیوت فریشتەکان دێن بۆ لام، ئەوان نان ناخۆن، بەڵام بۆن دەکەن.[4]

خالیدی کوڕی وەلید لە سەرەمەرگیدا دەگریاو قسەی دەکرد بۆ ئەوانەی کە لەلای بوون و دەیوت: لەم سەرزەویەدا هیچ شتێک نیە هێندەی ئەوە

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٤٣.
[2] تأريخ دمشق، ج١٣، ص ٢٨٦.
[3] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٥٥٣.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٩٢-٩٣.

لام خۆشەویست بێت کە لە شەوێکی سارددا لە ناو دەستەیەکی سوپای کۆچەراندا بم کە بەرامبەر دوژمن لە چاوەڕوانی جەنگدان، دەی گرنگی بدەن بە جیهاد.[1]

حەسرەتی ئەوەی بوو کە شەهیدیی بە نسیب نەبووە و دەیوت: لە ئەوەندە جەنگدا بەشداریم کرد، جەستەم بستێکی بێ برینی پێوە نەماوە، یان شمشێری بەرکەوتووە یان ڕم یان تیر، کەچی وا لەسەر جێگەکەم دەمرم.[2]

با دواجار تەماشایەکی حاڵەتی وەفاتی خوبەیب بکەین، بزانین ئەم هاوەڵە حاڵەتی وەفاتی چۆن بوو:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دە کەسی لە هاوەڵانی بە سریەیەک نارد، عاصیمی کوڕی ثابتی ئەنصاری کرد بە ئەمیریان، کە گەیشتنە ناوچەیەکی نێوان عوسفان و مەککە، دەستەی بەنوولیحیان بە نزیکەی دووسەد کەسەوە هاتن و کەوتنە شوێنیان، کە گەیشتنە شوێنەکەیان بینییان ناوکی خورما جێماوە، وتیان: ئەم ناوکە هی خورمای مەدینەیە، بۆیە کەوتنە شوێنیان، کاتێک عاصیم و هاوەڵەکانی ئەوانیان بینی هەستیان بە مەترسی کرد و لە شوێنێک خۆیان پەنا دا، بەلام بەنولیحیان گەمارۆیان دان و وتیان: خۆتان بدەن بە دەستەوە لە پەنادا دەبن و کەستان ناکوژین، عاصمی ئەمیری سریەکە وتی: بەخوا من خۆم نادەمە بەر پەنای بێباوەڕ، خوایە هەواڵی ئێمە بگەیەنەرە پێغەمبەرەکەت، ئەوەبوو بەنولیحیان تیربارانیان کردن، ئەوەبوو عاصم و حەوت کەسی تریان شەهید بوون، سێ کەسەکەی تر کە مابوونەوە خۆیان دا بە دەستەوەو داوای پەنایان کرد، یەکێک لەو سێ کەسە خوبەیب بوو، کاتێک گەیشتنە لای بەنولیحیان خێرا ئەوانیان

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٥٤.

[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣٨٢.

بەستنەوە، یەکێک لە سیانەکە وتی ئەمە سەرەتای ناپاکیەکەیانە، بەخوا من لەگەڵتان نایەم، ئەو کوژراوانەمان پێشەنگی رەوان، ئەوانیش بە زۆر رایاندەکێشا تا لەگەڵیان بچێت بەڵام ئەو نەدەچوو، بۆیە ئەویشیان کوشت، ئینجا خوبەیب و ئەو کەسەکەی تریان برد و ئەوانیان فرۆشتن بە خەڵکی مەککە، ئەوەبوو بەنو حارثی کوڕی عامیر خوبەیبیان کڕی، چونکە خوبەیب لە جەنگی بەدردا باوکی ئەوانی کوشتبوو، خوبەیبیان کڕی و بە دیلی لای خۆیان هێشتیانەوە، لەماڵەوە لە شوێنێک بەندیان کردبوو تا ئەو کاتەی بیکوژن، خوشکەکەیان لەوێ پاسەوانی بوو، خوبەیب داوای گوێزانی لەو ئافرەتە کرد تا خۆی پێ پاک بکاتەوە، کوڕێکی ئەو ئافرەتەش لای خوبەیب بوو، خوبەیب لەسەر ئەژنۆی خۆی داینیشاندبوو، ئافرەتەکە دەیوت منیش ترسام بە مووسەکە ئەو کوڕەم ئازار بدات، بۆیە بە ترسەوە بەرەو ئەوێ چووم، خوبەیب کە منی بینی زانی ترساوم، وتی: ترسایت ئەم منداڵە بکوژم؟ من شتی وا ناکەم، ئافرەتەکە دواتر دەیوت بەخوا هیچ بەندیەکم نەدیبوو هێندەی خوبەیب چاک بێت، سوێند بەخوا رۆژێک بینیم هەرچەندە لای ئێمە بەندکراو بوو کەچی ترێی دەخوارد لەکاتێکدا بە زنجیر بەسترابوویەوە و لەو کاتەشدا لە هەموو مەککە ترێ دەست نەدەکەوت، بۆیە دڵنیام ئەوە رۆزیەکی خوایی بوو ناردبووی بۆ خوبەیب،[1] ئەوان خوبەیبیان بە بەند کراوی هێشتەوە تا مانگە حەرامەکان تەواو بوون،[2] خوبەیب بە یەکێک لەوانەی وت کە بەندیان کردبوو سێ داواکاریم لێت هەیە، ئاوی سازگارم بۆ بهێنیت و گۆشتی بە حەرام سەربڕاوم بۆ نەهێنیت (گۆشتی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٧.

قوربانی کراو بۆ بتەکان) ئەگەریش ویستیان بمکوژن پێم بڵێیت،[1] ئینجا هاتن و خوبەیبیان برد تا بیکوژن، خوبەیب وتی: دەرفەتم بدەن تا دوو رکات نوێژ بکەم، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، خوبەیب دوو رکات نوێژی کرد، دواتر کە تەواو بوو تی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە وابزانن لە ترسا نوێژەکەم درێژ دەکەمەوە زۆر نوێژەکەم درێژە پێدەدا،[2] ئەمەش بوو بە یەکەم سوننەتی دوو رکات نوێژی پێش کوشتنی موسڵمانان کە خوبەیب ئەنجامی دا، ئینجا نزای کرد لێیان و وتی: خوایە هەموویان کۆکەرەوەو بە جاری لەناویان بەرەو تاقیان مەهێڵە، ئینجا ئەم شیعرەی وت:

فَلسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا عَلَى أَيِّ جَنْبٍ كَانَ لِلهِ مَصرَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الْإِلَهِ وَإِنْ يشَأْ يبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ [1]

هیچ باکم نیە وەک موسڵمانێ کاتێک دەکوژرێم
لەبەرخودایە، بەهەر جۆرێ بێ با لەناو ببرێم
ئەمەش لەبەر خودایە و گەر خۆی بیەوێت
جەستەی پارچەکراو بەرەکەتدار دەبێت

جۆری کوشتنەکەی بە وجۆرە بوو لەخاچدرا و ئینجا لێی دەدرا تا دەمرد،[3] کاتێک بەرزیان کردەوە بۆ سەر دارخورماکە تا بیبەستنەوە خوبەیب ئەم شیعرەی دەوت:

لَقَدْ جَمَعَ الْأَحْزَابُ حَوْلِي وَأَلَّبُوا قَبَائِلَهُمْ وَاسْتَجْمَعُوا كُلَّ مَجْمَعِ

وَقَدْ جَمَعُوا أَبْنَاءَهُمْ وَنِسَاءَهُمْ وَقُرِّبْتُ مِنْ جِذْعٍ طَوِيلٍ مُمَنَّعِ

---

[1] سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٤٨.

[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

[3] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب هل يستأسر الرجل ومن لم يستأسر، الرقم ٣٠٤٥.

إِلَى اللهِ أَشْكُو غُرْبَتِي بَعْدَ كُرْبَتِي ... وَمَا أَرْصَدَ الْأَحْزَابُ بِي عِنْدَ مَصرَعِي

فَذَا الْعَرْشِ صَبِّرْنِي عَلَى مَا يُرَادُ بِي ... فَقَدْ بَضَّعُوا لحْمِي وَقَدْ يَاسَ مَطْمَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الْإِلَهِ وَإِنْ يشَأْ ... يبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

لَعَمْرِيَ مَا أَحْفَلْ إِذَا مُتُّ مُسْلِمًا ... عَلَى أَيِّ حَالٍ كَانَ لِلهِ مَضْجَعِي

هـــەموان لە دەورم تینیـــان گرتـووە
هۆز و دەستەکـان پـەنگیـان خواردووە
ژن و منـــداڵیـان خـڕ بـوون لەو لاوە
منیـش هەڵـواسـراو بە دار خـورمـاوە
نـاڵــەی بێکەسـی و ئاهـی هەر ژانـێ
بـۆ ئــەم کوشتنــەم خودا دەیـزانــێ
پەروەردگارم! صەبرێکــم هـەبێ
بـــۆ مەرگێ کــە وان لــە منیان دەوێ
ئــــەمـــەش لەپێنـاو پـەروەردگـارێ
بۆ جەستەی لەت بووم گەر ویستی هەبێ
خــۆی دەیپارێــزێ و رێـزی لێ دەنێ[1]

ئینجا خوبەیب وتی: خوایە وا ئێمە پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاند، دەی تۆیش هەواڵی ئێمە بە پێغەمبەرەکەت بگەیەنە.[2]

جا لەو کاتەی تیریان بۆ دەهاویشت پێیان دەوت حەزت ئەکرد ئێستا موحەممەد لە شوێنی تۆدا بێت؟ ئەویش دەیوت نە سوێند بە خوای گەورە،

---

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الزاي - من اسمه زيد - زيد بن الدثنة، الرقم ٥٢٨٤، ئەگەرچی وتەکان دەقی تەواوی عەرەبیەکە نین، بەڵام کرۆکی واتای عەرەبیەکەن، بۆیە کردمان بە کوردی تاکو خوێنەر لە ئاهی سەرەمەرگی ئەو هاوەڵە تێبگات.

[2] حلية الاولياء، ج١، ص ١١٣.

حەز ناکەم لە بری ئەم لەناوچوونەی من دڕکێکیش بچێت بە پێیدا، ئەوانیش پێدەکەنین.[1]

کاتێک خوبەیب کوژرا دەموچاوی خوبەیبیان بە پێچەوانەی کەعبەوە وەرچەرخاند، کەچی دواتر تەماشایان کرد دەموچاوی روو بە کەعبەیە، چەند جار وایان لێکرد کەچی هەر دەموچاوی رووی دەکردەوە بەرەو قیبلە، بۆیە وازیان لێهێنا.[2]

موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان دەڵێت: من ئەو رۆژە ئامادەی کوشتنەکەی خوبەیب بووم، لە ترسی نزاکەی خوبەیب وام دەزانی زەوی قووتم دەدات.[3]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە هەواڵی خوبەیبی پێ گەیشت، هەریەک لە میقداد و زوبەیری نارد تا تەرمی خوبەیب لە دارخورماکە دابگرن، کە گەیشتنە ناوچەی تەنعیم دەبینن چل کەس لەوێن، هەرچۆنێک بێت تەرمەکەی خوبەیبیان داگرت، زوبەیر تەرمەکەی خستە سەر ئەسپەکەی و تەرمەکەشی هیچ تێک نەچووبوو، بەڵام بێباوەڕەکان پێیان زانین، کاتێک کەوتنە شوێنیان زوبەیر تەرمەکەی خستە خوارەوە، زەوی تەرمەکەی خوبەیبی قووتدا و تەرمەکەی دیار نەماو نەکەوتە دەست بێباوەڕان.[4]

تێڕوانینی ئیسلام بۆ مەرگ تێڕوانینێکی ترس و نامۆیی نیە، وەک چۆن تێڕوانینی بۆ ژیان دیدی بێزاری و تاسەی مەرگ نیە، ئیسلام پێمان دەڵێت: تا لە ژیاندایت بەختەوەر بژی، چی پاکە بۆ خواردن وپۆشین و نۆشین و هاوسەرگیری کەمتەرخەم مەبە تیایدا، مافی جەستەو ڕوخسار و ناخت بدە، خۆشی ببەخشە بە چواردەورت، ئاوات بە مەرگ مەخوازە، ئاوات خواستن

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب الزاي - من اسمه زيد - زيد بن الدثنة، الرقم ٥٢٨٤، .

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٣.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٦٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٦٣.

بە مەرگی قەدەغە کردووە، بەڵام کە مەرگ هات پێشوازی لێدەکات، پێت دەڵێت: مەرگ مەرگی جەستەیەو گواستنەوەی ڕۆحتە بۆ دنیای ئاخیرەت، لەو ساتەدا گەشبین بە، زمانت بە یادی خوا ڕام بێنە، سەلمان ئاسا ماڵت بۆنخۆش بێت، کە کەسەکەش مرد، با بشۆردرێت و بە بەرگی پاک کفن بکرێت، بۆنخۆش بکرێت، نوێژی لەسەر بکرێت، کەس لە پێش تەرمەکەوە نەڕوات، هەرکەس دانیشتووە هەستێتە سەر پێ با تەنانەت تەرمی جوولەکەو گاوریش بێت، ئەسپەردە بکرێت و نزای خێری بۆ بکرێت، واز لە خراپەکانی بهێنن و باسی چاکەکانی بکەن.

# بەرکوڵێك لە وتەی هاوەڵان

خوێنەری ئازیز، لێرەدا تەنها سەد وتەی هاوەڵانمان وەک بەرکوڵێک خستۆتەڕوو بەو پێیەی وتەی هاوەڵان و حوکمی وتەی ئەوان و کارپێکردنی و بوارەکانی قسەکردنیان بازنەیەکی وردە وتوێژینەوەوی ورد و جوانی لەبارەوە لەبەردەستە،[1] هاوکات هەوڵمانداوە ئەو سەد وتەی لێرە هێناومانە زیاتر لە بواری تەزکیە و رەوشت و هاندانداندا بێت نەوەک بوارەکانی فەتوا و فیقهـ و وردەکارییەکانی دی کە هەر وتەیەک لەو بوارانەدا پێویستی بە شرۆڤە و شیکاری ورد هەیە.

**ئەبووبەکری صدیق:**

هەرکامتان توانی با بگری، هەرکەسیش نەیتوانی بگری، با خۆی بخاتە گریان.[2]

زمانی خۆی دەگرت و دەیوت: ئەمە بەزمی زۆری تووش کردوم.[3]

داوێن پیسی لەنێو هەر قەومێکدا بڵاوببێتەوە، خوای گەورە تووشی بەڵایان دەکات.[4]

---

[1] نمونەی ئەوانەش بریتین لە:

محمد العلي: الجامع الصحيح لآثار الصحابة كە (دار اللؤلؤة) لە نۆ بەرگدا چاپی کردووە.

أبو يحيى زكريا بن غلام قادر: ما صح من آثار الصحابة في الفقه كە (دار ابن حزم) لە سێ بەرگدا چاپی کردووە.

صالح أحمد الشامي: مواعظ الصحابة كە (دار القلم) چاپی کردووە.

عمر بن عبدالله بن محمد المقبل: مواعظ الصحابة كە (دار المنهاج) چاپی کردووە.

[2] ابن المبارك: الزهد، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي، ص ٤٢.

[3] وكيع بن الجزاح: الزهد، مكتبة الدار، المدينة المنورة، ١٩٨٤م، ص ٥٥٦.

[4] ابن هشام: السيرة النبوية،ج٢، ص ٦٦١، صحح إسناده ابن كثير في البداية والنهاية ج٥، ص ٢٦٩.

لەدەست ناوبانگ هەڵبێیت، خۆی شوێنت ئەکەوێت.[1]

خێر لە کەسێکدا نیە نەزانییەکەی بەسەر نەرمونیانییەکەیدا زاڵ بووبێت.[2]

**عومەری کوڕی خەططاب:**

پێش ئەوەی لێپێچینەوەتان لەگەڵ بکرێت، لێپێچینەوەی خۆتان بکەن، پێش ئەوەی کێشانە بکرێن، کێشانەی خۆتان بکەن، چونکە ئەگەر ئەمڕۆ لێپێچینەوەی خۆتان بکەن بۆ لێپێچینەوەی سبەینێتان کارئاسانییە.[3]

ئەگەر بینیتان براکەتان هەڵەیەکی کرد، راستی بکەنەوەو رێی راستی نیشان بدەن و لە خوا بۆی بپاڕێنەوە هەتا لێی خۆش بێت و تەوبەی پێ بکات و مەبنە دەستباری شەیتان دژ بە براکەتان.[4]

خەڵکانێک ئامۆژگاریکەر نەبن خێریان تێدا نیە، خەڵکانێکیش کەسانی ئامۆژگاریکەریان خۆش نەوێت خێریان تێدا نیە.[5]

پێش ئەوەی ببنە سەرگەورە خۆتان شارەزا بکەن.[6]

ناگەیتە حەقیقەتی ئیمان هەتا وازنەهێنیت لە درۆکردن لە گەمە و رابواردندا.[7]

لەسەرخۆیی و پەلەنەکردن لە هەموو شتێکدا باشە لە کاروباری پەیوەست بە ئاخیرەت نەبێت.[8]

هاوڕێیەتی خراپەکار مەکە با خراپەی خۆیت فێرت نەکات، نهێنی خۆشت بۆی ئاشکرا مەکە.[9]

---

[1] ابن عبد ربه الأندلسي: العقد الفريد، ج١، ص ٢١.

[2] الملا علي القاري: موعظة الحبيب وتحفة الخطيب، ص ٦٣.

[3] ابن أبي الدنيا: محاسبة النفس، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦م، ص ٢٢.

[4] البيهقي: شعب الإيمان، ج٩، ص ٦٣.

[5] المحاسبي: رسالة المسترشدين، ط٢، مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب، ١٩٧١م، ص ٧١.

[6] الخطابي: العزلة، ط٢، المطبعة السلفية – القاهرة، ١٣٩٩هـ ص ٨٣.

[7] مصنف ابن أبي شيبة – كتاب الأدب – ما جاء في الكذب، الرقم ٢٦١١٩.

[8] أحمد بن حنبل: الزهد، ص ٩٨.

[9] ابن أبي عاصم: الزهد، ط٢، دار الريان للتراث – القاهرة، ١٤٠٨هـ ص ٥٠.

یادی خوا بکەن چونکە شیفایە، خۆشتان لە باسی خەڵک بپارێزن چونکە دەرد و نەخۆشییە.[1]

چاکترین بەشی ژیانمان لە خۆڕاگریدا بینییەوە.[2]

بەندە ئەگەر لەبەر خوا خاکیی بوو، خوای گەورە حیکمەتی ئەو کەسە زیاد دەکات.[3]

**عوثمانی کوڕی عەففان:**

ئەگەر دڵەکانتان خاوێن بن، لە فەرمایشتی پەروەردگارتان تێر نابن.[4]

ئێوە زیاتر پێویستتان بە پێشەوایەکی خاوەن کردارە هەتا پێشەوایەکی خاوەن گوفتار.[5]

خوای گەورە دنیای پێداون هەتا ئاخیرەتی پێ بەدەستبهێنن، نەوەک پاڵی پێوەبدەنەوە.[6]

هەرکەس کردەوەیەک ئەنجام بدات، خوای گەورە پۆشاکی ئەو کردەوەی بەبەردا دەکات.[7]

**عەلی کوڕی ئەبووطالیب:**

ئەوانەی سەرقاڵی پارەهەڵگرتنن ئەوکاتەش کە دەژین هەر مردون، زانایانیش هەتا هەتایە دەمێنن.[8]

ڕەوشتی جوان باشترین هاودەمەو عەقڵ باشترین هاوەڵە و ئەدەبیش باشترین میراتە.[9]

---

[1] ابن السري: الزهد، تحقيق: عبد الرحمن عبد الجبار الفريوائي، ط١، دار الخلفاء للكتاب الإسلامي – الكويت، ١٤٠٦هـ ج٢، ص ٥٣٧.

[2] ابن امبارك: الزهد والرقائق، ص ٢٢٢.

[3] أبوداود: الزهد، ص ٨٥.

[4] ابن الجوزي: التبصرة، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، ١٩٨٦م، ج١، ص ٣٨٠.

[5] القرطبي: أدب المجالسة وحمد اللسان، ط١، دار الصحابة للتراث – طنطا، ١٩٨٩م، ص ٧١.

[6] البيهقي: شعب الإيمان، ج١٣، ص ١٧١.

[7] احمد بن حنبل: الزهد، ص ١٠٤.

[8] ابن الجوزي: صفة الصفوة، تحقيق: أحمد بن علي، دار الحديث، القاهرة، مصر، ٢٠٠٠م، ج١، ص ١٢٣.

[9] البيهقي: شعب الإيمان، ج٦، ص ٣٦٨.

هەرکەس گوفتاری نەرم بێت، بە دڵنیاییەوە خۆشەویست دەبێت.[1]

نەرمونیانیت بەرامبەر بە کەسی نەفام، پشتیوانت لە دژی ئەو زیاد دەکات.[2]

راوێژ قەڵایەکە بۆ پەشیمان نەبوونەوەو لە سەرکۆنەش دەتپارێزێت.[3]

هەر بەندەیەک با تەنها لە پەروەردگاری داوا بکات و تەنها لە تاوانەکانی خۆی بترسێت.[4]

ئەگەر کەسێک سەبارەت بە شتێک کە نەیدەزانی پرسیاری لێکرا، با شەرم لەوە نەکات بڵێت نازانم، ئەگەریش شتێکی نەزانی شەرم لەوە نەکات فێر ببێت.[5]

خۆڕاگری لە ئیماندا وەک سەر لە جەستەدا وایە، جەستەیەکی بێ سەر هیچ خێرێکی تێدا نیە.[6]

حەق بناسە دەستەی حەقخوازانیش دەناسیت، ناحەقیش بناسە دەستەی ناحەقخوازان دەناسیت.[7]

هەرکەس دڵ بە دنیا نەدات، موسیبەتەکانی لەسەر سووک دەبێت.[8]

لەوانەیە هەندێ ژیان هۆکارەکەی بەرکەوتن لەگەڵ مەرگ بێت، هەندێ مردنیش هۆکارەکەی خواستی ژیان بێت.[9]

---

(1) ابن مفلح: الآداب الشرعية والمنح المرعية، عالم الكتب، ج١، ص ٣٥٦.

(2) ابن عبد ربه: العقد الفريد، ج٢، ص ١٣٨.

(3) الراغب الأصفهاني: الذريعة إلى مكارم الشريعة، تحقيق: د. أبو اليزيد أبو زيد العجمي، دار السلام – القاهرة، ٢٠٠٧م، ص ٢١٠.

(4) ابن قيم الجوزي: طريق الهجرتين وباب السعادتين، تحقيق: محمد أجمل الإصلاحي، ط٤، دار ابن حزم، بيروت، ٢٠١٩م، ج٢، ص ٦٢٠.

(5) الماوردي: أدب الدنيا والدين، دار مكتبة الحياة، ١٩٨٦م، ص ٧٤.

(6) الماوردي: أدب الدنيا والدين، دار مكتبة الحياة، ١٩٨٦م، ص ٧٤.

(7) ابن الجوزي: تلبيس ابليس، ط١، دار الفكر، بيروت، ٢٠٠١م، ص ٧٤.

(8) ابن أبي الدنيا: الزهد، ص ٥٨.

(9) النويري: نهاية الإرب، ج٣، ص ٢٢٤.

**عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف:**

لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بە نارەحەتی تاقی کراینەوە و خۆڕاگر بووین، دواتر بە خۆشگوزەرانی تاقی کراینەوەو نەمانتوانی خۆڕاگر بین.[1]

**زوبەیری کوڕی عەوام:**

هەرکەستان توانی کردەوەی چاک لای خۆی حەشار بدات با بیکات.[2]

**طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا:**

لە بەخشیندا راوێژ بە کەسی پیسکە مەکە، لە جەنگیشدا راوێژ بە ترسنۆک مەکە، لە ئافرەتیشدا راوێژ بە گەنج مەکە.[3]

**عائیشەی دایکی باوەڕداران:**

ئەگەر لەخواترسایت، لەبەرامبەر خەڵکدا ئەوت بەسە، بەڵام ئەگەر لە خەڵک ترسایت ئەوان لای خوا هیچیان پێ ناکرێت بۆت.[4]

ئێوە خۆتان لە باشترین پەرستش بێئاگا کردووە کە ئەویش خاکیبوونە.[5]

تاوانی کەم بکەن، چونکە کە دەگەنەوە بە خودا، هیچ شتێکی باشتر لە کەمتاوانیتان پێ نابێت.[6]

**ئەبوودەرداء:**

چاک بزانن، کەمێک کە بەشتان بکات زۆر باشترە لە زۆرێک کە جەنجاڵتان بکات.[7]

هیوا دەخوازن و کۆدەکەنەوە، نە ئەوەی هیوای پێ دەخوازن کۆی

---

[1] جامع الترمذي - أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ)، الرقم ٢٤٦٤ وقال حديث حسن.

[2] ابن المبارك: الزهد، ص ٣٩١.

[3] الخرائطي: مكارم الأخلاق، تحقيق: أيمن عبد الجابر البحيري، ط١، دار الآفاق العربية، القاهرة، ١٩٩٩م، ص ٢٥٢.

[4] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المواعظ، الرقم ١١٨٥٣.

[5] ابن المبارك: الزهد والرقائق، ص ١٣٢.

[6] أحمد بن حنبل: الزهد، ص ١٣٦.

[7] ابن المبارك: الزهد، ص ٤٠٥.

دەکەنەوە، نە ئەوەشی کۆی دەکەنەوە دەیخۆن.[1]

خراپترین خواردن خواردنی ماڵی هەتیوە، خراپترین دەستکەوتیش سووە.[2]

ماڵ چاکترین پەرستگای هەر کەسێکە، تیایدا زمان و چاوی دەپارێزێت.[3]

ئەوەی زۆر لێی ئەترسم ئەوەیە کە برام بۆ لێپێچینەوە، پێم بوترێت: دەتزانی، لە ئاست ئەو زانینەتدا چیت کرد؟[4]

ساتێک بیرکردنەوە زۆر باشترە لە شەوێک شەونوێژ.[5]

هیچ خراپەیەک بە کەم مەزانە بۆ خۆپاراستن لێی، هیچ چاکەیەکیش بە کەم مەزانە بۆ ئەنجامدانی.[6]

سەرکۆنەی براکەت زۆر ئاسانترە لە لەدەستدانی خۆی و هەموو ئەوەی پێیەتی، سبەینێ مەرگ یەخەی دەگرێت و لەدەستی دەدەیت، ئیتر چۆن لە مردنیدا دەگریت لەکاتێکدا لە ژیانیدا لێی دابڕابوویت.[7]

هەرکەس ترسی ئەوەی هەبێت لەلایەکەوە کە خۆی هەستی پێ ناکات دڵی باوەڕداران رقیان لێی بێت، کاتێک تەنهایە تاوان دەکات، خوداش لە رێیەکەوە کە خودی کەسەکە هەستی پێ ناکات، رقی دەخاتە نێو دڵی باوەڕدارانەوە.[8]

هەرکەس هەرچییەکی لە خەڵک دی و بەدوایدا بچێت، خەفەتی درێژە ئەکێشێت و رق و کینەی دانامرکێتەوە.[9]

---

(1) البيهقي: شعب الإيمان، مكتبة الرشد، ٢٠٠٣م، ج١٣، ص ١٩٧.

(2) أحمد بن حنبل: الزهد، ص ١١٦.

(3) مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الزهد - زهد الصحابة - كلام أبي الدرداء(ﷺ)، الرقم ٣٥٧٣٨.

(4) مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الزهد - زهد الصحابة - كلام أبي الدرداء(ﷺ)، الرقم ٣٥٧٤١.

(5) مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الزهد - زهد الصحابة - كلام أبي الدرداء(ﷺ)، الرقم ٣٥٧٢٨.

(6) ابن المبرد: صب الخمول، ص ٧٠.

(7) أبوداود: الزهد، ص ٢٢٢.

(8) أبونعيم: حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، مطبعة السعادة، القاهرة، ١٩٧٤م، ج١، ص ٢١٥.

(9) ابن أبي شيبه: المصنف، ج٢٠، ص ٨٨.

**ئوبەی کوڕی کەعب:**

حەق لە هەرکەس وەربگرە کە بۆی هێنایت با کەسەکە دوور و بێزراویش بێت، ناحەقیش لە هەرکەس وەرمەگرە کە بۆی هێنایت با کەسەکە خۆشەویست و نزیکیش بێت.[1]

زانست وەربگرن و کاری پێ بکەن نەوەک خۆتانی پێ برازێننەوە، دوور نیە سەردەمێک بێت زانست بۆ خۆرازاندنەوە بەکاربێت وەک چۆن یەکێک لە ئێوە بە جلوبەرگ خۆی دەرازێنێتەوە.[2]

**ئەبوو مووسای ئەشعەری:**

بگرین، چونکە دۆزەخییەکان دەگرین و بەو گریانەیان رەحمیان پێ ناکرێت، دەی ئەمڕۆ بگرین، چونکە گریانی ئەمڕۆتان رەحمی پێ دەکرێت.[3]

**ئەبووذەری غیفاری:**

ئەوەی دوو درهەمی هەیە، لە رۆژی دواییدا لێپێچینەوەی لەو کەسە سەختترە کە یەک درهەمی هەیە.[4]

خەڵکی گوڵی بێ درک بوون، کەچی ئەمڕۆ بوونەتە درکی بێ گوڵ.[5]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) وا جێیهێشتین ئەگەر باڵندەیەکیش لە شەقەی باڵی بدایە زانستمان لەبارەیەوە هەبوو.[6]

**ئەبووجوحەیفە:**

لە کۆڕی گەورەکاندا دابنیشن و تێکەڵی حەکیمەکان بن و پرسیار لە زاناکان بکەن.[7]

---

[1] أبونعيم: حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، ج٩، ص ١٢١.

[2] ابن عبدالبر: جامع بيان العلم وفضل، ط١، دار ابن الجوزي – السعودية، ١٩٩٤م، ج١، ص ٦٩٣.

[3] أحمد بن حنبل: الزهد، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، ١٩٩٩م، ص ١٦٢.

[4] ابن السري: الزهد، ج١، ص ٣٢٥.

[5] ابن حبان: روضة العقلاء ونزهة الفضلاء، دار الكتب العلمية – بيروت، ص ٨٤.

[6] صحيح ابن حبان – كتاب العلم – باب الزجر عن كتبة المرء السنن مخافة أن يتكل عليها دون الحفظ لها، الرقم ٦٥.

[7] مصنف ابن أبي شيبة – كتاب الأدب – في الرجل يؤمر أن يجالس ويداخل، الرقم ٢٦١٠٢.

**حوذەیفەی کوڕی یەمان:**

چاکترینتان ئەو کەسەیە کە ئاخیرەتی بۆ دنیا نافەوتێنێت و دنیاشی بۆ ئاخیرەت وەلا نانێت.[١]

ئەگەر فیتنە هات، بخزێنە ماڵەکانتان و شمشێرەکانتان بشکێنن و پەتی بەردەستتان بپچڕن.[٢]

وازهێنان لە تاوان ئاسانترە لە داوای لێخۆشبوون.[٣]

خراپترین فیتنە ئەوەیە چاکە و خراپە بۆ دڵت بخەیتەڕوو، کەچی نەزانێت لەکامیان بنەوێت.[٤]

ئەگەر کەسێکتان ویستی بزانێت فیتنەی تووش بووە یان نا، با تەماشا بکات، ئەگەر حەڵاڵێکی بینی کە پێشتر بە حەرامی دەزانی، یان حەرامێکی بینی کە پێشتر بە حەڵاڵی دەزانی، ئەوە فیتنەی تووش بووە.[٥]

**خەبابی کوڕی ئەرەت:**

بۆ نزیکبوونەوە لە خودا هیچ شتێکی خۆشەویستتر لە فەرمایشتی خۆی نیە لێی بنەوێت.[٦]

**سەلمانی فارسی:**

پێکەنینم بە کەسێک دێت بەدوای دنیادا ڕاکەڕاکیەتی و مەرگیش کەوتۆتە شوێنی.[٧]

---

[١] المعافي: الزهد، ط١، دار البشائر الإسلامية – بيروت، ١٩٩٩م، ص ٢٧١.

[٢] ابن المبرد الحنبلي: صب الخمول على من وصل أذاه إلى الصالحين من أولياء الله، ط١، دار النوادر، سوريا، ٢٠٠١م، ص ٧٥.

[٣] ابن المبارك: الزهد، ص ٢٩١.

[٤] نعيم بن حماد: الفتن، ص ٦٥.

[٥] مصنف ابن أبي شيبة – كتاب الفتن – من كره الخروج في الفتنة وتعوذ منها، الرقم ٣٨٤٩٩.

[٦] المستدرك على الصحيحين – كتاب التفسير – تفسير سورة حم السجدة – التقرب إلى الله بكلام الله أحب إليه، الرقم ٣٦٧٣.

[٧] أحمد بن حنبل: الزهد، ص ١٢٧.

گریانم دێت بۆ ئەو کاتەی لەبەردەم پەروەردگاری جیهانیان دەوەستێنرێم لەکاتێکدا نازانم بەرەو دۆزەخ دەبرێم یان بەرەو بەهەشت.[١]

ئەگەر تووڕە بوویت، جڵەوی زمان و دەستت بگرە.[٢]

زانست دووروودرێژە و تەمەنیش کورتە، جا لە زانستدا چیت بۆ بواری ئاینداریيەکەت پێویستە لەوە بنەوە.[٣]

ئەگەر لە پەنهانیدا تاوانێکت کرد، لە پەنهانیشدا چاکەیەک بکە، ئەگەریش بە ئاشکرا تاوانێکت کرد، بە ئاشکرا چاکەیەکیش بکە هەتا قەرەبوو بێت بۆی.[٤]

**موعاذی کوڕی جەبەل:**

هەندێک جار کەسێکی دووڕوو قسەیەکی حەق دەکات، هەرکات حەقتان بیست وەریبگرن چونکە حەق نوور و رووناکییە.[٥]

**سەلەمەی کوڕی ئەکوەع:**

ئێمە ئەگەر بمانبینیایە کەسێک نەفرەت لە براکەی دەکات، پێمان وابوو یەکێک لە تاوانە گەورەکانی ئەنجامداوە.[٦]

**ئەنەسی کوڕی مالیك:**

ئێوە هەندێ کردەوە ئەنجام دەدەن لەبەرچاوتان وەک تاڵەموویەک وایە، ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بە تاوانی گەورەمان دەزانی.[٧]

چاکە رووناکی دڵ و جوانی روخسار و هێزی جەستە و فراوانی رۆزیی و خۆشەویستی نێو دڵی خەڵکی لەگەڵدایە.[٨]

---

[١] أحمد بن حنبل: الزهد، ص ١٢٧.

[٢] ابن رجب: جامع العلوم والحكم، ط٧، مؤسسة الرسالة – بيروت، ١٩٩٧م، ص ٣٦٨.

[٣] ابن الجوزي: صفة الصفوة، ج١، ص ٢٠٨.

[٤] ابن أبي الدنيا: التوبة، مكتبة القرآن، مصر، ص ١٢١.

[٥] ابن الجوزي: صفة الصفوة، ج١، ص ١٨٨.

[٦] المنذري: الترغيب والترهيب، ط١، دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤١٧هـ ج٣، ص ٣١٣.

[٧] صحيح البخاري – كتاب الرقاق – باب ما يتقى من محقرات الذنوب، الرقم ٦٤٩٢.

[٨] ابن قيم الجوزية: روضة المحبين ونزهة المشتاقين، ط٤، دار ابن حزم، بيروت، ٢٠١٩م، ص ٥٩٥.

**ئەبووهورەیرە:**

چۆن لە خۆم دڵنیابم لە کاتێکدا شەیتان زیندووە![1]

ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکدا دێت تیایدا هەرکەس مردنی لا خۆشترە لە خۆشۆردن بە ئاوی سارد لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا.[2]

**عەبدوڵای کوڕی زوبەیر:**

لەخواترسان چەند نیشانەیەکیان هەن کە پێیان دەناسرێنەوەو خۆشیان دەیانناسنەوە، خۆڕاگری لەسەر ناڕەحەتی و ڕازیبوون بە قەزا و شوکرانەی نیعمەت و ملکەچی بۆ حوکمی قورئان.[3]

**عەبدوڵای کوڕی عەبباس:**

لەگەڵ ئارەزووبازاندا دامەنیشە، چونکە دانیشتن لەگەڵیاندا دڵەکان نەخۆش دەخات.[4]

زوهد ئەوەیە دڵت نەنیشێتەوە بەو شتەی لە دنیادا بەردەستەو تاسەی نەبێت بۆ ئەوەی بەردەست نیە.[5]

ڕۆژێک بەسەر خەڵکدا دێت کە خەمی هەرکامیان ورگیەتی و ئارەزووەکانی کردووەتە ئایینی خۆی.[6]

ئەگەر وەستان لە زانستخوازی بۆ هەرکامتان گونجاو بوایە، ئەوە دەبوو بۆ پێغەمبەر مووسا گونجاو بوایە.[7]

ئەگەر فیرعەون پێم بڵێت بارک الله فیک، پێی دەڵێم تۆیش، هەرچەندە فیرعەون مردووە.[8]

---

[1] البیهقي: شعب الإیمان، ج٢، ص ٢٥٨.
[2] نعیم بن حماد: الفتن، ط١، مكتبة التوحید – القاهرة، ١٤١٢هـ ص ٧٢.
[3] أبوادود: الزهد، ص ٣٢٥.
[4] الآجري: الشریعة، ط٢، دار الوطن – الریاض، ١٩٩٩م، ج١، ص ٤٥٢.
[5] البیهقي: الزهد الكبیر، ط٣، مؤسسة الكتب الثقافیة – بیروت، ١٩٩٦م، ص ٦١.
[6] ابن المبارک: الزهد، ص ٢١٧.
[7] الماوردي: أدب الدنیا والدین، دار مكتبة الحیاة، ١٩٨٦م، ص ٧٤.
[8] البخاري: الأدب المفرد، ص ٦٢٥.

ئەگەر ویستت باسی عەیبوعاری هاوڕێکەت بکەیت، عەیبوعاری خۆتت بیربێتەوە.[1]

**عەبدوڵای کوڕی مەسعوود:**

رازی بە بەوەی خوای گەورە بۆی بڕیویەتەوە، لە دەوڵەمەندترینی خەڵک دەبیت.[2]

ئەگەر یەکێک لە ئێوە قەپ بە پشکۆیەکدا بکات هەتا دەکوژێتەوە، زۆر بۆی باشترە لەوەی سەبارەت بە رووداوێک کە خوا فەرمانی کردووە رووبدات بڵێت: خۆزگە وا روونەدایە.[3]

باوەڕدار وا سەیری تاوانەکانی دەکات وەک ئەوەی لە بناری چیایەکدا دانیشتبێت و بترسێت چیاکە دارمێت بەسەریدا، تاوانکاریش وا سەیری تاوانەکانی دەکات وەک ءەوەی مێشێک بە لووتیەوە نیشتبێتەوە.[4]

هەرکەس دەیەوێت بزانێت ئایا خودای خۆشدەوێت، با قورئان بۆ دەروونی خۆی بخاتەڕوو، هەرکەس قورئانی خۆشویست ئەوە خودای خۆشدەوێت، چونکە قورئان فەرمایشتی خودایە.[5]

هەتا لە نوێژدا بیت، ئەوە لە دەرگای پادشا دەدەیت، هەرکەسیش لە دەرگای پادشا بدات دەرگای بە روودا دەکرێتەوە.[6]

سوێند بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە جگە لەو، لەسەر زەویدا هیچ شتێک نیە هێندەی زمان پێویستی بە بەندکردنی دووورودرێژ بێت.[7]

---

[1] أحمد بن حنبل: الزهد، ص ١٥٤.

[2] البيهقي: شعب الإيمان، ج١١، ص ٣٧.

[3] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الزهد - زهد الصحابة - كلام ابن مسعود(ﷺ)، الرقم ٣٥٧٠٩.

[4] صحيح البخاري - كتاب الدعوات - باب التوبة، الرقم ٦٣٠٨.

[5] ابن جرب الحنبلي: استنشاق نسيم الأنس من نفحات رياض القدس، ط١، الفاروق الحديثة، ٢٠٠٤م، ص ٣٢٩.

[6] ابن الجوزي: صفه الصفوه، ج١، ص ١٥٦.

[7] أحمد بن حنبل: الزهد، ص ١٣٤.

ئەگەر گاڵتە بە سەگێکیش بکەم، دەترسم خۆشم ببم بە سەگ.[1]

زانست بە گێڕانەوەی زۆر نیە، بەڵکو بە لەخواترسانە.[2]

خوای گەورە ماڵ و سامان بەوانە دەبەخشێت کە خۆشی دەوێن یان خۆشی ناوێن، بەڵام ئیمان تەنها بەوانە دەبەخشێت کە خۆشی دەوێن.[3]

خۆڕاگریی نیوەی ئیمانە و دڵنیاییش هەموو ئیمانە.[4]

پیاو بە هاوەڵەکەیدا بناسنەوە، چونکە هەرکەس هاوەڵی هاوچەشنی خۆی دەکات.[5]

یەکێک لە گەورەترین تاوانەکان ئەوەیە کەسێک بە براکەی بڵێت: لەخوابترسە، ئەویش بڵێت خۆت وابە، تۆ بە من دەڵێیت؟[6]

هەرکەس لە هەرچییەکدا داوای فەتوای لێ بکرێت و ئەویش فەتوای لەبارەوە بدات، بەدڵنیاییەوە ئەوە شێتە.[7]

هەرکەس زانستی پێشین و ئەوانی دواتریشی دەوێت با لە قورئان رابمێنێت.[8]

**عەبدوڵای کوڕی عومەر:**

هەموو بیدعەیەک گومڕاییە ئەگەرچی خەڵک بە باشیشی بزانن.[9]

هەرکەس لەبارەی شتێکەوە کە نەیدەزانی پرسیاری لێکرا و وتی نازانم، ئەوە نیوەی زانستی بەدەستهێناوە.[10]

---

(1) ابن السري: الزهد، ج٢، ص ٥٧٠.

(2) ابن القيم: الفوائد، ج١، ص ٢١٦.

(3) البخاري: الأدب المفرد، ط١، مكتبة المعارف، ١٩٩٨م، ص ١٤٤.

(4) وكيع بن الجراح: الزهد، ص ٤٥٦.

(5) البيهقي: شعب الإيمان، ج١٢، ص ٤٦.

(6) المعجم الكبير للطبراني - باب العين - من اسمه عبد الله - عبد الله بن مسعود الهذلي - خطبة ابن مسعود ومن كلامه، الرقم ٨٥٨٧.

(7) مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب في الذي يفتي الناس في كل ما يستفتى، الرقم ١٧٦.

(8) أبوطالب المكي: قوت القلوب في معاملة المحبوب ووصف طريق المريد إلى مقام التوحيد، دار الكتب العلمية - بيروت، لبنان، ٢٠٠٥م، ج١، ص ٩٠.

(9) ابن بطة: الإبانة الكبرى، دار الراية، الرياض، ج١، ص ٣٣٩.

(10) ابن عبد ربه: العقد الفريد، ج٢، ص ٨٥.

هاوەڵانـی پێغەمبـەر(ﷺ) پێدەكەنیـن لەكاتێكـدا ئیمانـی نـاو دڵیـان زۆر لـە شـاخەكان گەورەتـر بـوو.[1]

هیچ كەس نابێتە زانا هەتا نەگاتە ئەوەی ئێرەیی بە سەرووی خۆی نەبات و خوار خۆی بە كەم نەزانێت و بە زانستەكەی چاوی لە پارەكۆكردنەوە نەبێت.[2]

پەروەردگارا، وەک چۆن ئیمانت پێ بەخشیم، لێمی دانەماڵیت.[3]

**عەمری كوڕی عاص:**

كەسی ژیر ئەوە نیە چاک و خراپ لێک جیابكاتەوە، بەڵكو ئەو كەسەیە كە لەنێوان دوو خراپەدا كەمەكەیان بناسێتەوە.[4]

ئەگەر هەركام لە ئێوە سكی تێر بكات لە گۆشتی وڵاخێكی مردارەوەبوو، ئەوەی باشترە لەوەی گۆشتی پیاوێكی موسڵمان بخوات.[5]

پێشەوایەكی دادپەروەر زۆر باشترە لە بارانێكی بەخوڕ.[6]

**عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص:**

چاكەیەک ئەمڕۆ بیكەم زۆر لام خۆشەویستترە لە دوو چاكەی وا كە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بمكردایە، چونكە ئەو سەردەمە ئاخیرەتمان لا مەبەست بوو و دنیامان لا مەبەست نەبوو، بەڵام ئەمڕۆ لامانداوە بە لای دنیادا.[7]

---

[1] مصنف عبد الرزاق - كتاب الجامع - باب الإمام راع، الرقم ٢٠٦٧١.

[2] مسند الدارمي - مقدمة المؤلف - باب من قال العلم الخشية وتقوى الله، الرقم ٢٩٨.

[3] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الدعاء - ما ذكر عن ابن عمر من قوله، الرقم ٣٠١٥١.

[4] ابن أبي الدنيا: الإشراف في منازل الأشراف، ط١، مكتبة الرشد – الرياض، ١٩٩٠م، ص ٢٦٤.

[5] ابن السري: الزهد، ج٢، ص ٥٦٣.

[6] ابن عساكر: تاريخ دمشق، ج٤٦، ص ١٨٤.

[7] المعجم الكبير للطبراني - باب العين - من اسمه عبد الله - عبد الله بن عمرو بن العاص - ما أسند عبد الله بن عمرو بن العاص(ﷺ) - أبو عبد الرحمن الحبلي، الرقم ١٤٦٢٧.

# پێڕست